”لەنێومانا وەکوو مۆمێ ئەسووتا
چیی لێ هات؟ عەجەب! بێ ئێمە چیی لێ هات؟
وەک دێوانە دەشت و سارای بۆ وێڵم
ئەو ئاهووە لەم سارایە چیی لێ هات؟
لە مانگ و زوهرە ئەپرسم، گشت شەوێ
ئەو ڕوومانگە بەو سەرەوە چیی لێ هات؟“



## کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە

١. بنەڕەتەکانی فەلسەفە-حەمید عەزیز
٢. کورد لەدیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە (چ٢)-فەرهاد پیربالٚ
٣. ڕێبازە ئەدەبییەکان (چ ٢)-فەرهاد پیربالٚ
٤. مۆزەخانەی پاکیزەیی-ئۆرهان پامۆک- و.بەکر شوانی
٥. نەتەوەی زێرابەکان-جەبار جەمال غەریب
٦. ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی (چ٢)-جەعفەر عەلی
٧. سۆفیزم و کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی...-جەعفەر عەلی
٨. مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و... (چ٢)-ئەحمەدی مەلا
٩. نهێنییەکانی ژیان-ئۆشۆ-و. ئازاد بەرزنجی
١٠. کورتیلەیەک لە مێژووی کات -ستیڤن هۆوکینگ و لیۆنارد ملۆدینۆ-و. حوسەین حوسەینی و هیوا عومەر
١١. کۆشک-فرانتس کافکا-و. عەتا ئەهایی
١٢. فەصلول مەقال- ئیبن ڕوشد-و. مەریوان عەبدول
١٣. شۆڕشی ئەیلوول لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا-وریا ڕەحمانی
١٤. دەسەڵات و جیاوازی-مەریوان وریا قانع
١٥. لە چ ئێستایەکدا دەژین-مەریوان وریا قانع
١٦. شوناس و ئاڵۆزی-مەریوان وریا قانع
١٧. سیاسەت و دونیا-مەریوان وریا قانع
١٨. جەمشید خانی مامم-بەختیار عەلی
١٩. کەشتی فریشتەکان (کتێبی١)-بەختیار عەلی
٢٠. کەشتی فریشتەکان (کتێبی٢)-بەختیار عەلی
٢١. لە دیارەوە بۆ نادیار-بەختیار عەلی (چ٢)
٢٢. وەک باڵندەی ناو جەنگەڵە ترسناکەکان-بەختیار عەلی
٢٣. چێژی مەرگدۆستی-بەختیار عەلی (چ٢)
٢٤. مەعریفە و ئیمان-بەختیار عەلی و هێمن قەرەداخی
٢٥. دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندییەکانی ئەمریکاو...- گۆران ئیبراهیم صاڵح
٢٦. سەمەرقەند (چ٢)-ئەمین مەعلوف-و. ئەحمەدی مەلا
٢٧. وێستگەیەک لە گەشتێکی فەلسەفی-فاروق ڕەفیق

ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود
بەڕێوەبەری هونەری: باسم رەسام

ناوی کتێب: قەلەندەر و قەڵا
ناوی نووسەر: یەحیا یەسریبی
وەرگێڕانی لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی
بابەت: ڕۆمان
دیزاینی بەرگ: سەید میهران زارع
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٥
چاپخانە: تاران
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٨٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٠٠٠)ـی ساڵی (٢٠١٥)ـی پێ دراوە.



ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە/ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org • andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

# سوهرەوەردی و فەلسەفەی ئیشراقی

زۆرن ئەو حەکیم و زانا کوردانەی لە مێژووی فەلسەفە و ئاییندا، بە زمانی عەرەبی یان فارسی، نووسیویانە و دواتریش مێژوونووسان نەک هەر بەرهەمەکانیان لەسەر ئەو دوو کولتوورە حیساب کردووە، بگرە زۆربەیان هەوڵی ئەوەیان داوە، کە نکووڵی لە ڕەچەڵەکە کوردەکەشیان بکەن. بە هەرحاڵ، سوهرەوەردییش یەکێکە لەو فەیلەسووف و عارفە کوردانەی دووچاری هەمان چارەنووس بۆتەوە، لە کاتێکدا هەر وەکوو دکتۆر محەمەد کەمالیش لە کتێبێکدا، کە سەبارەت بە مەلا سەدرەیە و یەکێک بووە لەوانەی کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی فەلسەفە و بیروبۆچوونەکانی سوهرەوەردییەوە، ئەوەی ساغ کردۆتەوە، کە ئەسڵی وشەی سوهرەوەرد سوورەبەردە، ئەو دێیەی کە زادگەی سوهرەوەردی بووە و کاتی خۆی لەسەر دەستی مەغۆلەکان وێران کراوە.*

لە ڕاستیدا سوهرەوەردی، لە مێژووی فەلسەفە و عیرفاندا، بە دامەزرێنەری ڕێبازی ئیشراق لەقەڵەم دەدرێ و بە یەکێک

* بڕوانە:
(Mullah Sadra,s Transcendent Philosophy)
Muhammad Kamal
Ashgate World Philosophies Series
Great Britain,2005. Ch.2

لە پیاوە یاخی و سەرچڵەکانی سەردەمی خۆی دەژمێردرێ و لە تەمەنێکی کورتدا، ٣٦ بۆ ٣٨ ساڵ، توانیی نزیکەی پەنجا کتێب بنووسێت، کە بەشێکیان بە فارسی و بەشێکیان بە عەرەبین و تیایاندا زمان و شێوازێکی باڵای بەکار بردووە و لە کتێبخانەی فارسی و عەرەبیدا بە شاکار دەژمێردرێن؛ مەخابن، کە تا ئێستا هیچیان نەکراون بە کوردی.

## سوهرەوەردی کێ بوو؟

بەر لە هەموو شتێک، دەبێ بڵێین سوهرەوەرد شارۆچکەیەکی کوردییە و دەکەوێتە نزیک *زنجانـ*ـەوە لە کوردستانی خۆرهەڵات، لە باکووری شارەزوورەوە. ئیبن حەوقەل (٣٦٧ ک.) و یاقووتی حەمەوی (٦٢٦ ک.) باسیان کردووە، کە دەکەوێتە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستانی خۆرهەڵاتەوە، لە باکووری شارەزوورەوە. ئیبن حەوقەل لە (سورة الأرض، لاپەڕە ٣١٤)دا وتوویەتی، کە سوهرەوەرد لە شارەزوور دەچێت، "لە ڕووی خۆشگوزەرانی و هەرزانی و هەڵکەوتەی شوێنەکەی و بەپیتوفەڕی و زۆربەی دانیشتووانیشی کوردن"

هەڵبەتە ئیبن خەلەکانیش، کە خۆی بە ڕەچەڵەک کوردە و لە ساڵی (١٢١١ز.)دا لە هەولێر لەدایک بووە و دواتر چووە بۆ شام و لەوێ ژیاوە، لە کتێبی وفیات *الأعیانـ*ـدا دەڵێت، کە سوهرەوەردی لە ئەسڵدا ناوی یەحیای کوڕی حەبەشی کوڕی ئەمیرەکە و نازناوەکەی شەهابەدین بووە و بە کوژراو و بە شەهید ناسراوە. تەنانەت ئیبن خەلەکان ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە، کە وشەی *ئەمیرەک* بچووککراوەی *ئەمیرە* و ئەم





بزوێن و کافە لە زمانی کوردیدا بۆ بچووککردنەوە بەکار دێ.

سوهرەوەردی لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی کۆچیدا، لەنێوان ساڵانی ٥٤٥ - ٥٥٠ کۆچی، بەرامبەر بە ١١٥٠ - ١١٥٥زایینیی لەدایک بووە و ساڵانی سەرەتای تەمەنی هەر لە سوهرەوەرد بەسەر بردووە و هەر زوو فێری خوێندنەوە و نووسین بووە و قورئانی ئەزبەر کردووە و هەموو شایەتی زیرەکی و هەڵکەوتوویی ئەو کوڕە بوون.

دواتر، سوهرەوەردی بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندن دەچێت بۆ مەراغە لە ئازەربایجان و لەوێ لەسەر دەستی مەجدەدین جیلی دەخوێنێت، کە مامۆستایەکی شارەزا بووە لە زانستی کەلامدا و ئیبن خەلەکان دەڵێت، کە سوهرەوەردی زانستەکانی حیکمەت و ئوسوڵ و فیقهیش هەر لەسەر دەستی ئەو فێر بووە. هەڵبەتە هەر ئەم مەجدەدین جیلییە، مامۆستای شێخ فەخرەدین ڕازییش بووە و لەو ماوەیەدا، گەلێ گفتوگۆ و وتووێژی فەلسەفی و دینی لەنێوان سوهرەوەردی و ڕازیدا کراوە.

پاشان سوهرەوەردی دەڕوات بۆ ئەسفەهان و لەوێ لەسەر دەستی زەهیرولدینی قادری، کتێبی *البصائر النصیرية في المنطقـ*ـی عومەری کوڕی سەهلانی ساوی دەخوێنێت.

دواتر سەفەر دەکات بۆ ماردین و لەوێش پەیوەندی بە فەخرەدین ماردینییەوە دەکات و دەبێت بە قوتابیی ئەو و زۆر شتی لێوە فێر دەبێت.

دواتریش بەرەو حەڵەب دەچێت. ئەم چوونەی بۆ حەڵەب و ماوەی مانەوەی لەوێ، هاوکات دەبێت لەگەڵ جەنگی خاچپەرستەکاندا و ئەودەم سەلاحەدینی ئەییوبی فەرمانڕەوا

دەبێت، زاهیرشای کوڕیشی میری حەڵەب دەبێت.

سوهرەوەردی، هەر بە نیازی فێربوونی زیاتر، ڕوو لە حەڵەب دەکات و لەوێ لە قوتابخانەی حەلەوی دەبێت بە قوتابیی شێخ ئیفتیخارەدین، بەڵام پاش ماوەیەک، بۆی دەر دەکەوێ سوودێکی وەها نابینێت و دەکەوێتە گفتوگۆ و وتووێژی سەخت لەگەڵ مامۆستا و زانا و فەقیهەکانی ئەوێدا و ئەمەش وا دەکات، زۆر بەڕاشکاوی بیروبۆچوونەکانی خۆی بخاتە ڕوو و سەرسەختانە بەرگرییان لێ بکات. هەڵبەت ئەو بیروبۆچوونانەش بەلای فەقیهەکانی حەڵەبەوە دەرچوون بوو لە سوننەتی ئیسلام، وەکوو ئەوەی ئەوان باوەڕیان پێ بوو، هەر بۆیە کەوتنە دژایەتیکردن و تۆمەتهەڵبەستن بۆی. بەتایبەتییش کە زاهیرشا ڕێزێکی تایبەتیی لێ دەنا، ئەمەش بەس بوو بۆ ئەوەی ئەوەندەی تر ئەو فەقیهانە جامی ڕق و ئیرەییی خۆیان بەسەر سوهرەوەردیدا قڵپ بکەنەوە و کاتێکیش زانییان زاهیرشا زۆر گوێ بە سکاڵا و گلەییەکانی ئەوان نادات لە ئاستی سوهرەوەردیدا، چوون بۆ لای سەلاحەدینی ئەییوبیی باوکی و ئەویان دژ بە سوهرەوەردی هان دا و وایان تێگەیاند، کە کابرایەکی *باطنی* و *فاطمی*یە و ئەو دەمەش فاطمییەکان مەترسییەکی گەورەیان بۆ سەر دەوڵەتی ئەییوبی دروست کردبوو. بۆیە سەلاحەدین گوشاری بۆ سەر زاهیرشای کوڕی هێنا و پێی وت، کە دەبێ بە هەرشێوەیەک بووە، خۆی لە سوهرەوەردی ڕزگار بکات و لەناوی ببات. زاهیرشا کە دەیزانی ئەمە هەمووی لە ئیرەیی و لاوازیی فەقیهەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، ویستی قەناعەت بە باوکی بکات، کە ئەوە وا نییە





و سوهرەوردی فەیلەسووف و زانایەکی گەورەیە و ئەوانی تر لە ئیرەیی و ڕقەوە ئەو تۆمەتەیان بۆ هەڵبەستووە، بەڵام سەلاحەدین لە وەڵامدا پێی وتبوو، کە تەنانەت گەر وەهاش بێت، بۆ ئەوەی ناوەندی دینی و فەقیهەکانی حەڵەب و شام لە دەوڵەتی ئەییوبی هەڵنەگەڕێنەوە، چار نییە و دەبێ قوربانی بە سوهرەوەردی بدرێ. دوای ئەوەش، دیسانەوە زاهیرشا داوای لە باوکی کردەوە کە لەو فەرمانەی پاشگەز ببێتەوە، سوودی نەبوو، بەڵام وتی بۆ ئەوەی ڕوویەکی یاسایی بە کارەکە بدرێ، با لە حەڵەب گفتوگۆ و دیبەیتی ئاشکرا لەنێوان سوهرەوەردی و فەقیهەکاندا بکرێ، ئەوکات ئەوان تۆمەتەکانی خۆیان بکەن بە یادداشت و ئاڕاستەی شای بکەن. هەر واش بوو. دوای ئەوەی سوهرەوەردی لە زیندانی حەڵەبدا دەستبەسەر دەکرێ، هەر لەو ماوەی زیندانیکردنەیدا سێ دانیشتن بۆ گفتوگۆ و دیبەیت لەنێوان ئەو و فەقیهەکانی حەڵەبدا ساز دەکرێ و دواجار بە فڕوفێڵی شەرعییانە، تۆمەتی ئەوە دەخەنە پاڵ سوهرەوەردی، کە هەم باوەڕی بەوە نییە کە پێغەمبەر، دواپێغەمبەری خودایە و خۆی لافی پێغەمبەرایەتی لێدەدات و هەم خەڵک هان دەدا دژ بە دەوڵەت و دەسەڵات و کابرایەکە لە ئیسلام دەر چووە و بیروباوەڕێکی زەردەشتییانەی هەیە، بەم جۆرە ئەم پیاوە مەنەوەرە گەورەیە تەکفیر دەکەن و ئیدی زاهیرشاش ناچار دەکرێ، فەرمانەکەی باوکی جێبەجێ بکات و ئەویش سوهرەوەردی خۆی سەرپشک دەکات بۆ هەڵبژاردنی جۆری مردنەکەی. سوهرەوەردی داوای ئەوە دەکات فڕێی بدەنە زیندانێکەوە و نان و ئاوی نەدەنێ، تا گیان دەسپێرێت.

بەو جۆرە، فرێی دەدەنە زیندانێکەوە و نان و ئاوی نادەنێ. هەرچەندە سوهرەوەردی خۆی لە ئەنجامی مەشقی ڕۆحی و ڕۆژووە زۆرەکانییەوە کە دەیگرتن و توانای بەرگەگرتنی ڕۆحیی زۆریەوە، بۆ ماوەیەک بەرگەی ئەو تینوێتی و برسێتییەی گرت، وەلێ دوای هەفتەیەک، برستی لێ بڕا و گیانی سپارد. فەقیهەکان کە گومانیان هەبوو لەوەی مردبێت، داوایان کرد ببینن، تا ڕاستییەکەیان بۆ دەر بکەوێ. کاتێ چوون و بینییان، سەرەتا وایان زانی نوستووە، وەلێ دوای ئەوەش کە بۆیان دەرکەوت گیانی دەر چووە، هەر بردیان و داوایان کرد لەسێدارە بدرێ.

ئەمە چارەنووسی پیاوێک بوو، کە لەو تەمەنە کورتەیدا، هەموو هەوڵ و تەقەللایەکی لە پێناوی *ڕووناکی*دا بوو بۆ ژیان و بۆ ئینسانەکانی دەوروبەری. بەڵام لەبەر ئەوەی ئاستی تێگەیشتنی ئەوانەی دەوروبەری زۆر لەخوار ئاستی تێگەیشتنی ئەوەوە بوو، هەروەها چاویان بە هێز و توانای هزری و بەهرەی ئەو هەڵنەدەهات، هەمان ئەو چارەنووسەیان پێ ڕەوا بینی، کە پێشتر بە هاوەڵە ڕۆحییەکەی ئەویان ڕەوا بینیبوو، واتە مەنسووری حەللاج.

لە ڕاستیدا ئەمە چارەنووسی گەلێ لەو بیرمەند و زانا و فەیلەسووفە مەزنانە بووە لە مێژوودا، کە بوونەتە قوربانیی دەست خەڵکێکی نەفام و جاهیل. لە کاتێکدا ئەوان ژیانی خۆیان بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگە تاریکەکانی ژیانی ئەو خەڵکە تەرخان کردووە و بەرەو ڕووناکی و ئازادی ڕێنماییان کردوون، بەڵام ئەوان بە بیرێکی تەسک و لە ڕوانگەی بەرژەوەندیخوازییەکی بەرتەسکەوە، دەستیان چووەتە خوێنی ئەو ئینسانە گەورانەی





ژیان بەبێ بوونیان تەڵخ و تاریکە.

شەمسەدینی شارەزووری، کە یەکێک بووە لە قوتابییەکانی سوهرەوەردی، لە کتێبی *نزهة الأرواح و روضة الأفراح*دا دەڵێت، کە مامۆستاکەی لە ساڵی ٥٨٦ی کۆچیدا گیانی سپاردووە.

## ئیشراق چییە؟

بە سوهرەوەردی دەڵێن شێخی ئیشراق، با بزانین وشەی ئیشراق چی دەگەیەنێت؟

ئیشراق وەک وشە، واتە هەڵهاتنی ڕووناکی. کە دەوترێ *أشرقت الشمس*، واتە خۆرەکە هەڵهات و ڕووناک بۆوە و ڕووناکیی بەخشی. لە فەلسەفەی ئیشراقدا، ئیشراق واتە "دەرکەوتنی ڕووناکییە ئەقڵییەکان و درەوشانەوەی و سەرکەوتنی بەسەر دەروونە کامڵەکاندا، لە کاتی خۆدامالین لە کەرەسە بەدەنییەکان*." هەڵبەتە دەبێ ئەوەمان لەیاد نەچێت، کە سەرەکیترین چەمک لە فەلسەفە و عیرفانی سوهرەوەردیدا، چەمکی *ئیشراق*ە و تەوەری زۆربەی کتێبەکانێتی، بەڵام بەتایبەتی لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا، واتە کتێبی *حکمة الأشراق*، ئەمە بەزەقی دیارە. بەلای سوهرەوەردییەوە، ڕووناکی سەرچاوەی هەموو بوون و ژیانە و خودا ڕووناکیی ڕووناکییەکانە، "إن الله نور الأنوار" و هەر لە ڕووناکیی ئەوەوە ڕووناکییەکانی تر هەڵهاتوون، کە بوونەتە ئەستووندەگی هەردوو جیهانی ماتەری و ڕۆحی. بەلای سوهرەوەردییەوە، زانست ڕووناکییەکە لەناو دڵی

* بڕوانە *حکمة الأشراق*، السهروردي، ص٢٩٨.

عارفدا هەڵدێت. سوهرەوەردی هەم کەسێتیی فەیلەسووف و هەم کەسێتیی عارفیشی لەناو خۆیدا کۆ کردبۆوە. بۆیە بەلای ئەوەوە، ئینسان پێویستی بە دوو جۆر حیکمەتە بۆ گەیشتن بە ڕووناکی:

حیکمەتی پەیجۆری (یان بەحسی): کە پشت بە شیکردنەوە و پێکهاتەسازی (الترکیب) و ئەنجامگیریی بەڵگەدار دەکات، ئەمەش حیکمەتی فەیلەسووفانە.

حیکمەتی زەوقی: ئەمەشیان بەرهەمی ڕەنج و تەقەلالای ڕۆحییە و مرۆڤ ئەزموونی دەکات، بەڵام ناتوانێ گوزارشتی لێ بکات. ئەمەیان حیکمەتی ئیشراقییەکانە.

بەلای سوهرەوەردییەوە، هیچ دژایەتییەک لەنێوان ئەم دوو حیکمەتەدا نییە و ئیشراقیی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە، کە هەم لە حیکمەتی پەیجۆریدا شارەزایە و هەم لە نهێنییەکانی حیکمەتی زەوقیدا. ئەو بڕوای وایە ئینسان بەتەنها لە ڕێی مەعریفە تیۆرییەکانەوە ناتوانێ بە مەعریفەی ڕاستەقینە بگات، بەڵکوو پێویستی بە ئەزموونی ناخ و زەوقی ناوەکییش هەیە. هەروەها بە پێچەوانەشەوە، ئەزموونی ڕۆحی کامڵ نابێت، کاتێ نەبێت، کە لەسەر بنچینەی زانست و فەلسەفە دادەمەزرێ. هەر ئەمەش وای کرد سوهرەوردی باوەڕی بە کرانەوەی هەزری هەبێت و خۆی بە یەک فەلسەفەی دیاریکراوەوە نەبەستێتەوە و بە ڕووی فەلسەفەی یۆنانی و حیکمەتی ئێرانی و میسر و هیندستاندا بکرێتەوە و ئاوێتەیەک لە ئەفلاتوون و زەردەشت و فیتاگۆرۆس و هرمس فەراهەم بکات، بەڵام خاڵی دەستپێکردنی، چەمکی ڕووناکی یا نوور بوو، هەر وەکوو لە ئایەتی ٣٥ی سوورەتی *نوور*یشدا





هاتووە، "الله نور السماوات و الارض مثل نوره كمشكاة فيها مصباح المصباح في زجاجة كأنها كوكب دري يوقد من شجرة مباركة زيتونة لا شرقية و لا غربية تكاد زيتها يضيء و لو لم تمسسه نار نور على نور يهدي الله لنوره من يشاء و يضرب الله الامثال للناس و الله بكل شيء عليم." بێگومان نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێت، کە ئایینی زەردەشتییش یەکێک بووە لە سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی تێفکرین و تێرامان لای سوهرەوەردی، هەڵبەتە لەپاڵ فەلسەفەی یۆنانیی کۆن و غەزالی و ئیبن سینا و فارابی و حەللاج و بایەزیدی بەستامیدا. سەبارەت بە کاریگەربوونی بە فەلسەفەی کۆنی یۆنان، زیاتر ئەمە لە کاریگەربوونیدا بە فەلسەفەی ئەفلاتوون دەبینینەوە، کە بە *ئیمامی حیکمەت* ناوی دەبات، گەرچی ڕەخنە لە تیۆریی ئایدیالەکانی دەگرێت. هەروەها کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەرستۆیشەوە، لەبارەی ئەویشەوە دەڵێت، "یەکەمین مامۆستا، ئەرستۆتالیس، گەرچی پایەبەرز و قووڵ بووە و دووربین بووە، بەڵام نابێ زێدەڕۆیی تیا بکەین، بە ئەندازەیەک، بەرەو جاڕزبوونمان ببات لە مامۆستاییەکەی." (لە پێشەکیی *حکمة الاشراق*ەوە).

ماسینیۆن، کە یەکێکە لە شرۆڤەکارە بەناوبانگەکانی سوهرەوەردی، بەرهەمەکانی سوهرەوەردی دەکات بە سێ قۆناغەوە:

قۆناغی یەکەم: قۆناغی لاوی (قۆناغی ئیشراقی)، کە ئەم کتێبانەی تیا نووسیون: الالواح العمادية، هياكل النور، الرسائل الصوفية.

قۆناغی دووەم: قۆناغی مەشائی: التلويحات، اللمحات،

المقاومات، المطارحات، المناجاة.

قۆناغی سێیەم و کۆتایی: کە تیایدا کەوتە ژێر کاریگەریی ئەفلاتوونیەتی نوێ و ئیبن سیناوە. لە کتێبەکانی ئەم قۆناغەی: حكمة الاشراق، اعتقاد الحكماء، كلمة التصوف.

یەکێک لە تایبەتمەندییە دیارەکانی سوهرەوەردی ئەوەیە، کە بە زمانێکی شیعری و ئەدەبیی بالا کارە پەخشانی و شیعرییەکانی خۆی نووسیوە و لە ڕێی ئەوانەوە گوزارشتی لە بیروباوەڕ و تێڕوانینەکانی خۆی کردووە. هەندێ لە شیعرەکانی سوهرەوەردی، ئاستێکی زۆر بەرزیان تۆمار کردووە لە شیعری عیرفانیدا و بە دەقە ئیبداعی و زیندووەکانی شیعری عیرفانی لەقەڵەم دەدرێن، هەر بۆ نموونە، وەکوو شیعرەکانی (أبدا تحن إليكم الأرواح) و (أقول لجارتي و الدمع جار) یان پێنج خشتەکییەکەی لەسەر قەسیدەی (بانت سعاد)ی كعب بن زهير، یان موەشەحی وەکوو (يا مليحا قد تجلى) و (على العقيق إجتمعنا) [بڕوانە: ديوان السهروردي المقتول، الدكتور كامل مصطفى الشيبي، دار الجمل ٢٠١٤. هەروەها بڕوانە: السهروردي، مؤسس الحكمة الاشراقية، عبدالفتاح رواس قلعجي، الهيئة العامة السورية للكتاب].

***

دواجار، پێویستە شتێک سەبارەت بەم ڕۆمانەش بڵێین. *قەڵەندەر و قەڵا*، گێڕانەوەی سەربوردەی ژیانی شێخی ئیشراق، سوهرەوەردییە. نووسەری ئەم ڕۆمانە، بەو پێیەی خۆی پسپۆڕێکی شارەزای دونیای تەسەوف و عیرفانە و





خەڵکی ئەو دەڤەرەشە، کە کاتی خۆی سوهرەوەردیی تیا لەدایک بووە، توانیویەتی بەوردی لەسەر وێستەگەکانی ژیانی سوهرەوەردی بوەستێت، هەر لە منالییەوە تا دواساتی ژیانی لە زیندانی حەڵەب. نووسەری ئەم ڕۆمانە، لەم کارەدا توانیویەتی بە زمانێکی سادە و ڕەوان ڕووداوەکانی ژیانی سوهرەوەردی بەرجەستە بکات و حاڵەتە تایبەتییەکانی بخاتە ڕوو و ئاماژە بە ئایدیا سەرەکییەکانی هزر و فەلسەفەی سوهرەوەردی بکات و شێوەیەکی زنجیرەئاسای زەمەنی بە ڕووداوەکان بدات و لە فۆرمێکی سادە و جواندا بەرجەستەی بکات.

هەڵبەتە هەر وەکوو خوێنەریش بۆی دەر دەکەوێ، لە ڕۆمانەکەدا کۆمەڵێک زاراوە هاتوون، کە تایبەتن بە دونیای عیرفان و هەروەها بە ئایینی زەردەشتی، بۆ ئەوەی بەلای خوێنەرەوە نامۆ نەبن، بەپێی توانا پەراوێزم بۆ داناون و ڕوونم کردوونەتەوە.

خاڵێکی تر هەیە پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێ بدەین؛ نووسەر کاتێ ڕۆمانی قەلەندەر و قەڵای نووسی و بڵاوی کردەوە، لەلایەن خوێنەرانەوە پێشوازییەکی گەرمی لێ کرا و ئەمەش بووە مایەی ئەوەی چەند جارێک چاپ بکرێتەوە، تا گەیشتە چاپی دەیەم. بەڵام دوای دەیەمین چاپی ڕۆمانەکە، نووسەر دەسکارییەکی زۆری لە ڕۆمانەکەدا کردەوە و ئەم جارەیان بە ناوی *دادگاییکردنی هەتاوەوە* چاپ و بڵاوی کردەوە. ئەوەی جێی سەرنجە، زۆربەی ڕەخنەگران و خوێنەران هەستیان کرد ئەم دەسکارییانە زیانیان بە دەقەکە گەیاندووە و دەقەکەی پێشوویان بە دەقێکی کاملتر

و هونەریتر لەقەڵەم دا. هەر بۆیە ئێمەش وەرگێڕانەکەمان لە ڕووی دەقی یەکەمەوە کرد، گەرچی لە بەشەکانی کۆتاییی ڕۆمانەکەدا، هەندێ دەسکاریی بچووکمان کردووە و لە ڕووی ئەمانەتەوە ئەم ئاماژەپێکردنەمان بە پێویست زانی.

ئازاد بەرزنجی



# قەڵەندەر و قەڵا

# باڵەکەی ترم کوا

ئەی پەڕینەوەی ناسک و جوان
تۆ مانای باڵ لێک دەرەوە
تا پەڕی هۆشی من لە ئیرەییدا بسووتێ!

چاوی بڕیبووە ئاسمانێکی دوور. دوورترین خاڵی خۆرهەڵات. ئاسمانی پڕ لە ڕاز و نهێنی سەری لە دامێنی ئاسۆ دەسوو و تا ناکۆتا، لەنێو شینایی بێسنووری خۆیدا، کپ و خامۆش، ئۆقرەی گرتبوو.

نیگای واقوڕماوی لە ئاسمانەکەی ژوور سەری گیر کردبوو و تەماشای ئەو بووکانەی دەکرد، کە لە ئاسمانی پیرۆزەییەوە چاویان لێ دادەگرت. ئەم تاقە لاجیوەردییە بەلایەوە هێندە بەرز بوو، کە دەست پێی ڕانەدەگەیشت! دەتگوت بە گەنجینە پڕ لە نهێنییە پەیپێنەبراوەکەیەوە، لەو بەرزاییەوە دانیشتووە و ناز بەسەر خەڵکدا دەکات و تا بێت، دوور و دوورتر دەبێتەوە.

سەرلەنوێ هەوڵی دا لەم سەربانەوە بۆ ئەو سەربان باز بداتەوە و خۆی لەو شینایییە ئەفسووناوییەی ئاسماندا نوقم بکات. جەستەی بە ئامێزی ڕووتی بسپێرێت، لەگەڵ بووکە دلڕفێنەکانیدا بکەوێتە ڕاز و نیاز. بە ئارامی و لەشسووکییەوە بازێکی دا، بەڵام سەیری کرد، هێشتا هیچ بەرز نەبۆتەوە.

لە ئەنجامی ئەو تەقەللایەشیەوە، بەشەکەتی و بە لەشی ئارەقاوییەوە، کەوتە سەر سەربانێک.

سووکەڵە بوو، وەک نەسیم، وەک ڕۆح! هەستی دەکرد لە توانایدایە بەوپەڕی شادی و ئاسوودەییەوە، تا پەڕپەڕۆچکەی ئاسمان هەڵکشێت.

ئاوێزانی شینایی ئاسمان و نهێنییەکانی و شکۆی بێپایانی بوو. بە شادییەوە بەرەو ترۆپک دەچوو، بازی دەدا، بڵند دەبۆوە، بڵندتر و... ئای، جەخار، کە دەکەوتە سەر سەربانێکی تر. دووبارە پیرەمێردە ئاسمانییەکەی بینییەوە. پیرێکی بەشکۆ، تاجلەسەر، باخەڵ پڕ لە گوڵ، باڵێکی نوورانیی بە دەستەوەیە و بەدەم سەما و خەندەوە بۆی ڕاگرتووە و دەڵێت، "ئەمە هیی تۆیە، هیی تۆ! بە تاقە باڵێکەوە ناتوانیت بفڕیت. سەیری شانەکانت بکە."

ڕاستی دەکرد، تەنها تاقە باڵێک بە شانیەوە بوو. خەم ڕوخساری داپۆشی.

پیرەمێردەکە دووبارە بە میهرەبانییەوە وتی، "ئەم باڵە هیی تۆیە. وەرە دوای باڵەکەت بکەوە، وەرە."

پیرەمێردەکە دوور دەکەوتەوە، دوور و دوورتر، تا لەنێو قووڵاییی ئاسماندا ون بوو.

ئەویش هاواری دەکرد، "هیی منە، هیی منە. باڵەکەم بدەرەوە، بۆ خاتری خوا، باڵەکەم بدەرەوە. بە یەک باڵەوە ناتوانم بفڕم."

لە قەراغی گوێسەبانەکە وەستابوو و هەوڵی دەدا بەدوای پیرەمێردەکەدا بفڕێت.

"هینی منە، هینی من! بۆ خاتری خوا..."





چاوەکانی کردنەوە. نیگای چووە سەر دارەڕاکانی بنمیچەکە. هێشتا هەر لەبەر خۆیەوە، لە هەژمەتی فڕین، سرتەسرتی بوو. بەدەم هاوارەکانی ئەمەوە، دایکی بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە ژوورەکە. دەرگاکە بەتوندی داخرایەوە، "چیتە، ڕۆڵە؟ بۆ وا هاوار دەکەیت؟ دیسان خەونی ناخۆشت دیوە؟ مەترسە کوڕم، مەترسە، من لێرەم."

باوەشی بە دایکیدا کرد. شەڵاڵی ئارەقە ببوو. بەدەنی گەرم داهاتبوو و هێشتا نەهاتبۆوە سەر خۆی و هەڵدەلەرزی. چاوێکی لەسەر دایکی و چاوێکی لەسەر بنمیچەکە بوو. دایکی بە نیگەرانییەوە دەستی بەسەر سەریدا هێنا و ئارەقەکەی لەشی سڕی.

"کوڕەکەم، ئیتر نیگەران مەبە، من لەگەڵتدام. مەترسە، دیارە خەونی ناخۆشت دیوە، خەون و خەیاڵاتە و هیچی تر. ئەگەر دەتەوێ، ئاوت بۆ دەهێنم." هاوسەرەکەی بانگ کرد، "حەبەش، حەبەش، هەڵسە لە خەو، برۆ گۆزەیەک ئاو بێنە. کوڕەکەم ترساوە. دەی، خێرا بکە."

"چییە ژنەکە؟ بۆ وا نیگەرانیت، چی ڕووی داوە؟"

ژنەکە بەبێ ئەوەی وەڵام بداتەوە، بەپەلەپرووزێ گۆزەکەی سەرەونخوون کرد و قڵپ قڵپ، ئاوە سازگارەکەی کردە جامەکەوە. جامەکەی لە لێوە وشکەکانی یەحیا نزیک کردەوە و دەستی بە سەریدا هێنا و وتی، "بیخۆرەوە، کوڕم، بیخۆرەوە، تا ئارام ببیتەوە."

چەند قومێکی لە ئاوەکە دا، هاتەوە سەرخۆی. بە تەریقییەکەوە وتی، "ببوورە دایە، لە خەوم کردیت. دیسانەوە خەونم بینی. هیچ نییە. ئێستا باشم."

باوکی، کە هێشتا نوقمی خەو بوو، لەسەر تەختە خەوەکەی ئەمدیودیوێکی کرد. پاش تاوێک، نوستنەوە، بەڵام یەحیا لەبەر ئەو ڕووناکییە کزەدا، کە لە پەنجەرەکەوە دەخزایە ژوورەوە، سەیری بنمیچەکەی دەکرد. لە پەنجەرەکەوە بەشێکی ئاسمانی لێوە دیار بوو. بەکاوەخۆ هەڵسا و چووە لای پەنجەرەکەوە و ڕوانییە ئاسمان.

***

شنەبایەک هەڵی کردبوو. هەتاوە بێتینەکەی پاییز لە سەروو چیاکانەوە، کە وەکوو شوورایەکی بەرز دەورانددەوری شاریان دابوو، هێدی هێدی دەنیشتە سەر سینەی دەشتەکە. بەرامبەر هەیوانەکە ڕاوەستابوو. تاکێکی جزمەکانی لەپێ کردبوو، بەڵام دایکی لێی نەدەگەڕا و بەزۆر پارووی نانی بەیانیی دەخستە دەمیەوە. ئەویش تەختەی نووسینەکەی توند بە بنباڵیەوە گرتبوو و بۆ ئەوەی زوو لە دەستی دایکی ڕزگاری ببێت، پاروەکانی بەپەلە دەخوارد.

حەبەش، کە لەبەر تیشکی چێژبەخشی هەتاوەکەدا و لای سفرەی بەرچاییەکەوە لە هەیوان ئانیشکی دادابوو و سەیری خۆڕاپسکاندنەکانی کوڕەکەی و زۆرلێکردنی هاوسەرەکەی دەکرد، بە پێکەنینەوە وتی، "وازی لێ بێنە، ژنەکە. یەحیا لەوە دەر چووە منداڵ بێت، خۆی چەندی پێ بخورێت، دەیخوات. ئیتر بۆ ئەوەندە زۆری لێ دەکەیت؟ وریا بە نەیخنکێنیت."

ژنەکەش بە هەڵچوونەوە وتی، "لەوە دەر چووە منداڵ بێت؟ مەگەر تەمەنی لە دە ساڵ زیاترە؟ هەرکەسێ چەند ڕۆژێک چوو بۆ قوتابخانە و دوو وانەی خوێند، ئیتر لەوە





دەر دەچێت منداڵ بێت؟ ئەم منداڵەم ئەوەندە عەودالی دەرس و کتێبە، نە نان دەخوات و نە دەخەوێت. ئەی ئەگەر من لە خەمیدا نەبم و ئاگام لێی نەبێت، کێ ئاگای لێ دەبێت؟"

یەحیا هەر ئەوەندە لە دەستی دایکی ڕزگاری بوو، یەکسەر خۆی گەیاندە حەوشە، تاکە جزمەکەی تری بە دەستەوە گرت و بەرەو دەرەوە ڕای کرد. لە کاتێکدا باوکی بە ڕەفتارەکەی پێدەکەنی، لە کۆڵانەکە هەر بە حەواوە تاکە جزمەکەی تریشی لەپێ کرد و ملی ڕێی گرتە بەر.

پێبەپێی هاوتەمەنەکانی بە کۆڵانە گڵەکاندا ڕای دەکرد. لەگەڵ هاوپۆلەکانیدا، سەرەولێژیی نزیک مەیدانەکەیان تێپەڕاند. مزگەوتێکی کۆن لە مەیدانەکە بوو و قوتابخانەکەش ڕێک لەودیوی مزگەوتەکەوە بوو.

مامۆستا شێخ عەبدولڕەحمان لە حەوشەکە وەستابوو. کاتێ سەیری کرد منداڵەکان وەک گەلەی ئاسک غار دەدەن، هەردوو دەستی بەرز کردەوە و هاواری کرد، "هێواش، هێواش، چی ڕووی داوە؟ گشت ئاواییەکەتان کرد بە تەپوتۆز. ئێستا لە تۆزدا دەمخنکێنن. یەحیا، تۆ کە لە وانەکاندا لە پێشەوەی هەموو منداڵەکانیت، لە ڕاکردنیشدا لە پێشەوەیانیت؟ لەبیرت چووەتەوە تۆ ئیتر وا دەبیت بە شێخ؟ ڕاستە منداڵیت، بەڵام لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەدا هەرچییەکم دەزانی، فێری بوویت. تۆ ئێستا شێخی منداڵەکانیت، پێویستە ئاگات لە ڕەفتارت بێت!"

یەحیا بە شەرمێکەوە وتی، "ببوورە، مامۆستا! ئەوە حەزی فێربوون و سوودوەرگرتنە لە وانەکانی ئێوە، کە وامان لێ دەکات ڕابکەین، نەک حەز بە یاریی منداڵانە."

مامۆستا بە زەردەخەنەیەکەوە وتی، "ئەم قسەیە بۆ تۆ ڕاستە، بەڵام بۆ ئەوانی تر، نا."

***

منداڵەکان بە چواردەوری ژوورەکەدا دانیشتبوون. پیرەی مامۆستاش مێزێکی بچکۆلەی لە بەردەمی خۆیدا دانابوو و پاڵی بە دیوارەکەوە دابوو. منداڵەکان تەختەی نووسینەکانیان بە دەستەوە گرتبوو و بەوردی قەڵەمەکەیان لەسەری دەسووڕاند. هەندێکیشیان، کە ئەرکەکانیان تەواو کردبوو، تەختەکانیان شتبوو و لەپەنا دیوارەکەدا دابوویانە بەر هەتاوەکە، تا وشک ببێتەوە.

یەحیا کتێبەکەی کردبۆوە، بەڵام نیگای لە شوێنێک گیری خواردبوو. چەند خولەکێک دەبوو کتێبەکە بە دەستیەوە بوو، بەڵام خەیاڵی ڕۆیشتبوو. ئەمەش شتێک نەبوو، لە چاوە تیژەکانی مامۆستا پیرەکە بشاردرێتەوە. پیرە، کە سەیری کرد یەحیا نوقمی خەیاڵاتە، دارەکەی دەستی بە مێزەکەدا کێشا و بە دەنگێکی بەرز وتی، "یەحیا، خەیاڵت لەکوێیە؟ بیر لە چی دەکەیتەوە، بۆ خەریکی سەعییەکەت نیت؟"

یەحیا وەک ئەوەی لە خەیاڵێکی گەلێ دوورەوە گەڕابێتەوە، ڕاچڵەکی و لەناکاودا پرسیی، "مامۆستا، بنیادەم بۆچی خەون دەبینێت؟"

پیرەی مامۆستا، وەک ئەوەی چاوەڕێی ئەو پرسیارە نەبووبێت، بە ساردییەکەوە وتی، "باشە، بنیادەم کە دەخەوێت، ڕۆحی ئازاد دەبێت و بۆ هەرکوێ بیەوێ، دەڕوات."

یەحیا بە شێوەیەکی نائیرادی وتی، "مامۆستا، من





ماوەیەکە هەموو شەوێ خەونێک دەبینم."

"یانی چی؟ قابیلە خەڵکی تر شەوی چەند خەون دەبینن، وا تۆ یەک خەون دەبینیت؟"

ئەم قسەیەی پیرە، منداڵەکانی هێنایە پێکەنین، بەڵام کاتێ گرژیی ناوچەوانی مامۆستایان بینی، هەموو بێدەنگ بوون. یەحیا بەبێ ئەوەی لەو قسەیە بێتاقەت بێت، دووبارە وتی، "مامۆستا، من مەبەستم ئەوە نییە کە هەرشەوە خەونێک دەبینم، نەک دوو خەو، سێ خەو! نەخێر! مەبەستم ئەوە نییە! دەمەوێ بڵێم، کە ماوەیەک لەمەوبەر خەونێکم بینی، لە خەونەکەمدا دەمویست بفڕم، ئیتر لەو شەوە بەدواوە، هەموو شەوێک هەمان خەون دەبینمەوە."

هەموو سەرنجیان دایە یەحیا. منداڵەکان بە لاپرەسەنییەوە گوێیان بۆ قسەکانی یەحیا شل کرد.

"ئێستا تێگەیشتم، باشە ئادەی پێم بڵێ، چۆن دەفڕیت؟"

"مامۆستا، نافڕم، بەڵام لە خەونمدا دەبینم وا لە سەربانم و لە ئاسمان دەڕوانم. شکۆ و گەورەیی ئاسمان دەمخاتە سەر کەڵکەڵەی فڕین. حەز دەکەم بفڕم، لەپڕێکدا سەیر دەکەم باڵێک لەسەر شانی ڕاستم ڕواوە، باڵ ڕادەوەشێنم تا بفڕم، بەڵام ناتوانم. لەبەر ئەوەی بە باڵێکەوە ناتوانیت بفڕیت. ئیتر لە قووڵایی ڕۆحمەوە هەست دەکەم پێویستم بە باڵێکی ترە، باڵێکی تر، تا بتوانم بفڕم. بۆیە بێئاگایانە هاوار دەکەم، ‹باڵەکەی ترم کوا!› پیرەمێردێکیش لە دوورەوە ئاماژەیەکم بۆ دەکات و دەڵێت، ئەوەتا! ئەو پیرەمێردە دوورە لێمەوە، باڵێکی بە دەستەوەیە، ڕێک وەک ئەو باڵەی بە شانی ڕاستی منەوەیە. وەک ئەوەی تاکەکەی تری ئەو باڵەی من

بێت. بەرەو ڕووی ڕادەکەم، بەڵام بەر لەوەی پێی بگەم، خەبەرم دەبێتەوە."

پیرەی مامۆستا، کە بەوردی گوێی بۆ خەونەکەی ئەو شل کردبوو، بە سەرسووڕمانێکەوە ڕیشی خوراند و وتی، "ئینشائەڵڵا خێر دەبێت؛ من خۆم سەری لێ دەر ناکەم! بەڵام دەزانم خەونێکی گرنگە."

منداڵەکان هەموو کتێبەکانیان داخستبوو و نوقمی خەونە شیرینەکەی یەحیا بووبوون.

مامۆستا بە جیددییەوە وتی، "ئێ، ئیتر بەسە! خەریکی سەعییەکەتان بن."

خێرا کتێبەکانیان کردەوە و هەرکەسە خەریکی کاری خۆی بوو. پیرەش بە خوێندنەوەی قورئانەوە خۆی خەریک کرد.

یەحیا، وەک ئەوەی بە باسکردنی خەونەکەی هێور بووبێتەوە، بەئارامی کتێبەکەی کردەوە و دەستی بە خوێندنەوەی کرد.

خۆر بە تاقی ئاسمانەوە بوو. دەمەدەمی نیوەڕۆ بوو. منداڵەکان دەبووایە بۆ نانی نیوەڕۆ بچوونایەتەوە بۆ ماڵەوە. هەموو چاویان بڕیبووە مامۆستا و چاوەڕێ بوون ئیزنیان بدات.

مامۆستا کاتێ سەری لەسەر قورئانەکە بەرز کردەوە، بە سەرسووڕمانەوە پرسیی، "باشە بۆچی سەعی ناکەن؟" ئینجا هەر خۆی وەڵامی خۆی دایەوە، "نیوەڕۆیە، زۆر چاکە، بڕۆنەوە بۆ ماڵەوە."

منداڵەکان وەک ئەوەی ڕانەمەڕ بن و گورگ تێیان کەوتبێت، یەکسەر ڕژانە ناو حەوشەکە و بەرەو ماڵەوە کەوتنەوە غار.





مامۆستا بە دەنگێکی بەرز بانگی یەحیای کرد، "یەحیا! وەرە، وەرە ئێرە!"

یەحیا چوو بۆ لای. پیرە بە میهرەبانییەوە وتی، "دوای ئەوەی نانی نیوەڕۆت خوارد، پێش ئەوەی بێیتەوە بۆ قوتابخانە، بڕۆ بۆ لای خواجە عوبێد. بڵێ من فڵان ناردوومی بۆ لات. کتێبێکی منی لایە، گەر پێویستی پێی نەمابوو، لێی وەر بگرە و بۆمی بهێنەرەوە. خەونەکەی خۆیشتی بۆ بگێڕەرەوە. خواجە عوبێد لە لێکدانەوەی خەوندا ئوستادە. بزانە خەونەکەت چۆن لێک دەداتەوە!"

***

لە هەموو ڕۆژێک بێقەرارتر بوو. دەتوت کێچ کەوتۆتە کەوڵی. نائارام و بێئۆقرە، چاوەڕێی دیداری خواجە عوبێد بوو. ئاخۆ خواجە عوبێد چۆن خەونەکەی لێک بداتەوە؟

بەپەلە نانی نیوەڕۆی خوارد و بەرەو حەوشەکە ڕای کرد.

"دایە، من دەڕۆم!"

"بۆ کوێ؟ بۆ وا بەپەلەیت، خۆ هێشتا زووە؟"

"مامۆستا پێی وتم بچم بۆ ماڵی خواجە عوبێد، تا کتێبەکەی لێ وەر بگرمەوە و بۆی بەرمەوە. دەترسم درەنگ بێت. من ڕۆیشتم، خواحافیز."

دایکی، کە لە هەموو کاتێک زیاتر نیگەرانی ڕەفتاری بوو، بەئارامی وتی، "بڕۆ بەسەلامەتی. خوا ئاگای لێت بێت!"

ماڵی خواجە عوبێد لە بەشی سەرەوەی کۆڵانەکە و لە بەرزترین شوێندا بوو. باخچەیەکی هەبوو، کە بەرامبەر هەورازی ئەو دەربەندەی کەوتبووە خوارووییەوە، قوت

بووبۆوە و بە دار و دڕکوداڵ پەرژینی بۆ کرابوو. دەرگای ماڵەکەی لەسەر پشت بوو. خۆی کرد بە حەوشەکەیاندا. کیژۆڵەیەک لێی هاتە پێشەوە و پرسیی، "ئیشی چیت هەیە؟ بۆچی هاتوویت؟"

"ئیشم بە خواجەیە. لە قوتابخانەکەوە هاتووم، تا کتێبێکی لێ وەر بگرم و لەگەڵ خۆمدا بیبەمەوە."

"لەگەڵمدا وەرە! خواجە لێرەیە."

پیرەمێردەکە لەسەر سفرەیەک دانیشتبوو. کاسەیەک دۆ و نانی تریتکراوی لە بەردەمدا بوو.

"سڵاو!"

"سڵاو لە خۆشت."

"مامۆستا دەڵێ ئەگەر ئەو کتێبەیتان خوێندۆتەوە و پێویستتان پێی نەماوە، بمدەنێ تا بۆی ببەمەوە."

"بەڵێ، پێویستم پێی نەماوە. دەتدەمێ بۆی ببەرەوە. وەرە لەگەڵمدا دانیشە، لەمە بخۆ!"

"بەزیاد بێت، من نانم خواردووە، بەڵام ئەگەر مۆڵەتم بدەیت، خەونێکم دیوە، مامۆستا پێی وتم، کە بۆ ئێوەی بگێڕمەوە."

پیرەمێردەکە بە دەستی ئاماژەی بۆ کرد، تا دابنیشێت. یەحیا لەلایەوە دانیشت. پیرەمێردەکە، کە ددان لە دەمیدا نەمابوو، ئەو نانەی بە دۆکە تەڕ ببوو و خستبوویە دەمیەوە، بەزەحمەت قووتی دا و لە کاتێکدا خەریک بوو تیکەیەکی تری بۆ دەمی دەبرد، وتی، "باشە، دەی با بزانم، خەونەکەتم بۆ بگێڕەوە."

"گەورەم! ماوەیەک لەمەوبەر، لە خەونمدا خۆم لەسەر





سەربانی ماڵەوەمان بینییەوە، ڕاوەستابووم و تەماشای ئاسمانم دەکرد. حەزم دەکرد بفڕم بەرەو دوور. لەسەر شانی ڕاستم باڵێکم هەبوو. باڵم دەجووڵاند و دەجووڵاند، بەڵام هێشتا لەسەر زەوی بەرز نەبووبوومەوە، بە دەمدا دەکەوتم. بە باڵێکەوە نەمدەتوانی بفڕم. هەڵوەدای باڵێکی تر بووم. بێئاگا هاوارم دەکرد، ‹باڵەکەی ترم کوا؟› دەستێک لە دوورەوە ئاماژەی بۆ شوێنێک دەکرد. پیاوێکم بینی، باڵێکی بە دەستەوە بوو، دەتوت باڵەکەی تری منە. بەرەو ڕووی ڕام کرد، تا باڵەکەی لێ بسەنم. بەڵام بەر لەوەی بگەمە عاستی ئەو، خەبەرم بۆوە."

بەجۆشوخرۆشەوە دەیگێڕایەوە. لە شەرماندا سوور هەڵگەڕابوو. ئیستێکی کرد و وتی، "گەورەم، ئیتر لەو شەوەوە، هەموو شەوێک هەمان خەون دەبینم. دوێنێ شەویش هەر ئەو خەونەم بینییەوە."

خواجە بێدەنگ بوو و سەری دانەواندبوو. کیژۆڵەکە هات و سفرەکەی پێچایەوە. بەر لەوەی لە ژوورەکە بچێتە دەرێ، بە نەزاکەتەوە وتی، "هیچ فەرمانێکتان نییە، هیچتان پێویست نییە؟"

خواجە دەستی بۆ ڕاوەشاند، کە هیچی ناوێت. پاش تاوێک، سەری بەرز کردەوە و تەماشایەکی یەحیای کرد. ئینجا بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە میهرەبانییەوە وتی، "کوڕم! کتێبەکە ببە و بڕۆ!"

کتێبەکەی لە سندوقێک دەر هێنا، کە کەوتبووە دەستە ڕاستیەوە و دای بە یەحیا.

"بەڵام دوای نوێژی عەسر، وەرەوە بۆ لام، ئیشم پێتە."

یەحیا کتێبەکەی لێ وەر گرت و بە نەزاکەت و هێمنییەوە

گەڕایەوە. هێشتا لە ژوورەکە نەچووبووە دەرێ، کە خواجە بانگی کرد. بە خۆشحاڵییەوە ئاوڕی دایەوە، لە دڵی خۆیدا وتی، لەوانەیە خواجە سەبارەت بە خەونە سەیرەکەی شتێکی پێ بڵێت.

خواجە دەستی درێژ کرد و وتی، "بمدەرێ، بمدەرێ تا لە شتێکەوە بیپێچم. هەور ئاسمانی گرتووە، نەبادا باران بباری و کتێبەکە تەڕ ببێت."

بە ڕێزەوە کتێبەکەی دایەوە بە پیرەمێردەکە. خواجە بەشێنەیی قوماشێکی لە کتێبەکەوە پێچا، گۆشەکانی قوماشەکەی بەیەکەوە گرێ دا و دایەوە دەستی یەحیا، "ئێستا بیبە، عەیبی نییە. خێرا بکە، تا باران نەباریوە، با بگەیتەوە قوتابخانە. باران بباری، کتێبەکە پەڕپووت دەبێت. بیرت نەچێ، عەسر بێیتەوە بۆ لام."

یەحیا کتێبەکەی لێ وەر گرت و بەپەلە کەوتە ڕێ. وەختێ گەیشت، منداڵەکان لە قوتابخانە دانیشتبوون و خەریکی خوێندنی وانە بوون. سڵاوی کرد و کتێبەکەی دا بە مامۆستا.

"بارەکەڵڵا، ئافەرین! کتێبەکەت هێنا؟ ئەی خەونەکەی خۆت بۆ گێڕایەوە؟"

"بەڵێ!"

"ئەی چیی وت؟"

"فەرمووی بڕۆ و عەسر وەرەوە بۆ لام."

پیرە سەرێکی لەقاند و وتی، "زۆر باشە، دیارە دەیەوێ باشتر بیری لێ بکاتەوە، یان دەیەوێ لە کتێبێکدا بۆی بگەڕێت. بیرت نەچێ، عەسر بچیت بۆ لای."

"بەسەر چاو!"

منداڵەکان خەریکی وانەکەیان بوون و مامۆستا یەکەیەکە





بانگی دەکردن و شتێکی تازەی پێ دەوتن.

یەحیا کتێبەکەی برد بۆ مامۆستا و ئەویش لاپەڕەیەکی تری *کیمیای سەعادەتی* وەکوو ئەرک بەسەریدا دا. دوای ئەوەی مامۆستا ئەرکی ماڵەوەی بۆ هەموو قوتابییەکان دیاری کرد، ڕووی کردە یەحیا و وتی، "تۆ ئەرکەکەی حەسەن و میهرداد دیاری بکە! بەڵام پێش ئەوە، گوێ بۆ وانەکەی بەیانییان بگرە."

گوێی بۆ ئەو دووانە ڕاگرت. سەرگەرمی فێربوونی قورئان بوون، لە سوورەتە بچووکەکانەوە.

حەسەن و میهرداد وانەکەی بەیانییان وتەوە و یەحیا گرفتەکانی بۆ چارەسەر کردن و پاشان بە هەریەکێکیان، سوورەتێکی دا.

دەستی دایە کتێبەکەی خۆی و بە خوێندنەوەیەوە خەریک بوو. پێدەچوو مامۆستا لە یەحیا زیاتر نیگەرانی لێکدانەوەی خەونەکەی بێت، بۆیە سەیرێکی کرد و وتی، "زۆر باشە، بۆ تۆ ئیتر بەسە. بچۆ بۆ لای خواجە عوبێد و بزانە چی دەڵێت. بیرت نەچێ، هەرچییەکی پێ وتیت، دوایی پێم بڵێیت."

بە خۆشحاڵییەوە کەوتە ڕێ. پاش تاوێک، لە ماڵی خواجە بوو. لەوە دەچوو خواجەش چاوەڕێی ئەو بێت. لە حەوشەی ماڵەکەیاندا، لەسەر تاتەبەردێک دانیشتبوو. سڵاوی کرد و پیرەمێردەکەش بە ڕوویەکی خۆشەوە وتی، "سڵاو لە خۆشت، کوڕم! کتێبەکەت دایەوە بە عەبدولڕەحمان؟"

"بەڵێ!"

"دەربارەی خەونەکەشت، خەونێکی باشە! مژدەیەکە سەبارەت بە بەرەوپێشچوونی تۆ و ئامۆژەیەکە بۆ

نوقسانییەک، کە دەبێ پڕ بکرێتەوە و لەپێناویدا تێبکوشێت. تۆ باڵێکت هەیە، دەشێ ئەو بەهرەیە بێت، کە خوا پێی بەخشیویت. باڵێک، کە پێت بەخشراوە و خۆت بەدەستت نەهێناوە، بەڵام باڵەکەی ترت، باڵێکە دەبێ خۆت لەپێناویدا ماندوو بکەیت و بەدەستی بهێنیت. ئەو کەسەی باڵی دووەمی تۆشی لە دەستدا بووە، مامۆستا و رابەرەکەت بووە. بۆیە دەبێ بەدوای ئەو مامۆستایەتدا بگەڕێیت، کە لە توانایدایە باڵەکەی ترت پێ ببەخشێت. ئەمە لێکدانەوەی خەونەکەتە. بڕۆ، کوڕم، بڕۆ، سەرکەوتوو بیت!"

خەریک بوو بڕوات، خواجە ئاماژەی بۆ کرد، کە لێی نزیک ببێتەوە. لێی نزیک بۆوە. خواجە دەموچاوی ماچ کرد و پێی وت، "بڕۆ، لەپەنا خوادا بیت."

بە خۆشحاڵییەوە ڕۆیشت. هێشتا چەند هەنگاوێکی لە کۆڵانەکەدا نەنابوو، کە دووبارە خواجە بانگی کردەوە، "وەرە یەحیا، وەرە، دەبێ شتێکی تریشت پێ بڵێم."

بەپەلە گەڕایەوە. سەیری کرد، شێخ تا کۆڵانەکە بەدوایدا هاتووە. پیرەمێردەکە، کە لە ڕوخساری وردە دەبۆوە، وتی، "باش گوێ بگرە، تا باش لە مانای ئەم قسەیەم بگەیت! لەوانەشە ئەو باڵەی ترت، ئاماژە بێت بۆ جۆرە زانینێکی تر، جیاواز لەو زانستانەی لە قوتابخانە دەیانخوێنیت! زانست و دانایی، باڵی فڕینن بۆ مرۆڤ. ئەم زانستە رووکەشانە باڵێکن و چەند زانستێکی تریش هەن، کە بەری ڕۆشنبینیی دەڕوونن. ئەمانەش باڵەکەی تری مرۆڤن! ئەوەی من بۆی دەچم، ئەمەیە و خوا خۆیشی دەزانێت. خۆش هاتیت، سڵاوم بە مامۆستاکەت بگەیەنە."



# کۆچ

بۆنی هیجرەت دێ

بالیفەکەم پڕە لە ئاوازی پەڕی پەڕەسێلکەکان.

پێشنوێژەکە بە سڵاودانەوە، کۆتاییی بە نوێژی مەغریب هێنا.

هۆڵی مزگەوتەکە بە ستوونە بەردینە کۆنەکانی و تاقە بەرزە گومەزئاساکەیەوە، ئەو ڕۆژگارە درێژەی دەهێنایەوە یادی مرۆڤ، کە مزگەوتەکە بەسەری بردبوو.

لەنێوان دوو نوێژدا، خواجە بوبەکر لە ڕیزی نوێژکەران هەڵسایە سەر پێ و هاتە پێشەوە، ڕووی کردە خەڵکەکە و وتی، "برایان، گەردنم ئازاد بکەن! سبەینێ بەرەو ئەسفەهان دەکەومە ڕێ. نزای خێرم بۆ بکەن، کە سەفەرێکی سەلامەت بکەم."

خواجە عوبێد، پێشنوێژی مزگەوتەکە، لە شوێنی خۆی بەرز بۆوە و نزای بۆ کرد و ئەوانی تریش هەموو وتیان، ئامین. خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد. لە کۆڵانەکەدا، خواجە بوبەکر لەگەڵ خواجە عوبێددا پێکەوە بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتنەوە. هەواکەی فێنک و سازگار بوو. مانگ تریفەی زیوینی خۆی بەسەر کۆڵانەکەدا پەخش کردبوو. ئاسمان بە ئەستێرە جریوەدارەکانیەوە بە ڕادەیەک نزیک

بوو، کە دەتگوت نزیکترین میوە مرۆ دەستی پێ ڕابگات، ئەستێرەکانی ئاسمانن! خواجە بوبەکر خزمەتکارەکەی بانگ کرد و وتی، "ئەحمەد! بچۆ بۆ ماڵی خواجە عەبدولڕەحمان و پێی بڵێ با دوای شێو بێت بۆ ماڵی ئێمە."

"بەسەر چاو، خواجە."

خواجە عوبێد بە لاپرەسەنییەوە پرسیی، "خواجە! ئیشی چیت بە عەبدولڕەحمانە؟ خێرە؟"

خواجە بەدەم پێکەنینەوە وتی، "بەڵێ، خێرە. دەمەوێ بەر لە سەفەرەکەم، وەسیەتنامەیەک بنووسم. خۆت دەزانیت ئیتر ئەمە سەفەرە و هەزار ماجەرا لەپێشە. ڕۆیشتن بەدەست خۆتە و هاتنەوە بەدەست خۆت نییە. ئەو ڕێگەیانەش جێی متمانە نین. وا چاکترە حیساب و کیتابێکی خۆم بکەم."

شێخ سەری لەقاند و وتی، "ڕاست دەفەرموویت! ئینشاڵڵا سەفەرێکی سەلامەت دەکەیت."

هەردووکیان باوەشیان بەیەکدا کرد و بە ئومێدی شادی، لەیەک جیا بوونەوە.

کاتژمێرێکی شەو تێپەڕیبوو، پیرەی مامۆستا، عەبدولڕەحمان، لە کاتێکدا عەباکەی توند لە خۆیەوە پێچابوو، بە کەمەری نیوەچەماویەوە و بەپەنا دیوارەکاندا بەکاوەخۆ بەرەو ماڵی خواجە بوبەکر دەڕۆیی. کاغەزێکی لوولکراوی بە دەستەوە بوو و قەڵەم و مەرەکەبەکەشی لە شاڵەکەیدا جێ کردبووە. دەستی بە دیوارە گڵەکانەوە دەگرت و لەسەرخۆ هەنگاوی دەنا. وەختێ لە سەری کۆڵانەکە تێپەڕی و گەیشتە دووڕێیانەکە، سێبەرێکی درێژی





لەپەنا خۆیەوە بینی. ئاوڕی دایەوە، سەیری کرد حەبەشی کوڕی ئەمیرەکە. بە خۆشحاڵییەوە پێی وت، "سڵاو لە هاوڕێی خۆم، جەنابی حەبەش. بەم کاتە درەنگەی شەو، بەرەو کوێ؟ ئینشاڵڵا خێرە؟

حەبەش، کە ئێستا شانبەشانی پیرە دەڕۆیی، وتی، "سڵاو، شێخ! ئەی تۆ بەم پشتە چەماوەوە بەرەو کوێ دەچیت؟ چی ناچاری کردوویت بەم درەنگوەختە لە ماڵ بێیتە دەرێ؟ ئەی ناترسیت دزانی شەوگەڕ عەمامەکەت لێ بفڕێنن."

پیرە، لە کاتێکدا پێدەکەنی، وتی، "ئەی شەوڕۆی سەردەستەی چەتەکان! مەگەر تۆ عەمامەکەم بفڕێنیت، ئەگینا هیچ کەسێکی تر لێرە جەسارەتی ئەوەی نییە!"

حەبەشیش بە قاقایەک خامۆشیی ماتیی شەوی شکاند.

پیرە کەمەری ڕاست کردەوە و وتی، "دەچم بۆ ماڵی خواجە بوبەکر. وا بزانم دیسانەوە دەیەوێ وەسیەتنامە بنووسێت."

حەبەش بە زمانێکی ئازاردەرانەوە وتی، "خوا ڕەحم بە خواجە بوبەکر بکات، کە هەرجارە وەسیەتێک دەنووسێت و سفرەی تۆ دەڕازێنێتەوە. ڕاست بڵێ، بۆ هەر وەسیەتنامەیەک، چەندی لێ وەر بگرێت؟"

هەردووکیان دایانە قاقای پێکەنین. حەبەش، کە دەستی دابووە بنباڵی پیرە، وتی، "ئەز قەزا، منیش هەر بۆ ماڵی خواجە بوبەکر دەچم. هاوڕێیەکی باشت بۆ پەیدا بوو. هەم دەست دەداتە بنباڵت و هەم دەشتپارێزیت. خوا بۆی ناردیت! ئیتر چیت دەوێت؟"

دەنگی پێکەنینی پیرە هێندەی نەمابوو گشت خەڵکی ئاوایییەکە بێدار بکاتەوە. لە کاتێکیشدا هاوسەنگیی خۆی بە حەبەش ڕاگرتبوو، پرسیی، "ئەی تۆ ئیشت بە خواجە بوبەکر چییە؟ نەکا نەخشەیەکت کێشابێت، تا کڵاوێک بکەیتە سەری خواجەش؟"

حەبەش چاوی لەسەر باخچەکانی کۆڵانەکە بوو. سێبەری چەقەڵێکی لای پەرژینی باخچەیەکی نزیکیانەوە بینی، کە بەخێرایی لەناو دارەکاندا ون بوو. لە کاتێکدا بەوردی لە ڕووناکییە کزەکەی کۆڵانەکەی دەڕوانی، وتی، "یەحیا ماندووی کردووین. واز ناهێنێت. ئارامیی لێ هەڵگرتووین. دەزانیت! بۆیە دەچم بۆ لای خواجە بوبەکر، تا لەگەڵیدا قسە بکەم و پێی بڵێم، بەڵکوو لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ ئەسفەهان. عەبدولڕەحمان، لە ڕاستیدا خەونی فڕینی کوڕەکەم و لێکدانەوەکەی خواجە عوبێد بۆی، دوو ساڵە ئۆقرەی لێ بڕیوین. هەر بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی، لەگەڵ دایکیدا بردم بۆ مەراغە، بەڵام دوای نزیکەی ساڵ و نیوێک، وەزعی شارەکە تێک چوو و هاتینەوە. وتم ئیتر واز دەهێنێت، بەڵام چی بکەم، وازناهێنێت. ئێستا ئیتر کەیفی خۆیەتی. من ناتوانم لەوە زیاتر ئاوارەی ئەم شار و ئەو شار ببم. خەریکە ژیانم لەبەریەک هەڵدەوەشێتەوە. خۆی سەرپشک دەکەم و چییش ڕوو دەدات، بە خوای دەسپێرم."

عەبدولڕەحمان، لە کاتێکدا ئاوازی قسەکردنی جیددی بووبوو، وتی، "ئیشێکی زۆر باش دەکەیت! لێی گەڕێ با بڕوات دەرس و دەورەکەی خۆی بخوێنێت. حەیفە ئەو کوڕە لێرە حەپس ببێت. لێرە کەسێک نییە شتێکی تازەی





فێر بکات. ئەگەر بینێریت بۆ ئەسفەهان، پاشەڕۆژی وەک خۆر پرشنگدار دەبێت. لە زاناکانی مەراغەشەوە، فێری زۆر شت بووە. خۆ ئەگەر بۆ ئەسفەهانیش بچێت، ئەوا ئینشاڵڵا دەبێ بە زانایەکی تەواو."

لە بەردەمی ماڵی خواجە بوبەکردا وەستابوون. حەبەش دەستی برد بۆ ئەڵقەڕێزی دەرگاکە و توند پیایدا کێشا. لە حەوشەی ماڵەکەوە دەنگێک بەرز بۆوە، "شێخ عەبدولڕەحمان، ئێوەن؟ بەخێر بێن."

"بەڵێ ئەحمەد، خۆمم. خێرا دەرگاکە بکەرەوە، ناتوانم زۆر بە پێوە ڕابوەستم."

ئەحمەد کێلونی دەرگاکەی ڕاکێشا. دەرگاکە ناڵەیەکی کرد و کرایەوە. دوو پیاوەکە خۆیان کرد بە حەوشەی ماڵەکەدا. خواجە بەرامبەر بە هەیوانە بەرزەکەی خانووەکە، لەسەر تەختێک دانیشتبوو و چەند خزمەتکارێکیش خەریکی پێچانەوەی کەلوپەلی سەفەرەکەی بوون.

خواجە وەختێ حەبەشی لەگەڵ عەبدولڕەحماندا بینی، بە پێکەنینەوە وتی، "تەماشا ئەم میوانە موبارەکە! ئافەرین بۆ شێخ عەبدولڕەحمان، کە میوانێکی ئازیزی لەگەڵ خۆیدا بۆ هێناوین. بەخێر بین."

خواجە پێشوازیی لە میوانەکانی کرد. هەر لە هەیوانەکە دانیشتن. ئینجا خواجە ڕاسپاردەکانی دەوتەوە و شێخ عەبدولڕەحمانیش یەکەبەیەکە دەینووسینەوە. وەسیەتنامەکە تەواو بوو. دەستخەتی شێخ، جوان بوو. وەسیەتنامەکەی ڕادەستی خواجە بوبەکر کرد. خواجە لە خوارووی وەسیەتنامەکەوە ئیمزایەکی کرد و پاشان وەسیەتنامەکەی

دا بە حەبەش و وتی، ”جەنابی حەبەش، تۆش وەکوو شایەتێک، وەسیەتنامەکە ئیمزا بکە.“

حەبەش لەتەنیشت ئیمزاکەی خواجە بوبەکرەوە ئیمزایەکی کرد و ئینجا هەردوو دەستی لێ خشاند و وتی، ”شایەتیدان خەرجیی خۆی هەیە، خواجە! خەرجییەکەی دەدەیت؟“

خواجە لە کاتێکدا قاپێک چەرەسی بە دەستەوە بوو و دەیخستە بەردەمیان، وتی، ”حەبەش، تۆ هەر وا بێ مەلامەت نەهاتوویت بۆ ئێرە! بێگومان دیسانەوە شتێکت لە مێشکدایە! ڕاست بڵێ، خەبەر چییە؟“

”خەبەر! خەبەری چی؟ دیسانەوە هەر کە چاوت پێم کەوت، یەکسەر شتێکت بۆ دروست کردم. نا، هیچ خەبەرێک لەئارادا نییە. بەتەنها هاتووم داوایەکت لێ بکەم. دەزانم تۆ بۆ من وەکوو برایەکی میهرەبان وایت و داواکەم ڕەت ناکەیتەوە.“

خواجە بەدەم سەرلەقاندنەوە وتی، ”بەڵێ، بەڵێ، ڕەتی ناکەمەوە. واتە ناچارم قبوڵی بکەم، ئەگینا لە دەست پلار و تەوسەکانی حەبەش ڕزگارم نابێت. فەرموو پێم بڵێ، چی بووە و چیت دەوێت؟“

حەبەش بە ئاوازێکی جیددییەوە وتی، ”یەحیای کوڕم لە کەللەی داوە بۆ خوێندن بچێت بۆ شارێکی گەورە. بۆیە منیش بڕیارم داوە بینێرم بۆ ئەسفەهان، بەڵام ناتوانم لەگەڵ هەموو کەسێکدا بینێرم. دوێنێ بیستم ئێوە نیازی ئەسفەهانتان هەیە. وتم بێگومان خواجە دەست بە ڕوومەوە نانێت. ئەگەر دەتوانن، ئەویش لەگەڵ خۆتاندا





ببەن بۆ ئەسفەهان. شتێک پارەم بۆ خەرجی و خۆراکی داناوە، هێسترێکی باشیشم بۆ ئامادە کردووە. بەڵکوو لەوێش ڕادەستی یەکێک لە هاوڕێ متمانەپێکراوەکانی خۆتی بکەیت، تا ئاگای لێ بێت.“

خواجە بە ڕوویەکی خۆشەوە وتی، ”زۆر باسی یەحیایان بۆ کردووم. کوڕێکی زیرەک و وریایە. منیش ڕام لەگەڵتدایە. لەگەڵ خۆمدا دەیبەم بۆ ئەسفەهان و لەو ڕووەوە خاترجەم بە. لەوێش دۆستم زۆرە، ئاگایان لێی بێت. بڕۆرەوە و کوڕەکە ئامادە بکە. سبەینێ، دوای مەلابانگدان، دەکەوینە ڕێ.“

لەماڵەوە، یەحیا بە پەرۆشەوە چاوەڕوان بوو. کاتێ حەبەش خۆی کرد بە ژووردا، هاوسەرەکەی بە نیگەرانییەوە لێی پرسی، ”چی بوو؟ خواجە بوبەکر چیی وت؟“

حەبەش ڕووی کردە یەحیا و وتی، ”سبەینێ سەرلەبەیانی، دوای مەلابانگدان، دەبێ بڕۆیت! لەبەر ئەوە، بڕۆ بحەوێرەوە، تا بەیانی پڕتاقەت بیت. دایکت کەلوپەلەکانت بۆ ئامادە دەکات.“

دایکی هەوڵی دا سەیری یەحیا نەکات و بەبێدەنگی دەستی کرد بە گریان.

دایکی یەحیا تا بەیانی نە جارێک و نە سەد جار، بۆنی نا بە کەلوپەلەکانی یەحیاوە و ماچی کردن و خستنیە سەر چاوی و ئیتر هەرچۆنێک بوو، شتەکانی بۆ ئامادە کرد. وەختێ دەنگی مەلا بەرز بۆوە، دایکی چوو تا یەحیا بێدار بکاتەوە، بەڵام ئەو لە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. دایکی

بە نیگەرانییەوە لێی پرسی، "کوڕم، نەخەوتیت؟"

"با، خەوتم." بەدەم کۆکردنەوەی کتێب و دەفتەرەکانیشیەوە، لەژێر لێوەوە ورینگەورینگی بوو:

"بالیفەکەم پڕە لە ئاوازی پەڕی پەڕەسێلکەکان و
زرینگە زرینگی زەنگی کاروان
تۆش نازانی سپێدەی سەفەر چەندە ساماڵە!"



# لە فڕینەوە بەرەو غەریبی

لە هەرکوێ بم
ئاسمان هیی منە
پەنجەرە، بیر، هەوا، عەشق، زەوی هیی منە.
چ بایەخێکی هەیە گەر هەندێ جار
قارچکەکانی غوربەت بڕوێن؟

سێبەری تاقێکی بەرزی سەرسەراکە هاتە سەری. کونەلووتەکانی پڕ بوون لە بۆنی ئەو بەهارات و داوودەرمانەی بە تەپوتۆزە هەمیشەییەکەی بازاڕ تێکەڵ بووبوو. بە پێچەوانەی مێردمناڵەکانی هاوتەمەنیەوە، دەنگی چەکوشی قەڵەمکاران و کڕەکڕی مشارەکان و بۆنی گوڵاو، سەرنجی ئەمیان بەلای خۆیاندا ڕانەدەکێشا. نوێژی عەسری کردبوو و بەرەو دوکانەکەی خواجە موختار دەچوو.

گەیشتنە بازاڕی چوارسوق.

"ئای، مەگەر پێم نەوتیت ئەو فەردە نۆکە لە بەردەمی پەنجەرەکەدا لا ببە؟... باشە! حاجی ئاغا، ئێوە چیتان دەویست؟"

دەنگی خواجە و شاگردەکەی هەمیشە بەرز بوو. چووە ناو چوارسوقەوە و پێی نایە ناو دالانەکەیەوە، "سڵاو، قوربان..."

"سڵاو، سەر چاوان. فەرموون، پیاوی گەورە!... وەرە، وەرە دانیشە!"

بە دڵنیاییەکی تایبەتەوە، کەوشەکانی پێی داکەند و بەهێمنی لای خواجەوە دانیشت.

"یەحیا گیان، چۆنە وا هاتوویت بۆ لامان؟"

"ویستم هەواڵێکتان بپرسم و سۆراخێکی خواجە بوبەکریش بکەم."

"لە کاتێکی باشدا هاتیت. خواجە بوبەکر تا سەعاتێکی تر پەیدا دەبێت."

هێشتا خواجە قسەکانی تەواو نەکردبوو، کە بوبەکر هات.

خواجە بوبەکر پاش ئەحواڵپرسی لەگەڵ خواجە موختاردا، دەستێکی بەسەر سەری یەحیادا هێنا و وتی، "هاوشارییەکەمان چۆنە؟"

یەحیا سەری دانەواند و وتی، "سوپاستان دەکەم."

خواجە کیسەیەکی لە بەرۆکی دەر هێنا و دای بە خواجە موختار و وتی، "ئەمە پارەی هێسترەکەیە بۆ خەرجیی یەحیا! بە پشتیوانیی خوا، من سبەینێ دەگەڕێمەوە. ئەم ئەمانەتەی سوهرەوەرد بە تۆ دەسپێرم. ئیتر ئەوە تۆ و یەحیا."

ئینجا ڕووی کردە یەحیا، "کوڕم، هێشتا نەچووە بچێت و تا سبەینێش دەرفەتت هەیە. ئێستاش دەتوانین پارەکە بدەینەوە بە کابرا و هێسترەکەی لێ بسەنینەوە و بگەڕێینەوە. تا سبەینێ، تەواو مێشکی خۆت ساف بکە."

خواجە موختاریش وتی، "ڕاست دەکات. باش بیری





لێ بکەرەوە، چونکە ئەگەر دوایی پەشیمان ببیتەوە، کەس نابێت بتباتەوە بۆ سوهرەوەرد. خواجە سبەی دەڕواتەوە، خۆت دەزانیت!..."

ڕوومەتەکانی سوور هەڵگەڕان و زەردەخەنەیەک نیشتە سەر لێوی. سەری دانەواند و وتی، "من بە ویستی خۆم هاتووم بۆ ئێرە و بە یاریدەی خوا دەمێنمەوە. ڕێگەیەکم لە بەردەمدایە و..." بێدەنگ بوو.

بوبەکر هەڵسا و ماچێکی کرد و وتی، "بڕۆ! بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە! من تا مەغریب لێرەم. نامەیەکیش بنووسە، با سبەینێ لەگەڵ خۆمدا بیبەم."

یەحیا خواحافیزیی لێ کردن و چووە دەرەوە.

بوبەکر ڕووی کردە موختار و وتی، "لە تەمەنی خۆی زۆر گەورەترە. زۆربەی زاناکانی شارەکەمان، لە ئاستیدا دەستەوەستان بوون."

***

ئەوەندەی بۆ مەغریب نەمابوو، کە یەحیا بەهەڵەداوان گەیشتەوە حوجرە. کەیفی هەبوو و شتێکی لەناو دەسرێک پێچابوو. سڵاوی کرد و لەسەرخۆ، بەدەم خەندەوە، وتی، "خواجە! ئەم نامەیەم بۆ باوکم نووسیوە."

دەسرەکەی داێ.

"ئەم دیارییەشیان بدەرێ. زۆر سوپاسی ماندووبوونەکانی ئێوەش دەکەم! بە خواتان دەسپێرم."

بوبەکر، کە هێشتا دەسر و نامەکەی بە دەستەوە بوو، لەسەر کورسییە بچکۆلەکەی لای دەرگاکەوە دانیشت

و نیگای خستە شوێن هەنگاوە ئارامەکانی یەحیا و وتی، "ئێستاش باوەڕ ناکەم مێردمناڵێکی وا هەبێت، بەو هەموو خەسڵەتە بەرزەوە."



# بینیت کە خەونەکەم ڕاست بوو!

دەمەو خۆرنشین
لەنێو ئامادەگیی کەنەفتی شتەکانا
نیگایەکی چاوەڕوان، قەوارەی کاتی ئەبینی

"لە خەونمدا، پۆلێک کۆتر لە سەمتی قیبلەوە دەهاتن! من ڕاوەستابووم و سەیرم دەکردن. بەرەو بەرزاییی ئاسمان دایان لە شەقەی باڵ، سووڕانەوە، پاشان لەسەر گوێسەبانەکەی ئێمە نیشتنەوە."

"خوا حەز بکات خێر دەبێت."

حەبەش، کە لە شڵەژاویی هاوسەرەکەی بێدار بووبۆوە، هەردوو چاوی نووقاند. ماوەیەک بوو دایکی یەحیا تەواو ئۆقرەی لێ بڕابوو. تا بەیانی نەدەخەوت و بەردەوام خەونی ناخۆشی دەبینی و هەرجارە بە چەشنێک چارەنووسی یەحیای لێک دەدایەوە.

حەبەشیش بە داماوی و نیگەرانییەوە، هەر چاوی تێ دەبڕی و هیچی لەدەست نەدەهات.

بۆ بەیانی، دیسانەوە دایکی یەحیا خەونەکەی گێڕایەوە و داوای لێکدانەوەکەی کرد. حەبەش دەیزانی کۆتر پەیکە و خەونی هاوسەرەکەشی نیشانەی ئەوەیە، کە بوبەکر لەگەڵ خۆیدا نامەیەکی کوڕەکەیان دەهێنێتەوە و بەس،

بەڵام پرکێشیی نەدەکرد، ئەوە بە هاوسەرەکەی بڵێت. لەسەر سفرەی بەرچاییش، حەبەش بۆ چرکەساتێک چییە، لە خەونی هاوسەرەکەی خافڵ نەبوو. کاسەی شیرەکەی بە دەستیەوە بوو، چاوی بڕیبووە سەر سفرەکە و تەماشای نەخشونیگارەکەی دەکرد و ناوبەناویش، قومێکی لە شیرەکە دەدا.

"هەر بیر لە خەونەکەی تۆ دەکەمەوە! دڵنیام هەواڵێکی خۆشمان پێ دەگات."

هاوسەرەکەی بە بێباوەڕییەوە سەرێکی ڕاوەشاند. دەیزانی لەبەر دڵی ئەو، ئەم قسەیە دەکات.

هێشتا بیریان لە خەونەکە دەکردەوە، کە خزمەتکارەکە خۆی کرد بە ژووردا، "گەورەم، لای کانییەکە، گوێم لێ بوو دەیانوت کاروانەکەی خواجە بوبەکر گەڕاوەتەوە. دوێنێ شەو درەنگ گەیشتوونەتەوە سوهرەوەرد."

هێشتا چاوی حەبەش لەسەر دەمی کاووسی خزمەتکار بوو، کە هاوار لە دایکی یەحیا بەرز بۆوە، "ئەی کوڕەکەم؟ کوڕەکەم کوا؟ ئەی تۆ نەتوت بەرگەی غەریبی ناگرێت و دەگەڕێتەوە؟ ئەگەر ئەوی لەگەڵ بووایە، هەر دوێنێ شەو دەهاتەوە بۆماڵەوە."

حەبەش هەستا. بەرەو حەوشە چوو و پاشان گەڕایەوە بۆ ژوورەوە. نەیدەزانی بڵێ چی. بەبێدەنگی لای هاوسەرەکەیەوە دانیشت.

"ئێستا کە هیچ نەبووە، بۆ وا خۆت بێتاقەت دەکەیت؟ چاوەڕێ بکە، تا سەعاتێکی تر، هەموو شتێکمان بۆ ڕوون دەبێتەوە. ئەگەر دەتەوێ، پێکەوە دەچین بۆ لای بوبەکر و





سۆراخی کوڕەکەمان دەکەین."

ژنەکە بەبێدەنگی، بە چمکی سەرپۆشەکەی فرمێسکەکانی چاوی سڕی.

"نەخێر، تۆ بڕۆ. هەر ئێستا!"

حەبەش بەناچاری ڕۆیشت. دەترسا لەوەی هێشتا زوو بێت و ئەوان جارێ لە خەو هەڵنەسابن. لە دوورەوە خزمەتکارەکەی خواجە بوبەکری بینی لە سەراکە ڕای دەکرد.

"خواجە بوبەکر بەخەبەرە یان هێشتا هەڵنەساوە؟"

"نەخێر، دەمێکە هەڵساوە و وا لە حەوشەی پشتەوە، بارەکە دەکاتەوە."

"پێی بڵێ حەبەش لە بەردەرگایە و دەیەوێ بتانبینێت."

خزمەتکارەکە ڕۆیشت و ئەوەندەی پێ نەچوو، گەڕایەوە و خواجەی بۆ ناوەوە ڕێنمایی کرد. لە حەوشەی پێشەوە تێپەڕین. بە دالانێکدا ڕۆیشتن و چوونە حەوشەکەی پشتەوە و خواجە بوبەکر بەرەوپیری هات و بەگەرمی باوەشی پیا کرد."

"باشە، باشە، یەحیای کوڕت بووەتە سەبەبکاری خێر، وا بەم بەیانییە زووە هاتوویت بۆ لامان؟ چییە، ئەی گاڵتەوگەپەکانت کوا؟ دووریی منداڵ سەختە، ها؟"

حەبەش بە دڵتەنگییەوە وتی، "شەرمەزارم! دایکی دەڵێی لەسەر ئاگرە."

"دەزانم، دەزانم. من شەرمەزارم، کە دەبووایە زوو هەواڵی یەحیام پێتان بدایە. بەڵام مامەوە، تا هەندێ کاری پێویست بەڕێ بکەم، ئینجا خۆم بێمە خزمەتتان. ئامانەتەکەی یەحیام لێرەدا داناوە."

هەنگینیێ دەسرێ و نامەکەی لە قوژبنێکی هەیوانەکەدا هەڵگرت و دای بە حەبەش. ئەمیش سوپاسێکی زۆری کرد و بەپەلە ڕێی ماڵەوەی گرتەوە بەر.

هاوسەرەکەی لە بەردەرگا چاوەڕێی بوو.

"نەموت خەونەکەت خێرە. ئەمەش نامە و دەسرەی کوڕەکەت."

دایکی یەحیا دەسرەکەی بۆن کرد و ماچی کرد و خستیە سەر چاوی.

"دەی، خێرا بکە، نامەکەیم بە دەنگێکی بەرز بۆ بخوێنەرەوە!"

"بەسەر چاو! سەبر بکە، با کەمێک بێمەوە سەرخۆم، لە ماڵی خواجەوە تا ئێرە بە ڕاکردن هاتوومەتەوە."

حەبەش نامەی کردەوە. سەرەتای نامەکە جگە لە ئەحواڵپرسی و بەڕێوەچوونی کارەکانی، هیچی تر نەبوو، پاشان تا کۆتاییی نامەکە، باسی لە وانە و مامۆستا و حوجرە کردبوو. دەتوت یەحیا جگە لە دنیای دەرس و دەورەکانی، دنیایەکی تری نەدەناسی. نامەکە تەواو بوو و لەگەڵ بێدەنگبوونی حەبەشدا، دیسانەوە قوڵپی گریانی دایکی یەحیا بەرز بۆوە.

"ئێستا ئیتر بۆچی دەگریت؟ ئەوەتانێ کوڕەکەمان ساغ و سەلامەتە و لەوێش زیرەکی و خوێنەواریی دەنگی داوەتەوە. هەق نییە بۆ دووریی کوڕێکی لەم چەشنە، خۆمان بێتاقەت بکەین و ببینە کۆسپ لە بەردەم بەهرە و توانایدا. پشت بە خوا ببەستە! من دەزانم، یەحیا بەم زووانە دەگەڕێتەوە، بەڵام بەو جۆرەی خۆی دەیەوێت."





دایکی یەحیا توند دەسرەکەی کوڕەکەی لە دەستیدا گوشی. شتێک لەناو دەسرەکەدا بوو. دەسرەکەی کردەوە. ئاوێنەیەکی بچکۆلەی تیا بوو، کە چوارچێوەکەی قەڵەمکاریی لەسەر کرابوو. ئاوێنەکەی ماچ کرد و سەیرێکی حەبەشی کرد و وتی، "باشە، با وا بێت. مادام ئەو ئەمەی دەوێت، منیش دان بە خۆمدا دەگرم، ئەم ئاوێنەیەی بۆ هەڵدەگرم تا دێتەوە. ئەوسا ژنی بۆ دێنم و ئەمە دەدەم بە بووکەکەم."

قوڵپی گریان گەرووی حەبەشی گرتبوو. بێئۆقرەییی هاوسەرەکەی، لە دڵتەنگییەکەی خۆی زیاتر ئازاری دەدا. بریا بۆ شادکردنی، شتێکی لە توانادا بووایە. دەستی برد بۆ دەموچاوی و بەدزییەوە ئەو فرمێسکەی سڕی، کە بەسەر ڕوومەتیدا خلۆر بووبۆوە.

"دان بە خۆماندا دەگرین، پشت بە خوا."

## هەینی لە قوتابخانە

ژوورێکی چۆڵ و پاکە
مەوداکانی چەند سادەن بۆ بیرکردنەوە
دڵم زۆر تەنگە
نیازیشم نییە بخەوم

بەیانیی ڕۆژی هەینی بوو. کەس لە حەوشەی قوتابخانەکەدا نەدەبینرا. قوتابخانەکە چۆڵ بوو. مەحموود کاشی هاتبوو بەدوای یەحیادا، تا پێکەوە پیاسەیەکی ناوشار بکەن. بەڵام یەحیا لە حوجرەکە نەبوو، لە هۆڵی مزگەوتەکەوە، دەنگێکی هاتە گوێ. وەختێ چووە ژوورەوە، سەیری کرد لەگەڵ داوودا سەرگەرمی وانە و گفتوگۆن. سڵاوێکی کرد و بە سەرسووڕمانەوە لە یەحیای پرسی، "خەریکی چیت؟ ئەی ئەمڕۆ هەینی نییە؟"

"با، هەینییە. بەڵام دوێنێ شەو لەگەڵ داوودا بڕیارمان دا، لەمەودوا ڕۆژانی هەینی پێکەوە خەریکی وانەخوێندن ببین و هەر کێشە و گرفتێکمان هاتە ڕێ، لە مامۆستا بپرسین. داوود بەشێک لە وتارەکانی ئەبولحەسەنی ئەشعەریی بە ئەمانەت لە خاڵی وەر گرتووە، تا پێکەوە بیخوێنینەوە. *ئەلکامیلی* موبەڕیدیش لای قازی عەبدولمەجید دەخوێنین. هەڵبەتە کتێبەکە هەموویمان نییە. من چەند لاپەڕەیەکیم لە

سوهرەوەردەوە لەگەڵ خۆمدا هێناوە.“

”هەینی ڕۆژی پشوودانە. ڕۆژانی هەینی پشوو بدە، قورئان بخوێنەرەوە، خۆشتن و پیاسەکردن!“

”من ماڵ و کەسوکارەکەم بۆ ئەوە جێ نەهێشتووە، تا لێرە پشوو بدەم و پیاسە بکەم. دەرفەتەکەم لەدەست دەچێت. تەمەن کورتە و زانستەکانیش زۆرن! نابێ دەرفەت لەدەستی خۆم بدەم.“

”تۆ ڕاست دەکەیت. باشە حەز دەکەیت پێکەوە بچین بۆ لای زەهیرولدینی فارسی، مامۆستای گەورەی ئەم شارە و داوای لێ بکەین وانەی مەنتیقمان پێ بڵێتەوە. ئەم لەم بوارەدا کەس شان لە شانی نادات.“

”پێم خۆشە. من شتێکم دەربارەی مەنتیق خوێندووە، بەڵام هەمووی پەرشوبڵاو و سەرزارەکییە. مامۆستاکەم، خواجە عەبدولڕەحمان بوو. بەڵام ئەو زیاتر ئەدیب و مەلا بوو. شتێکی ئەوتۆی سەبارەت بە مەنتیق و فەلسەفە نەدەزانی. ئەو دەیوت، لەبەر ئەوەی غەزالی فەلسەفەی حەرام کرد، ئیتر ئێمە وانەی مەنتیقمان نەدەخوێند.“

”بەڵێ، لێرەش مەنتیق و فەلسەفە قەدەغەیە، گەرچی بەم دواییە وتیان زەهیرولدین مۆڵەتی پێ دراوە، کە وانەی مەنتیق بە کەسانی باش و لێهاتوو و ئیماندار بڵێتەوە، بەڵام ڕێگە نادەن بە شێوەیەکی بەربڵاو تەشەنە بکات.“

”بەڵام من لەگەڵ ئەو بۆچوونەی غەزالیدا نیم!“

”بۆچی؟“

”چونکە ئەوەی لە شەریعەتدا هاتووە و زاناکانی کۆن وتوویانە، ئەو زانیارییانەن، کە لە بەردەستماندان و بێ هیچ





خۆماندووکردن و تەقەللایەکی نوێ، خراونەتە بەردەستی ئێمە. ئەی کەواتە ئەرکی ئێمە و ئەوانەی دوای ئێمە، لە خزمەتکردن بە زانستەکانی مرۆڤدا، چییە؟ ئەگەر بواری زانستە ئەقڵییەکان قەدەغە و حەرام بکرێن، کەواتە کاری زانایان، جگە لە هەڵگرتنی کتێبە کۆنەکانی پێشینان، چی دەبێت؟“

مەحموود بەپەلە وتی، ”یەحیا، من دەڕۆم، تۆ خەریکی کاری خۆت بە.“

”بە سەلامەت.“

”کاتی نوێژ یەکتر دەبینین. نیوەڕۆ پێکەوە نان دەخۆین. من خواردن ئامادە دەکەم.“

”بەڵام من بەڕۆژووم. نەزرم کردبوو، کە ئەگەر بە ساغ و سەلامەتی بگەمە ئەسفەهان، تا مانگی ڕەمەزان هەموو هەینییەک بەڕۆژوو ببم.“

مەحموود ڕۆیشت و یەحیا لەگەڵ داووددا سەرگەرمی خوێندن و وتووێژ بۆوە. بەشی چوار وانەیان خوێند و ڕووبەڕووی هیچ گرفتێک نەبوونەوە. دەمەونیوەڕۆ بوو، داوود وتی، ”ئیتر ئەمڕۆ بەسە. ئەوی تری بۆ هەینیی داهاتوو هەڵدەگرین.“

بە دڵێکی پڕ لە ڕازیبوون و چێژی متمانەبەخۆبوونەوە، چوونە دەرەوە، تا خۆیان بۆ نوێژ ئامادە بکەن. داوود ڕۆیشت، تا سەرێک لە ماڵەوە بداتەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو، مەحموود پەیدا بۆوە. لەوە دەچوو نیگەرانی هاوڕێ تازەکەی بێت.

”سڵاو، کەی تەواو بوون؟“

”ئێستا، داوود ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە.“

”هیچتان خوێند؟“

”بەشی چوار وانە.“

”ئەی تووشی هیچ شتێکی قورس نەبوون؟“

”نەخێر.“

”زۆر چاکە. ماشەڵڵا هەردووکتان زیرەک و خوێنەوارن. بەڕاست، یەحیا زانیت بۆچی پێشنیوەڕۆ من بەپەلە لێت جیا بوومەوە؟“

”نەخێر! وتم لەوانەیە کارت هەبووبێت و بۆ شوێنێک چووبێت.“

”نەخێر! بۆ ئەوە بوو، تا تۆ هەندێ قسە نەکەیت.“

”بۆچی؟“

”لەبەر ئەوەی خەریک بوویت قسەی خەتەرناکت دەکرد. ئەو قسانەی تۆ، سەری بنیادەم بە فەتارەت دەدەن.“

”تێناگەم! مەبەستت چییە؟ بۆ من چیم وتووە؟“

”سەیر بکە، یەحیا! من و تۆ هەردووکمان لەم شارەدا غەریب و بێپشتوپەناین. دەبێ ئاگامان لە خۆمان بێت. یەک-دوو مانگ لەمەوبەر، قوتابییەکی لاوی هاوتەمەنی ئێمە لە مامۆستاکەی پرسیبوو، ئایا ئەویش دەتوانێ ببێت بە زانایەکی وەها، کە بچێتە ئاستی ئیمامی شافیعی و حەزرەتی ئەبو حەنیفەوە؟ مامۆستاکە بە توورەییەوە پێی وتبوو، نەخێر! ئەویش لەژێر لێوەوە وتبووی، کەواتە خۆشی لە ئیمامی شافیعی، کە هیچکەس ناتوانێ بچێتە ئاستیەوە. تەنها لەبەر ئەو قسەیە، ئەویان لە قوتابخانە دەر کرد. دەیانوت شەیتان چووەتە بن کلێشەیەوە و لە داهاتوودا دەبێتە سەرچاوەی





مەترسی بۆ سەر ئیسلام. ئیتر لەوە بەدوا، نەیانهێشت خوێندنەکەی تەواو بکات.“

”بەڵام من قسەیەکی خراپم نەکردووە، چیم وتووە؟“

”بیرت چووەتەوە چیت وت؟“

”بیرم نەچۆتەوە، بەڵام تێناگەم خەتەرناکییەکەی لەکوێدایە!“

”ئەی تۆ نەتوت ئەوەی لە شەریعەتدا هاتووە و زانایانی کۆن وتوویانە، سوننەتێکە و بەمیراتی بۆ ئێمە ماوەتەوە. کەواتە ئەرکی ئێمە لەم نێوەدا چییە؟ ئەی تۆ نەتوت ئەگەر دەرگای بواری زانستە ئەقڵییەکان دابخەن و تەنها کارمان نەقڵکردن بێت، ئەوا ئیشی ئێمە بەتەنها بریتی دەبێت لە هەڵگرتنی کتێبە کۆنەکان؟“

”بەڵێ، بەڵام خەتەرناکییەکەی ئەمە لەکوێدایە؟ ئەم قسانە بۆ خەتەرناکن؟“

”یەحیا، بۆ تێناگەیت؟ ئەگەر هیچ شتێک لەم قسانەی تۆدا نەبن، ئەوا گوستاخییەکیان تیایە بەرامبەر بە زانایان. تۆ زانایانی ئایینی بە حەماڵی کتێبی کۆن لە قەڵەم دەدەیت. تۆ دەزانیت چی دەڵێیت؟ ئەمە ئەو دەربڕینەیە، کە لە قورئاندا هاتووە بۆ وەسفکردنی زانایانی جوولەکە. لەبەر ئەوەی ئەوان کار بە تەورات ناکەن، قورئان ئەوانی بە گوێدرێژێک شوبهاندووە، کە بارەکەی پشتی کتێبە. تۆش بەم دەربڕینە، سووکایەتی بە زانایانی ئایینی دەکەیت، ئەی وا نییە؟“

”نەخێر! من سووکایەتی ناکەم. من ناڵێم ئەوان وەهان، دەڵێم ئەگەر وای لێ بێت، ئەوان نەهێڵن کەسێک بخوێنێت و ببێتە خاوەن بیرێکی نوێ، وایان لێ دێت، کە وتم.“

"باشە، بەڵام ئەوان بەرگەی ئەمە ناگرن و دەڵێن مناڵێک پێمان دەڵێت، ئێوە هیچ نازانن و من دەیزانم."
"باشە ئەگەر بڵێم ئەوان لە بوارێکی تایبەتدا ئەوەندەی من نازانن، ئەم قسەیەم کفرە؟"
"نەخێر، ئەم قسەیە خۆی لە خۆیدا کفر نییە، بەڵام ئەنجامەکەی بە کفر دەشکێتەوە."
"یانی چی؟"
"یانی ئەوەی دەڵێن ئەگەر ئەمڕۆ کەسێک بە ڕووی ئێمەدا هەڵشاخێتەوە، لەوانەیە سبەینێ بە ڕووی پێغەمبەر و خواشدا هەڵشاخێتەوە."
"باشە، ئەمانە لەمڕۆ دەترسن، یان لە سبەینێ؟"
"بێگومان لە سبەینێ."
"بەڵام بە بۆچوونی من، زیاتر نیگەرانی ئەمڕۆن. واتە زیاتر شین بۆ خۆیان دەکەن، نەک بۆ خوا و پێغەمبەر. بەڵام من بۆ ئەو ڕێنماییەت، سوپاسگوزارم. لاپرەسەنی سوودێکی نییە. من چ کارم بەمانەیە. هاتووم فێری دوو شت ببم. سوپاس بۆ ڕێنماییەکەت."

دەنگی ئەو بانگەی لە منارەی مزگەوتەکەوە بەرز بۆوە، کۆتایی بە گفتوگۆکەی ئەم دووانە هێنا. چەند کۆترێک بەدەوری منارەکەدا دەسووڕانەوە. کۆترێکی سپی تەقلەیەکی دا و بەرەو زەوی هات، پاشان دووبارە بەرەو ژوور لە شەقەی باڵی دایەوە. یەحیا بەئارامی لەبەر خۆیەوە وتی، "اللهم رب هذه الدعوة التامة و الصلاة القائمة..."



# ئیدی ناپرسم

هەرکەسە هاوارێ ئەکا
ئەم ئەڵێ: مەڕوانە
ئەو ئەڵێ: مەپرسە

زەهیرولدینی فارسی، پیاوێکی کەتە بوو، بە هەیبەت و سەنگینییەکی زانایانەوە! ناوەندی وانەوتنەوەکانی، تا بڵێی بەرەونەق بوو. زەهیر، یەحیا و هاوڕێکەی بە قوتابی وەر گرت، بەڵام پێی وتن، "وانەی مەنتیق دوو مانگە دەستی پێ کردووە و سێ مانگی تر تەواو دەبێت. بەو پرسیارانەی لێم کردن، هەردووکتانم باش تاقی کردەوە. سوپاس بۆ خوا، هەردووکتان بەنەزاکەت و باوەڕدارن. بۆیە دەتوانن لەو شوێنەوە دەست پێ بکەن، کە پێی گەیشتووین، بەڵام ئەگەر چاوەڕێش دەکەن تا سێ مانگی تر، ئەوسا لە سەرەتاوە دەست پێ دەکەینەوە و ڕەنگە بۆ ئێوەش باشتر بێت."
یەحیا لە ئاست ئەم میهرەبانییەی مامۆستادا وتی، "فەرمان، فەرمانی ئێوەیە. بە قسەی جەنابتان دەکەین."
"بەڵێ! من وای بە چاک دەزانم، سێ مانگێکی تر سەبر بکەن و لە سەرەتاوە دەست بە وانەکە بکەین، بەڵام ئێوە لەم ماوەیەدا دەبێ دوو شت بکەن. یەکەمیان ئەوەیە، کە لەو وانەی تەفسیرەدا بەشدار ببن، کە لە ڕۆژی شەممەوە دەیڵێمەوە،

دووەمیشیان ئەوەیە، کە نوسخەیەکم لە کتێبی *ئەلبەسائیری* سەهلان ساوی لەلایە، ئەم کتێبە ئەو نوسخەیە نییە کە دەیڵێمەوە، کەمێک شێواوە و خەتەکەی ناخۆشە. دەتاندەمێ، لەم ماوەیەی لە بەردەمتاندایە نوسخەی لەبەر بنووسنەوە بۆ خۆتان. ئەگەر هەندێ وشەیتان لێ عاسی بوو، شوێنەکەی بە بەتاڵی جێ بهێڵن و نیگەران نەبن. لە کاتی وانەکاندا چاکی بکەن. من دەبێ بڕۆم، ئیشم هەیە. ئێوەش بڕۆن. سبەینێ کەمێک زووتر وەرن بۆماڵەوە، تا ئەو نوسخەیەتان بدەمێ."

یەحیا و داوود کەوتنە ڕێ. خەریک بوو لە خۆشیاندا باڵیان دەگرت. چ شانازییەکە مێردمنداڵێکی غەریب، لە شارێکی گەورەدا بتوانێ ئامادەی وانەکانی مامۆستایەکی بەناوبانگی وەکوو زەهیرولدینی فارسی بێت.

دوای ئەوەی لە داوود جیا بۆوە، سەرێکی لە حوجرەکەی خواجە موختار دا. هەندێ کاغەزی کڕی و هەواڵی ئەوەشی پێ وترا، کە ماوەیەکی تر خواجە بوبەکری سوهرەوەردی دێت بۆ ئەسفەهان. هەواڵەکە خۆشحاڵی کرد. هەواکەی پاییز کەمێک کزر و سارد بووبوو. لە حەوشی مزگەوتەکە، هاوڕێکانی باسی خەڵووز و کەلوپەلی زستانییان دەکرد. کورسیی* بچووک و مقەڵی و خەڵووز!

یەحیاش بیری لە مشوورخواردنی زستان کردەوە.

وانەکانی زەهیر، وانەی ئاسایی نەبوون. ژمارەیەکی زۆری قوتابی بەشدارییان تیا دەکرد. لە هۆڵی مزگەوتەکەدا، لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر، قوتابی دادەنیشتن. بەزەحمەت جێیەکی

* کورسی: جۆرە ئامرازێکە، لە ئێراندا بۆ خۆگەرمکردنەوە بەکار دەهێنرێت.





بۆ خۆی پەیدا کرد. زەهیرولدینی فارسی مامۆستایەکی لێهاتوو بوو و لە شیکردنەوەی خاڵە ئاڵۆزەکان و ڕاڤەکردنی بابەتە دژوارەکاندا، گەلێ بەتوانا بوو. لە لێکدانەوەی بسم اللەوە دەستی پێ کرد. سەبارەت بە "ب"ی بسم اللە، کە حەرفی جەڕە، کۆمەڵێک شتی باس کرد و ئینجا دەستی بە لێکدانەوەی وشەی "اللە" و "رحمن" و "رحیم" کرد و وتی، "ڕەحمەت شتێکی گشتییە و پەیوەستە بەم دونیایەوە و باوەڕدار و بێباوەڕیش دەگرێتەوە. بەڵام ڕەحیم تایبەتە بە باوەڕداران لە ڕۆژی جەزادا."

یەحیا دەستی هەڵبڕی، تا مامۆستا مۆڵەتی قسەکردنی بداتێ.

زەهیر وتی، "بڵێ!"

"گەورەم، ئەو ڕەحمەتەی لە سیفەتی ڕەحماندایە بەهێزترە، یان ڕەحمەتی ئەلڕەحیم؟"

زەهیرولدین، وەک ئەوەی بۆ یەکەمین جار بێت ڕووبەڕووی پرسیارێکی لەم جۆرە ببێتەوە، هەڵوەستەیەکی کرد، بەڵام شتێکی وای بە بیردا نەهات، بۆیە پەنای بردە بەر *قیاس** و لەسەر بنەمای مانای گشتی و تایبەتی وتی، "هەڵبەتە ڕەحمەتی ئەلڕەحمان بەهێزترە، چونکە گشتییە."

"ئەگەر وا بێت، دەبێ ڕەحمەتی ئەلڕەحمان لە توانایدا بێت ڕەحمەتی ئەلڕەحیمیش بە گشتی بکات؟"

"یانی چی؟ تێناگەم. لەو بڕوایەدا نیم کەسیش تێبگات. دەتوانیت پرسیارەکەت ڕوونتر بکەیتەوە؟"

"مامۆستا، ئاخر کاتی ئێوە دەڕوات، نامەوێ سەغڵەتتان

* قیاس ڕێسایەکە لە مەنتیقدا پەیڕەوی دەکرێ، بریتییە لە پراکتیزەکردنی ڕێسای گشتی بەسەر بەشەکاندا.

بکەم."

"نا، بڵێ، بڵێ بزانم دەتەوێ بڵێیت چی؟"

"گەورەم، ڕەحمەتی ئەلڕەحمان گشتییە، یانی چی؟"

"ئاشکرایە! واتە خوداوەند لەم دونیایەدا ڕزق و بژێوی هەم بە باوەڕدار و هەم بە بێباوەڕیش دەدات. ئەگەر بەشی بێباوەڕان زیاتر نەبێت، کەمتر نییە! "مامۆستا زەردەیەکی دێتێ و قوتابییەکانیش پێدەکەنن."

"گەورەم، ئایا نان و جلوبەرگ بەنرخترن یان دەرککردن و زانین و سرووش و هیدایەت؟"

"بێگومان زانین و هیدایەت لە نان و جلوبەرگ بەنرخترن. کەس سامان وماڵی دنیا، با زۆریش بێت، بە پەسەندتر نازانێ لە هەبوونی چاو و گوێ و ئاوەز و هۆش."

"کەواتە، بەم پێیە بێت، دەبێ ڕەحمەتی ئەلڕەحمان، کە گشتییە، هیچ مرۆڤێک، تەنانەت بێباوەڕەکانیش، لە ڕزقی سرووش و هیدایەت و دەرککردن و زانین بێبەش نەکات."

"بێگومان، بێگومان."

"باشە، کەواتە ئەگەر بێباوەڕانیش لە بەخششی زانین و هیدایەت بەهرەمەند بن، بەختەوەریی ئاخیرەتیش بەدەست دەهێنن و لە ئەنجامدا ڕەحمەتی ڕەحیمیش هەمووان دەگرێتەوە."

"واتە تۆ مەبەستت ئەوەیە، کە هەموو ڕزگار دەبن و کەس ناچێت بۆ دۆزەخ؟"

یەحیا سەرنجی دا مامۆستا خەریکە تووڕە دەبێت، بۆیە چیی تر درێژەی بە گفتوگۆکە نەدا و بە زیرەکییەوە وتی، "گەورەم، ئەگەر بمزانیایە، پرسیارم نەدەکرد. هەر ویستم





بۆچوونی ئێوە بزانم و لە مەسەلەکە تێبگەم."

"باشە، وازی لێ بێنە. وا چاکترە کاتەکە بەفیڕۆ نەدەین. هەوڵ بدە سەرقاڵی ئەو گرفتانە بیت، کە پەیوەندییان بە وانەکەوە هەیە و ئەگەر پەیوەست نەبوو بە وانەکەوە، ئەوا هەڵی بگرە بۆ کۆتایی."

کاتێ وانەکە تەواو بوو، مامۆستا یەکێک لە قوتابییە کۆنەکانی خۆی بانگ کرد، کە ناوی شێخ ئەحمەد بوو و پێی وت، "من پەلەمە، دەبێ بڕۆم. ئەم کوڕە، یەحیا، قوتابییەکی بەهرەمەندە. تۆ لەگەڵیدا قسە بکە و بزانە گرفتەکەی چییە. هەوڵ بدە بابەتەکەی باش تێبگەیەنیت."

ئەوەی وت و ڕۆیشت.

شێخ ئەحمەد، کە قوتابییەکی کۆنی زەهیرولدین بوو و پتر لە دە ساڵ بوو لای ئەو دەیخوێند، دەستی یەحیای گرت و لە کاتێکدا لە هۆڵی مزگەوتەکە دەچوونە دەرێ، وتی، "چەند دەقیقەیەک لە حوجرەکەی من دادەنیشین و دەربارەی ئەو مەسەلەیە قسە دەکەین."

یەحیا، کە لە ڕووی تەمەن و فێربوونەوە ئەوی لە خۆی بە پێشتر دەزانی، بە ڕێزەوە وتی، "ئەگەر ئەو میهرەبانی و گەورەییە بەرامبەر بە من بکەیت، سوپاسگوزار دەبم."

شێخ ئەحمەد، تا ئەو ڕۆژە یەحیای نەدیبوو و تا گەیشتنە حوجرەکە، هەندێ شتی لەو پرسی! بۆ نموونە، پرسیاری ئەوەی خەڵکی کوێیە؟ لەکوێوە هاتووە؟ لەکوێ نیشتەجێیە و کێ خەرجیی بۆ دابین دەکات؟

حوجرەیەکی تەنگ و تاریک. هەموو کەلوپەلی حوجرەکە، بریتی بوو لە فەرشێکی حەسیر و هەندێ قاپ و قاچاخ و چەند

کتێبێک. کاتێ لەسەر حەسیرەکەی سەر ئەرزەکە دانیشتن، شێخ ئەحمەد وتی، ”گوێ بگرە، یەحیا! من نامەوێ مشتومڕت لەگەڵدا بکەم، لەبەر ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانت نازانم. لە ڕاستیدا هەر ئاگاشم لە پرسیارەکەت نەبوو. مامۆستاش کە وەڵامی نەدایتەوە، لەبەر ئەوە نەبوو وەڵامەکە نازانێت، بەڵکوو وا هەست دەکەم پرسیارەکەتی پێ خۆش نەبوو. یەحیا، تۆ دەبێ ئەوە بزانیت، کە پرسیارکردن شتێکی خەتەرناکە. هەتا دەتوانیت، گوێ بگرە، قسە مەکە! من کە ئەو هەموو ڕێزەم لێ دەگرێت، هیی ئەوەیە تا ئێستا یەک پرسیار چییە، لێم نەکردووە. هەر گوێم بۆ شل کردووە و وتوومە بەڵێ.“

یەحیا بە تێفکرینەوە وتی، ”باشە، ئەگەر مامۆستا لێی پرسیم وەڵامەکەت دەست کەوت یان نا، چیی پێ بڵێم؟“

”لێت ناپرسێت. هەرگیز سەر ناکاتە سەرمان. یەحیا، ئامۆژگاریت دەکەم، ئەگەر دەتەوێ ڕێزت لێ بگرن، ئەگەر دەتەوێ بەئارامی بژیت، کەم قسە بکە. پرسیار مەکە، تا دەم بوەستێ، سەر سەلامەتە. هیچی ترم نییە پێتی بڵێم.“

یەحیا لە حوجرەکەی شێخ ئەحمەد هاتە دەرێ. لە بیرکردنەوەدا نوقم بووبوو و لەبەر خۆیەوە دەیوت، ”سەیرە! چۆن دەبێ مرۆڤ پرسیار نەکات! پرسیارکردن ڕۆحی مێشکی مرۆڤە. من کە ئەم هەموو ڕێیەم بڕیوە و بۆ ئێرە هاتووم، لەپێناوی ئەوەدا بووە، کەسێک بدۆزمەوە و پرسیاری لێ بکەم. ئەگەر جەسارەت و توانای پرسیارکردن لە من بسەننەوە، دڵنیام هیچم پێ نابەخشن. باشە، هەوڵ دەدەم بیر نەکەمەوە و پرسیار نەکەم، ئەگەر بتوانم! ئیتر ناپرسم و خواش دەزانێ.“



# نامەیەکی تر

لەو شەوەڕا وادەی ویساڵت پێ داوم
من هەر ڕۆژ و شەو ئەژمێرم، ڕۆژ و شەو

”تا ئێستا لەکوێ بوویت؟ کاشکی کەمێک زووتر دەگەیشتیتەوە! کابرایەک هەواڵی دەپرسیت. زۆر چاوەڕێشی کردیت. دەیوت بازرگانە و لە سوهرەوەردەوە هاتووە و لە عەسرەوە لە کاروانسەرای ئەمیر چاوەڕێتە.“

یەحیا، کە تازە گەیشتبۆوە، ڕووی کردە حسەین، کە قوتابییەکی لاو بوو و وتی، ”کەی ڕۆیشت؟ ئەی هیچ ڕاسپاردەیەکی بۆ من پێ نەبوو؟“

”نەخێر، بەڵام وتی هەر دەبێ بتبینێت.“

یەحیا بەپەلە و بەبێ ئەوەی پێڵاوەکەی دابکەنێت، لەسەر ئەژنۆ چووە ناو حوجرەکە، کتێبەکانی لە سووچێکدا دانا و خێرا بەرەو کاروانسەرای ئەمیر کەوتە ڕێ.

لە کاروانسەرا ژاوەژاوێک بوو، مەپرسە. کاروانێک تازە گەیشتبووە جێ و کۆڵهەڵگرەکان دەوریان دابوو. یەحیا خۆی کرد بە سەرسەرای کاروانسەراکەدا، بەدوای خواجە بوبەکردا دەگەڕا. کاتێ چاوی پێی کەوت، سەیری کرد خواجە سەرگەرمی قسەکردنە. یەحیا لێی نزیک بۆوە و بە نەزاکەتەوە لەلایەوە وەستا. خواجە ئاوڕی دایەوە و وەختێ

چاوی بە یەحیا کەوت، قسەکانی بڕی و هەردوو باسکی کردنەوە و وتی، ”ماشەڵڵا، لەم پیاوە گەورەیە! بریا دایک و باوکیشت وەکوو من چاویان بە جوانیت ڕۆشن دەبۆوە. دەبینم کەیفت هەیە و ڕەنگوڕووت باشە.“

یەحیا بە شەرمەوە سڵاوێکی کرد و سەری دانەواند.

”سوپاس بۆ خوا باشم، خواجە بوبەکر. هەواڵی لای خۆمان چییە؟ دایک و باوکم چۆنن؟“

”هەواڵ باشە. هەموو سەلامەتن. نامەشم پێیە بۆتان. هەروەها بڕێک پارەش، کە دەیدەم بە خواجە موختار. دایکیشت شتێک ئازووقەی بۆ ناردوویت. ئەگەر دەتوانیت، بیبە. ئەگەر ناشتوانیت، دوایی خۆم بۆت دەهێنم.“

یەحیا سوپاسی کرد و بەدوای خواجەدا بەرەو حوجرەکەی ئەو چوون. کاروانسەرای ئەمیر، بەناوبانگترین کاروانسەرای ئەسفەهان بوو. بازرگانە جێباوەڕەکان هەموو لەوێ باریان دەخست. داڵان و حوجرەی زۆری هەبوو و هەرکەسە بە گوێرەی پلەوپایە و توانای خۆی، یەکێکیانی گرتبوو. دیمەنی حوجرەکەی خواجە بوبەکر، نیشانەی پایەی زۆری ئەو بوو لای خاوەن کاروانسەراکە.

”وەرە ژوورەوە با پێیان بڵێم چاییەک، شتێکمان بۆ بهێنن.“

”نەخێر، سوپاست دەکەم. ئەگەر ڕێگەم بدەن، دەبێ زوو بڕۆم. دەبێ بچم خۆم بۆ وانەکانی سبەینێ ئامادە بکەم.“

”باشە، زۆرت لێ ناکەم. ئەمە نامەکە و ئەمەش شتەکانی ترت.“

”زۆر سوپاس بۆ ئەو هەموو میهرەبانییەت، خواجە بوبەکر. سبەینێ بەیانی زوو وەڵامی نامەکە دەهێنمەوە، تا





بە ئەرک نەبێت، بیگەیەنیتەوە بە دایک و باوکم. ئێستاش بە ئیزنی ئێوە.“

”خوات لەگەڵ، کوڕم.“

یەحیا لە خۆشیاندا شاگەشکە بووبوو. شەوقی خوێندنەوەی نامەکە و ئاگاداربوونی لە حاڵ و ئەحواڵی دایک و باوکی و سوهرەوەرد، هێنابوویە جۆش.

بەهەڵەداوان گەڕایەوە بۆ حوجرەکەی و بێ ئەوەی پشتێن و کڵاوەکەی لە خۆی بکاتەوە، دەستی بە خوێندنەوەی نامەکە کرد. هەموو شتەکان ئاسایی بوون. دایک و باوکی سەلامەت بوون و هەر چاولەڕێی ئەمن.

لە سوهرەوەرد هەواڵێکی وەها نییە، کە جێبایەخی ئەم بێت. باوکی داوای لێ کردبوو، کە تا بەهاری داهاتوو، هەر دەبێ سەرێک لە سوهرەوەرد بداتەوە و ماوەیەک لەوێ بمێنێتەوە. دەیزانی ئەوان چەند تینووی گەڕانەوەین. حەزی دەکرد ئەو داوایەیان بهێنێتە دی، بەڵام مەگەر دەتوانێ واز لە خوێندن و وانەکانی بێنێت؟ هەردوو چاوی نووقاند و بۆ جارێکی دیکە نامەکەی لە مێشکیدا شەنوکەو کرد و دێڕەکانی هێنایەوە بەرچاوی خۆی، ”لەو کاتەوەی نامەکەت و دیارییەکەت گەیشتووە، دایکت ئارامترە و ئاوێنەکەی بۆ بووکەکەی هەڵگرتووە.“ زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوی یەحیا. بریا دەیتوانی کوڕێکی ئاسایی بێت و ئارەزووەکانی دایکی بهێنایەتە دی، ژن بهێنێت و نەوەی جوان و ژیکەڵەی بۆ بخاتەوە. چاوی کردەوە، کاتەکە دەڕۆیی. هەڵسا و نامەکەی خستە ژێر قورئانەکەی سەر ڕەفەکە و خەریکی ئەرکەکانی قوتابخانەی بوو.

خواجە بوبەکر، دوای دوو ڕۆژ، بەرەو سوهرەوەرد کەوتەوە ڕێ. کاتێ گەیشتەوە سوهرەوەرد و نامەکەی یەحیای گەیاند، دایک و باوکی بە بینینی نامەکە، هێورتر بوونەوە. نامەکەی یەحیا ئومێدێکی پێ بەخشیبوون، بەتایبەتییش ئەوەی گفتی دابوو لە بەهاردا بگەڕێتەوە بۆ سوهرەوەرد. پێشکەوتنی یەحیا لە وانەکانیدا و بایەخدانی مامۆستاکانی پێی، بووە مایەی خۆشحاڵیی حەبەش. بەڵام دایکی لە خەیاڵێکی تردا نوقم بووبوو، تەدارەکی نیشانکردنی خوشکەزاکەی بۆ یەحیا؛ ئەم باسەی لەگەڵ حەبەشدا کردەوە. حەبەش کە هەوڵی دا بە پێچەوانەی حەز و خواستی ئەوەوە قسە نەکات، بەئارامی وتی، "هەموو باوکێک حەز دەکات کوڕەکەی ژن بهێنێت، بەڵام تۆ لەو بڕوایەدا نیت، کە ئێمە لەپێناوی حەزی خۆماندا ڕێ لە پێشکەوتنی یەحیا دەگرین؟ یان ئاخۆ یەحیا خۆی حەز بەمە دەکات؟"

"یەحیا بە ئەندازەی پێویست خوێندوویەتی. ئێستاش گەر بێتەوە، کەس لە سوهرەوەردا نییە ئەوەندەی ئەو خوێندەوار بێت. دەتوانێ لێرە ببێت بە باشترین واعیز."

"نازانم، با بزانین چۆن دەبێت."



## بۆ هەموو شوێنێك دەچم، ئەمما...

ڕووم کردە هەر ئاقارێ
جگە لە ترس و تەنیایی
هیچم نەبووە نسیب جارێ

تاعوون سەرتاسەری ناوچەکەی گرتبۆوە و هەموو دادوبێدادیان بوو بە دەستیەوە. خواجە بەکر هەموو ڕۆژێک سەفەرەکەی دوا دەخست و ئەمڕۆ نا سبەینێی دەکرد. نیگەرانیی بەرەڵلاکردنی خێزانەکەی بووبووە لەمپەر لە بەردەمیدا. خوا منالّی زۆری لە سێ ژنەکەی پێ بەخشیبوو، بەڵام زۆربەیان بە نەخۆشییە باوەکانی ئەو ڕۆژگارە مردبوون و ئەمەش وای کردبوو، خواجە بوبەکر قەدری ئەو دوو کوڕەی زۆر لەلا بێت، کە بۆی مابوونەوە و ڕزگارکردنیانی بەلاوە لە هەموو شتێکی تر گرنگتر بوو. ئەو ڕۆژەی کەوتە ڕێ، خەڵکەکە بە سەرزەنشتکردنەوە بەرێیان کرد، "خواجە، خێر لەم سەفەرە نابینیت."

"خواجە، ژن و کچەکانت بۆ کێ جێ دەهێڵیت؟ بیکە بە خاتری خوا، مەڕۆ."

خواجە بەبێ ئەوەی ئاوڕ لە خەڵکەکە بداتەوە، بەرەو ئەسفەهان ملی ڕێی گرتە بەر. مابوویان بگەنە ئەسفەهان، ئێوارەیان بەسەر هات. بۆیە بەناچاری لە لادێیەکی نزیک بەو

ناوە لایان دا. هێشتا بارەکانیان لەسەر ولاخەکان نەخستبوو، کە دز و جەردە دایان بەسەریاندا و هەرچییەکیان بەردەست کەوت، بە تالان بردیان. خواجە بوبەکر بە ترسێکی زۆرەوە بەدوای کوڕەکانیدا دەگەڕا. لەودیو تەیمانێکی نزمەوە و لای تەویلەیەکەوە، عەبدوڵلای دۆزییەوە، کە دەگریا، بەڵام هیچ ئاسەوارێکی ئیبراهیم نەبوو. خەمی بەتالانچوونی سەروەت و سامانەکەی لە لایەک و دیارنەمانی کوڕەکەشی لە لایەکی ترەوە، تەواو تین و بڕستی لێ بڕیبوو.

خزمەتکارەکانی ئەگەرچی بە خەمیەوە بوون، بەڵام بە ڕادەیەک چاو و گوێیان لەم ماجەرایانە پڕ بووبوو، کە هێندە دەربەست نەبوون و ڕزگاربوونیان لەو تالووکەیە، تاقە ئومێدیان بوو. عەبدوڵلا تای گرتبوو و خواجە بوبەکریش هیچی پێ نەدەکرا. بە هیوای دۆزینەوەی چارەیەک، لەگەڵ خواجە ڕەشیدولدینی هاوسەفەریدا چوونە لای کوێخا ئەحمەد، کە دەسەڵاتدار و ناسراوی لادێکە بوو.

"دەزانم، دەزانم! ئەمە یەکەم جار نییە لەم دەوروبەرە دز و جەردە بدەن بەسەر خەڵکدا. نەدەبووایە لێرە باروبنەتان بخستایە."

"باشە ئێستا چی بکەین؟ سکاڵا لای کێ بکەین؟"

"کەس هیچی پێ ناکرێ. ماڵێک تالان کرا، گەڕانەوەی بۆ نییە."

خواجە بوبەکر بە دڵساردی و نائومێدییەوە بەرەو لای کاروانەکە گەڕایەوە. هادیی کافرۆشیش بردی بۆ لای شێخی دێکە و دووعایەکی بۆ عەبدوڵلا کرد.

کاروانەکە کەوتەوە ڕێ. لە سوپایەکی شکستخواردوو





دەچوو، لە جەنگ گەڕابێتەوە. بوبەکر، کە ئەو ماوەیە لەبەر نەخۆشییەکەی عەبدوڵلا مابۆوە، دوای چاکبوونەوەی، هیچ چارەیەکی تری نەبوو، جگە لەوەی خۆی بگەیەنێتە ئەسفەهان. تازە کەوتبوونەوە جووڵە، کە بیری کەوتەوە ئەمانەتەکەی حەبەشیش، واتە نامە و دیارییەکانی، لەگەڵ شتەکانی تردا بەتالانی برابوون.

کاتێک خۆر سەری دەر کرد و شوانەکان ڕانەمەڕەکانیان بۆ لەوەڕ پێش خۆیان خست، ئەمان گەیشتنە ئەسفەهان. شارەکە هێشتا بێدار نەبووبۆوە. خواجە بوبەکر هەرگیز ئەم شارەی بەم چەشنە غەمگین و دڵتەنگ نەدیبوو! دەرگای کاروانسەراکە نیوەکراوە بوو و هێشتا جموجووڵی تێ نەکەوتبوو.

"ئای خوایە! خواجە بوبەکرە یا خەون دەبینم! سڵاو!"

موبارەک، کە پاسەوانی کاروانسەراکە بوو، چاوی بڕیبووە خواجە بوبەکر.

"چی ڕووی داوە، خواجە؟ ئەی باروبنەکەت کوا؟"

قوڵپی گریان گەرووی گرتبوو.

"سڵاو، موبارەک!"

موبارەک عەبدوڵلای بۆ ژوورەوە برد و خواجە بوبەکر بەرەو حوجرەکەی حاجی موختار ڕۆیشت. موختار خەریک بوو دەرگای حوجرەکەی دەکردەوە.

"سەفەری خێر بێت، خواجە. خۆش هاتیت. چۆنە بەم بەیانییە زووە هاتوویت؟ بێ ئەوەی هەواڵمان بدەیتێ؟ هیوادارم خێر بێت."

خواجە بوبەکر ئەوەی ڕووی دابوو، بۆی گێڕایەوە.

"دڵت بەهێز بێت. ماڵی دنیا چڵکی دەستە. خۆت و ماڵ و منداڵت سەلامەت بن."

"پشتم بە خوا بەستووە. هەر شوکرم. چی بکەم، چارم نییە. ئەرێ بەڕاست، هەواڵی یەحیا چییە؟"

"سوپاس بۆ خوا، باشە. جارجارە سەرم لێ دەدات و خەرجیی دەدەمێ. دوێنێ کە هات، تەواو نیگەران بوو. لە خەونیدا ڕێی سوهرەوەرد بە لاشەی مردوو گیرابوو! من دڵخۆشیم دایەوە. بەڵام ڕاستت دەوێت، من خۆیشم نیگەران بووم. ئادەی پێمان بڵێ خەبەر چییە؟"

خواجە بوبەکر، کە خەمی لەدەستدانی کوڕەکەی و سەروەت و سامانەکەی، تاعوون و بەڵاکەی سوهرەوەردی لەبیر بردبۆوە، بە بڕوانەکردنەوە چاوی بڕییە خواجە موختار و وتی، "بەڕاستتە؟ یەحیا وای وت؟ دەمزانی ئەم کوڕە بەهرەمەندە. خەونەکەی ڕاستە. من لە ترسی تاعوون سوهرەوەردم جێ هێشت. ویستم ڕۆحی کوڕەکانم ڕزگار بکەم. ئیبراهیمم لە دەستی تاعوون ڕزگار کرد و بە دەستی دزانم سپارد. شەرمەزاری یەحیاشم، دزەکان هەم نامەکە و هەم ئەو شتانەشیان دزیوە، کە حەبەشی باوکی بە مندا بۆی ناردبوون."

"تازە ئەوەی ڕۆی، ڕۆی، هیچ گوناهێکی تۆشی تیا نەبووە. یەحیاش لەوە تێدەگات. ئەو دوودڵ بوو لەوەدا، بگەڕێتەوە بۆ سوهرەوەرد یان نا. حەز بە مانەوە دەکات، بەڵام نیگەرانی دایک و باوکیشیەتی. بەڵام ئێستا ئاسوودەیە و دەتوانێ درێژە بە خوێندنەکەی بدات. تۆش هەڵسە، پێویستت بە حەسانەوەیە. ئەمشەو میوانی منیت. یەحیاش





ئاگادار دەکەمەوە."

"بەسەر چاو. بەڵام دەمویست، ئەگەر بکرێ، سبەینێ شکاتێک بکەم و سکاڵانامەیەک بگەیەنمە دەستی میر، بەڵکوو..."

"لێگەڕێ، برا، لێگەڕێ. سکاڵانامە سوودی نییە. ئەمانە ئەگەر خۆیان شەریکەدز نەبن، جەسارەت و بێشەرمیی دزان دەگاتە ئەم ڕادەیە؟"

دەمەوئێوارە، یەحیا لەگەڵ عەبدولحەکیمدا، کە مامۆستا و پێشنوێژی مزگەوتەکەش بوو، چوون بۆ ماڵی خواجە موختار. یەحیا بە بیستنی ئەو هەواڵە ناخۆشانە، هەرچیی خۆشی هەبوو لە دڵیدا بۆ بینینی خواجە بوبەکر، نەما و بە هەواڵی بڵاوبوونەوەی تاعوون لە سوهرەوەرددا، تەواو نیگەران بوو. دەیویست شتی زیاتر سەبارەت بە بارودۆخی سوهرەوەرد و دایک و باوکی بزانێت، بەڵام ئەو بەڵایەی بەسەر خواجە بوبەکردا هاتبوو، ڕێگر بوو لەوەی پرسیاری زیاتری لێ بکات. بەر لەوەی بڕوات، هەڵسا و چوو لەلای خواجە بوبەکرەوە دانیشت و وتی، "خواجە، گەرچی وانە و ئەرکەکانم زۆرن، بڕیارم دابوو بگەڕێمەوە بۆ سوهرەوەرد، بەڵام تازە ناچارم ماوەیەکی تریش سەبر بکەم. هەستیش دەکەم ئیتر خوێندن لە ئەسفەهان بەسە بۆ من و ئێرەش وەکوو سوهرەوەرد و مەراغە، وەڵامدەرەوەی پرسیارەکانم نییە و تینوویێتیم بۆ زانین ناشکێنێت."

"ئینشاڵڵا ئەوەی باشە، بۆت ببێت. من بەم زووانە دەگەڕێمەوە. ئەگەر شتێکت بۆ دایک و باوکت هەبوو، بیهێنە تا بۆیان ببەم."

یەحیا گەڕایەوە بۆ حوجرەکەی. بەدرێژاییی ئەو شەوە، لای پەنجەرەکەوە چاوی بڕییە ئاسمان. خەمێکی سەیر چنگی لە سنگی گیر کردبوو. بیری هەیوانە بچووکەکەی ماڵی خۆیانی دەکرد و ئەو ئەستێرانەی تا خەو دەچووە چاوی، لێیان ڕادەما. بەیانی، بەر لە هەرشتێک، نامەکەی نووسی. دەیزانی هیچ شتێک ئەوەندەی بەرەوپێشچوونی لە خوێندن و وانەکانیدا، دڵی باوکی خۆش ناکات. بۆیە لەو بارەیەوە بۆی نووسی و هەروەها ئەوەش کە چیی تر ئەسفەهان و زانا ئایینییەکانی شتێکیان بۆ ئەو پێ نەماوە و بەتەمایە بەم زووانە خۆی بپێچێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ سوهرەوەرد.

"... هەر کە وانەکانم تەواو بوون، هاوین دێمەوە. دەمەوێ قۆناغبەقۆناغیش بێمەوە، تا لە ڕێمدا سەردانی هەندێ زانا بکەم. وا نموونەیەکیش لە نووسینەکانم دەنێرم. ئەگەر حەزت کرد، دەتوانیت پیشانی عەبدولڕەحمانیان بدەیت. گەرچی شتێکی ئەوتۆ نین، بەڵام پێی خۆش دەبێت. سڵاوم بۆ هەمووان.

**یەحیا"**



# گەڕانەوە بۆ سوهرەوەرد

بە هەواڵی هاتنی تۆ، دەرگاکە کەوتە خۆبادان
لە ورینگەی تەقولبابت، ماڵەکەش بووە غەزەلخوان

تاعوون لەم شارەوە دەچوو بۆ ئەو شار و ژیانی ڕادەستی عەدەم دەکرد. نیگەرانی و ترس جێی جۆشوخرۆشی ژیانی گرتبۆوە. کەس بیری لە سبەینێ نەدەکردەوە! بەڵام لە سوهرەوەرد، دەتوت شتێکی تر لەگۆڕێیە. چلەی هاوین بوو و جووتیارەکان بە لەشی ئارەقاوییەوە خەریکی خەڵە و خەرمان بوون. لاوێک لە دوورەوە دەر کەوت، کەوا ڕەنگین و کڵاوەکەی، ئەوی لە لاوەکانی تری سوهرەوەرد جیا دەکردەوە. پێدەچوو قورسیی خورجینەکەی بووبێتە هۆی ئەوەی ڕووی گرژ دەر بکەوێ. نزیکتر بۆوە، "سڵاو، ماندوو نەبن!"

تێپەڕی. مقۆمقۆ کەوتە نێو جووتیارەکانەوە، "ئەوە خۆ یەحیایە، کوڕەکەی حەبەش!..."

"هاتۆتەوە بۆ سەردانی دایک و باوکی."

یەحیا، لە کاتێکدا گوێی لە مقۆمقۆکەیان بوو، هەنگاوەکانی خێراتر کرد.

گەیشتە شار. لە مەیدانێک تێپەڕی. لاوێک بەلایدا گوزەری کرد، ناسییەوە، بە مناڵی پێکەوە یارییان کردووە! بەڵام بۆچی نەوەستا؟...

***

"سەبر بکە! وا هاتم! دەرگاکەت لە گرێژنە دەر کرد!"

ئەوە دەنگی کاووس، خزمەتکارەکەی حەبەش بوو، کە تکای دەکرد کوڕەکە چاوەڕێ بکات، تا دەرگاکەی لێ دەکاتەوە. دەرگاکە کرایەوە و کوڕەکە بە پەشۆکاوییەوە باوەشی کرد بە کاووسدا!"

"چی بووە؟ بۆ وا دەکەیت؟"

"پیرۆز بێت! مژدە بدە بە خواجە حەبەش و خانم! مژدانەم دەوێت!"

"ئەرێ ئەی هاوار، تێکم مەدە، چی بووە؟"

"چی بووە! هەواڵ لەوە خۆشتر! یەحیا، یەحیا بەڕێوەیە بۆ ماڵەوە. خۆم بینیم."

کاووس ڕای کرد و لاوەکەش چوو لە دەرگای ماڵە دراوسێکانی دا! ژنەکە پەشۆکابوو و مێردیشی لەو پەشۆکاوتر. نەیدەزانی ئەوە خەونە یان ڕاستییە. ئەوە یەحیا بوو، کە تۆزێکی تر لەودیو کۆڵانەکەوە دەر دەکەوت. لە کۆڵانەکەدا هەلهەلەیان لێدەدا. ژن و پیاو، پیر و لاو، هەموو چاوەڕوان بوون. دەتوت شتێک لە ناخی زەوییەکەوە هەڵدەتۆقێت، یان پەردەیەک لا دەچێت و جوانترین شاکار دەر دەکەوێ. کوڕێژگەیەک لە دیوارۆکە گڵەکەی ماڵی خواجە سوهرابەوە هاواری کرد، "هات! ئەو لاوە مناڵە! جلەکانی لە هی ئەسفەهانییەکان دەچێت."

هەناسە لە سینەی ژن و مێردەکەدا توند بوو. دەتوت گوێیان لە دەنگە ئارامەکەی پێی یەحیایە؟ نەخێر! لاوێکە بە





ڕیش و سمێڵێکەوە، کە تازە مووگرە بووە و دەموچاوێکی گۆڕاو! کوڕەکەمان بووە بە پیاو و ژنە گریا!

کاووس ڕای کرد، خورجینەکەی لە یەحیا سەند و ئیتر هەر دەست و شانەی ئەوانەی تر بوو، کە بۆ پێشوازیی هاتبوون.

هاتنەوەی کتوپڕی یەحیا، وای کرد دایک و باوکی نەتوانن نەزرەکەیان بەجێ بهێنن و قوربانیی بۆ بکەن. بۆیە ئەو کارەیان خستە سبەینێ. ئەو ڕۆژە تا ئێوارە، خزم و ئاشنا هەموو هاتنە دیداری یەحیا و تا شەو درەنگانێ مانەوە و نەنوستن.

بۆ بەیانیی ڕۆژی دوایی، تامەزرۆییی یەحیا بۆ بینینی مامۆستا عەبدولڕەحمان، شەکەتیی سەفەری لەبیر بردەوە و لەگەڵ یەکەمین دەرفەتدا، بەرەو لای ئەو چوو. بەدرێژی چۆنێتیی خوێندن و ئاستی مامۆستاکانی لە ئەسفەهان بۆ باس کرد.

***

دارسەرووەکەی دایکی باڵای کردبوو، لاوێکی تەواوی لێ دەر چووبوو! ئەمەش واتە گەیشتنی دایکی بە ئارەزووە لەمێژینەکەی. دایکی یەحیا، خوشکەزاکەی خۆی بۆ هەڵبژاردبوو و ئێستاش کاتی ئەوە هاتبوو، هانیەی خوشکەزای بۆ بهێنێت.

دوو خوشکەکەی نیازی دڵیان پێکەوە گرێ دابوو. یەکێک وتی، "دایە، هاتن." پوور و پوورزاکان بەرەوپیری یەک چوون و ئەملاولای یەکیان ماچ کرد.

”چ ڕۆژێکی موبارەکە! ماشەڵڵا، ئەمە سنەوبەرەکەی تۆیە؟ یەحیا! ئەو کوڕیژگەیەی هەمیشە دەهاتە لای پووری خۆی. ئێستا بووە بە پیاوێک!“

”ئەودەم یەحیا زۆر منداڵ بوو، تۆ هێشتا هانیەت نەبووبوو؟ وا نییە؟“

”ئەرێ، هانیە پێنج ساڵ لە یەحیا منداڵترە.“

”سـ... سڵاو!...“

دەستە سپییەکانی، کە دەتوت لە عاج دروست کراون، سینییە زیوین و پەرداخە شەربەتەکانی هێنابووە سەما. برۆ ڕەش و پەیوەستەکانی، تاقی میحرابە پیرۆزەکانی دەهێنایەوە یادی مرۆڤ و خورماییی چاوەکانیشی، سەرشار بوو لە ڕوونیی شەرابێکی پەتی. گۆنا سوور و سپییەکانیشی، دەتوت دوو سێون لەبەر تیشکی خۆردا دەدرەوشانەوە!

دایکی یەحیا، کە کەمەندکێشی باڵای بووکەکەی بووبوو، زەردەخەنەیەکی ڕەزامەندی کەوتە سەر لێوی و وتی، ”سڵاو لەو ڕوخسارەت، کە هەر ئەڵێی مانگە، ئەی نازدار!“

دایکی سەبری نەمابوو. دەیویست یەکەمین پزیسک دابگیرسێنێت. بە گوێی یەحیادا چرپاندی، ”دەبینیت، کوڕم؟ دەبینیت، هانیە بووە بە چ خۆرێک؟“

بەڵام یەحیا هیچی نەوت. دایکی لە زەوی بوو و ئەو لە ئاسمان. دایکی مەفتونی فریشتە سیفەتێک و ئەویش فەنابووی شکۆ و جوانیی مەلەکوت...

***

ڕۆژانی پڕ نیگەرانیی یەحیا، هاوکات بوو بە شادی و





خۆشییەکانی دایک و باوکی. هەموو دەیانویست قەناعەت بە یەحیا بکەن، نەچێتەوە بۆ ئەسفەهان، لە کاتێکدا ئەو بیر و خەیاڵی لای ڕۆژانی ئایندەی بوو. ئەوە بوو، ڕۆژێکیان دایکی بەڕاشکاوی پێی وت، ”کوڕم، کە تۆ ئاوارە دەبیت، من ئۆقرەم لەبەر هەڵدەگیرێ! ئەسفەهان لە مێشکی خۆت دەر بکە. چاوی شارەکە نووقاوە و دەروازەکانیشی لەسەر پشتن. میرەکان تەماعیان تیا هەیە و چەتەکانیش بیر لە تاڵان و فەرهوودکردنی دەکەنەوە. مەڕۆ و لێرە بمێنەرەوە! لێرە تۆ خۆت گەورەی خۆتیت...“

بەڵام حەبەش، کە حەزی بەو قسەیە نەکرد، وتی، ”یەحیا بۆ خۆی بووە بە پیاوێک و زانایەک، هاونشینی کەسانێکی گەورەیە. لێی بگەڕێ با خۆی ڕێگەی خۆی لە ژیاندا هەڵبژێرێت. تۆش هەڵسە بیرێک لە دەعوەتەکەی شەوی پێنجشەممە و میوانەکانت بکەرەوە...“

”نیگەرانیی ناوێت. بیرم لێ کردووەتەوە. ئێوە کارەکانی دەرەوە بکەن و هیی ماڵەوەش ئێمە دەیکەین. سەجادی زاوامان و کاووس و خوشکەزاکانم بۆ خزمەتکردنی میوانەکان دێن. خەمت نەبێت، خوا کەریمە.“

# ئەم لاوە بەختباشە

خامۆش مەبە، ئەی کوڕە خۆشگۆ و خۆش مەرامەکە
بدوێ...

فەرشیان لە حەوشەکە ڕاخستبوو. بە مەبەستی پێشوازیکردن لە گەورەپیاوان و مامۆستایان، ئەو هەیوانەیان ڕازاندبۆوە، کە ڕووەو قیبلە بوو و کەمێک لە حەوشەکە بەرزتر بوو. هەندێ چراشیان لەم گۆشە و ئەو گۆشە دانابوو، تا شوێنەکە ڕووناکتر بێت.

خۆر ئاوا بوو و میوانەکان یەکەیەکە هاتن؛ میر و خزمەتکارەکانی، خواجە عوبێد و عەبدولڕەحمان و چەند زانایەکی ئایینیی تر و...

تریفەی مانگەکە بە شێوەیەکی دڵڕفێن شەقڵێکی ڕۆحیی بە شەوەکە بەخشیبوو و ڕەونەقێکی تری بەو حەوشەیە دابوو، کە سیخناخ بوو لە میوانە ئازیزەکانی سوهرەوەردی.

حەبەش سەرقاڵی پێشوازیکردن بوو لە میوانەکان. خواجە عوبێد بانگی کرد و وتی، "برا، خودا بەرەکەت بدات و هەمیشە سفرەت بۆ بۆنەی پیرۆز ڕازاوە بێت. ئەی یەحیا کوا؟ دەمانەوێ بیبینین!"

حەبەش بە دابونەریتی خۆیانەوە پابەند بوو و شەرمی دەکرد کوڕەکەی پیشانی میوانەکان بدات، بەڵام عەبدولڕەحمان

لەو کاتەدا یەحیای لای بەشی چەپی حەوشەکەوە بینی و بانگی کرد، "یەحیا! یەحیا!"

یەحیا نزیک بۆوە و لەگەڵ گەورەکاندا ماچوموووچ و تەوقەی کرد و دەستی شێخانی بەتەمەن، خواجە عوبێد و مامۆستا عەبدولڕەحمانی ماچ کرد. خواجە عوبێد وتی، "عەبدولڕەحمان، دەبێ قەدری تۆ بزانرێ. قوتابییەکی چەند باشت پەروەردە کردووە!"

"قوربان، ئەوە هەمووی هەوڵ و تەقەللای خۆی بووە."

یەحیا بە شەرمێکەوە سەری دانەواندبوو. خواجە عوبێد پرسیی، "باشە کورم، ئێستا باڵت لێ ڕوا یان نا؟"

یەحیا ئەو خەونەی جارانی خۆی بیر کەوتەوە، کە داوای لە خواجە کردبوو، تا بۆی لێک بداتەوە و لە وەڵامدا وتی، "نا! نازانم."

میر بارام، کە میری سوهرەوەرد بوو، ویستی سەبارەت بە خوێندنەکەی یەحیا و ئاستی زانستی لە ئەسفەهان پرسیاری لێ بکات، بەڵام عەبدولڕەحمان ئاماژەی بۆ میوانەکان کرد و داوای کرد ئەو باسە بخرێتە پاش ڕۆیشتنی ئەوان.

بەتڵێکی شەو ڕۆیی و عەبدولڕەحمان سوپاسی میوانەکانی کرد و کۆتاییی بۆنەکەی ڕاگەیاند. پیاوەکانیش یەکەیەکە تەوقەیان لەگەڵ حەبەش کرد و ماڵئاواییان کرد.

حەوشەکە میوانێکی ئەوتۆی لێ نەمابوو و یەحیا سەری دانەواندبوو و لەسەر داوای گەورەکان، بەتەما بوو بکەوێتە باس و قسە! دایکیشی، کە چاوەڕێی ئەو دیمەنە بوو، دەستی هانیەی گرت و چوونە ژوورەوە، تا لەوێوە گوێ بۆ قسەکانی یەحیا شل بکەن.





الحمد لله و لله الخلق و الأمر و الصلاة و السلام على جميع الأنبياء و...

"... قال الله في كتابه الكريم، ‹فأما بنعمة ربك فحدث...›
من کە بەندەیەکی ئۆمەتەکەی موحەممەدم (د. خ.)، هەست بە بەختەوەرییەکی گەورە دەکەم، کە خوای میهرەبان لەنێو هەموو شتە دڵڕفێنەکاندا، زانست و داناییی لەلا جوان و خۆشەویست کردم. سوپاسی خوا دەکەم بۆ ئەم بەخششەی و هەروەها هیی باوک و دایکیشم، کە لەم ڕێیەدا هاوکارییان کردم و درێخییان دەرهەقم نەکرد. ئینجا هیی مامۆستای ڕێپیشاندەرم، مامۆستا عەبدولڕەحمان، خوا بیپارێزێت و هیی هەموو ئەو گەورە و بەڕێزانەی بە ئامادەبوونیان ڕەونەقیان بەم کۆڕە بەخشیوە. بەڕێزینە! من لەگەڵ خواجە بوبەکر چووم بۆ ئەسفەهان، جەنابی پیاوێکی میهرەبان و گەورەیە. بەو ئومێدەی خوا سەبووریی پێ ببەخشێت لەو بەلایەی بەسەری هاتووە و هەقی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بە چاکییەکانی هاوڕێ ئەسفەهانییەکەشی بدەین، واتە خواجە موختار.

"من لەم هەوارەی خۆمانەوە، ڕۆیشتم لە کاتێکدا لە خەرمانی زانستی زانایانی ئەم دیارە، واتە جەنابێکی وەک مامۆستا عەبدولڕەحمان، بەهرەمەند بووم و توێشووی سەفەرم هەڵگرتبوو، هەروەها لە زانایانی مەراغەش. لە ئەسفەهان دەستم دایە خوێندنی ئەدەب، کەلام، بیروباوەڕەکان، تەفسیر، مەنتیق و ماتماتیک و زانستەکانی سروشت و لاهوت. شەوانە زۆر کەم دەنوستم، بە ڕۆژیش، هەر لە خوێندن و تەقەللادا بووم. هیچ دەرفەتێکم لەدەست خۆم نەدەدا و هەر

زانایەکی گەورەم ببینییایە، لە کۆڵی نەدەبوومەوە، تا لەسەر دەستی شت فێر دەبووم. ئەوە بوو، چوار ساڵ خوێندنم بە دوو ساڵ بڕی و مامۆستاکانم لێم قاییل بوون. ئێستا ڕێگەکە دەزانم، بەڵام هێشتا نەمبڕیوە. دەبێ بیبڕم. چیی دی ئەسفەهان وەڵامدەرەوەی من نییە. دەمەوێ ڕوو بکەمە شوێنی تر و وڵاتی تر. دەمەوێ لە زانستی مامۆستایانی ئەو سەرزەمینانەی تریش بەهرەمەند ببم و بەرەو بەرکەماڵی بچم. نازانم و سەرم سووڕ ماوە لەوەی بۆچی بەرهەم و تەقەللاکانی کەسانێکی گەورەی وەکوو ئیبنو سینا و فارابی و غەزالی و ئەبولحەسەنی ئەشعەری، کە بێوچان تەمەنیان لەم ڕێیەدا تەرخان کرد، تینوویێتیم ناشکێنێت. تینوویێتییەکی لەڕادەبەدەر و سەیرم بۆ مەعریفە هەیە. دەچم بۆ مەراغە، یان هەرشوێنێکی تر، کە سەرچاوەی زانین بن. ئەوەی بیری لێ نەکەمەوە، سەروەت و سامان و پلەوپایە و ژن و منداڵە. هەست دەکەم ئەمانە دەبنە کۆت و لە جووڵەم دەخەن. بۆ ساتێک چییە، سرەوتم نییە. تینوویێتی بۆ زانین و گڕی حەزێک بۆ گەڕان، وا لەناو دڵمدا! بارەکەشی کۆڵێک کتێبە. ونبوویەک هەیە، کە دەبێ بەدوایدا بگەڕێم و لەم ڕێیەشدا هیچ شتێک ناتوانێ بەرم لێ بگرێت، مەگەر تیغی ئەجەل یان شمشێری جەهل و ئیرەیی.

"سەبارەت بە ئەسفەهانیش، خەڵکەکەی زۆر دەمارگیر و دیندارن، کە بەردەوام نیگەرانی سبەینێی ئەم شارەن. ئەو شارەی میرانی وڵاتانی تر، چەندەها حیکایەتیان سەبارەت بە گەنجی فەرمانڕەواکانی و جوانیی ژنەکانی دروست کردووە و بەردەوام چاوی تەماعیان تێ بڕیوە، هەموو ڕۆژێک لە خۆرهەڵات و خۆرئاواوە پەیامێک دەگاتە ئەوێ. زانایانی





شارەکەش، وەکوو خەڵکە عەوامەکەی، بیرتەسک و کورتبینن. وەک وێرد و زکر، ئاسەوارەکانی پێشینانی خۆیان دووبارە دەکەنەوە. دژایەتیی هەموو جۆرە داهێنان و جووڵەیەکی نوێ دەکەن. تەحەممولی پرسیارێک ناکەن، سنووری دەستووری باو و نەریت تێپەڕێنێت. لە هەموو شوێنێک بانگەشە بۆ تەسلیمبوون و قاییلبوون دەکرێ و ئامۆژگاریی خەڵک دەکەن، بێدەنگ ببن و ملکەچی ئەو دەستوورانە ببن. ئاسۆکان داخراون، هزر و ڕاکان بێجووڵەن و دڵەکان ماتومەلوولن. نازانم، لەوانەیە هەقیان بێت کە وەهان. بەڵام من دەچم بۆ مەراغە. بەو هیوایەی لەوێ ئەو گرفتەم نەبێت! ڕەنگە ڕۆژێک لە ڕۆژان بچمەوە بۆ ئەسفەهان و ڕەنگە...! بەڵام هەرگیز ئەم شارەم لەیاد ناچێت و بۆی دێمەوە! ببوورن! هەست و سۆزم بوونە مایەی درێژەدان بە قسەکانم!...

و السلام علیکم و رحمة الله و برکاته."

یەحیا بێدەنگ بوو، دەستی ڕێزی خستە سەر سنگی و چووە لای خوارووی هەیوانەکە دانیشت. خواجە عوبێد سەرێکی لەقاند و وتی، "حەبەش، بەڕاستی پیرۆزباییت لێ دەکەم. چیی تر یەحیا کوڕی تۆ نییە! بەڵکوو کوڕی هەموو مرۆڤەکانە! لێی گەڕێ بەڵکوو بە شتێک بگات و بێگومان ئاسەوار و بەرەنجامی هزر و تێفکرینەکانیشی، دەبێتە موڵکی هەموو مرۆڤەکان. ئیمامی شافیعی و ئەشعەری و غەزالی، لە نموونەی ئەو جۆرە کەسانەن، هەروەها کوڕەکەی تۆش... لەبەر ئەوە، هەرگیز ڕێی لێ مەگرن. وازی لێ بێنن، بۆ کوێ دەچێت، با بچێت."

میر بارام بە شپرزەییەکەوە هەڵسا و بە حەبەشی وت، "ئەم بەڕێزانە کوڕەکەت تووشی گاشەیەک دەکەن. ئاگات لێی بێت. ئەو قسانەی ئەو دەیانکات، جگە لە پەشیمانی و دەردەسەری، هیچی تریان لێ سەوز نابێت. پێی بڵێ با ئاگای لە خۆی بێت. حەیفە، گەنجە! خواحافیز و ماڵتان ئاوا بێت."

عەبدولڕەحمان هەڵی دایێ، "سوپاس بۆ خوا، بە تەمەن گەنجە، بەڵام بە ئەقڵ گەورەیە. نیگەران مەبە و ئەم لاوە بەختباشە بدەرە دەست خوا و ئەو باشترین پاسەوانە."

میوانەکان هەموو ڕۆیشتن و خەمێکی قورسیان دوای خۆیان جێ هێشت. دایکی یەحیا لای هانیەوە بەرەو لای حەبەش چوو و وتی، "چی بە خوشکەکەم بڵێم؟ ئەی چی لە هانیە بکەم؟"

حەبەش، کە خەم دای گرتبوو و بیری دەکردەوە، وتی، "من چی بکەم؟ دەتوانم ڕێی لێ بگرم نەڕوات؟"



## گەڕان بەدوای خدردا

پێم بڵێن کێ پرکێشی ئەکا، هاوڕێیان
بێتە هاودەمی بێکەس و یاری غەریبان؟
مەگەر خدری موبارەک ڕۆژێک بێت
بە هیممەتی، ئەم ڕێیە واڵا کا بۆمان

ئەو و بێدەنگی و دەشتێکی پان و بەرین، کە بۆ بڕینی و گەیشتن بە مەنزڵ، چەند فرسەخێک ڕێ مابوو. کۆڵەبارەکەی کتێب بوو و مەرەکەبەکەشی بریتی بوو لەو هەنگاوە قاییمانەی بەرەو خۆرئاوا دەینان. سوڵتانیەی جێ هێشتبوو، هەروەها زنجانیش بە کۆڵێک لەو باس و گفتوگۆیانەوە، کە لەگەڵ زاناکانیدا ئەنجامی دابوون و بەرەو مەراغە ملی ڕێی گرتبووە بەر.

لە نزیک ڕووباری سپیدرودەوە، بووە میوانی کابرایەکی دێهاتی، کە شتێکی سەبارەت بە ئەدەبیاتی پارس و عەرەب دەزانی و تینووی زانیاریی زیاتر بوو. کەیفی بە یەحیا هات. خانەخوێ بە تامەزرۆییەوە پرسیاری دەکرد و میوانەکەشی وەڵامی دەدایەوە. تا گەیشتە ئەوەی کابرای دێهاتی باسی ئێلاخی شیز و ئاتەشکەدە سەیروسەمەرەکانی کرد، "مەخابن، من چوومەتە تەمەنەوە و وەرزی پاییزە و هەواکەی ساردە. کۆتاییی بەهار یان چلەی هاوین، کاتێکی

گونجاوە بۆ چوون بۆ ئەوێ. دوور نییە تا ئێستا بەفر لەوێ مابێت. بەڵام تۆ ڕێگەکەت لەوێوەیە، دەتوانیت ماوەیەک لەوێ بمێنیتەوە...“

هەوایەکی پاییزیی دەهات. زەردیی خەزان دیمەنێکی تری بەو دەشت و کێوە بەخشیبوو. یەحیا، دوای ئەوەی چەند ڕۆژێک لای ئەو کابرا دێهاتییە مایەوە، بە ئومێدی ئەوەی هەرچی زووترە بگاتە لای مامۆستایانی مەراغە،ماڵئاوایی لەو کرد و چاولەڕێی سبەینێ بوو، تا بە پێچەوانەی بزاوتی پاییزەوە، دوای بەهاری سەوز و پشکووتووی دڵی بکەوێت.

دەنگی گەڵای درەختەکان، ئاوازێکی دڵنشینی لە زەینیدا دەخولقاند. ئەوەندەی نەمابوو بگاتە ئاوابییەک.

”برا، لەسەر خۆت! چاوەڕێ بکە با پێکەوە بڕۆین.“

یەحیا ڕاوەستا. پیرێکی تەمەن شەست ساڵ بوو. سڵاوی لێ کرد و ئەویش وەڵامی دایەوە، ”وتم ئەگەر لە کارەکەتدا پەلەت نەبێت، وا چاکترە پێکەوە ڕێگەکە ببڕین. ڕێیەکە درێژە و گەر هاوەڵێکت لەگەڵدا بێت، هەست بە دوورییەکەی ناکەیت.“

”پەلەم نییە، تا ئێوارە بگەمە ئاوابییەک، باشە.“

”تۆ لاویت و بەم هەنگاوانەتەوە، تا ئێوارە بە پێنج ئاوابییش دەگەیت. هەرچەندە ئەم ناوچەیە ئاوەدانە و دەتوانیت لە هەرکوێ بتەوێ، لا بدەیت و ڕۆژی تیا بکەیتەوە.“

”کەواتە با ببینە هاوەڵی ڕێ.“

دوای ئەوەی چەند هەنگاوێکیان نا، کابرای پیر ڕووی کردە یەحیا و لێی پرسی، ”کوڕم، تۆ لەکوێوە هاتوویت و





بۆ کوێ دەڕۆیت؟“

”لە سوهرەوەردەوە هاتووم و بەرەو مەراغە دەچم.“

”بە چ نیازێک؟“

”بەدوای زانست و حیکمەتدا وێڵم. ئەی تۆ؟“

دەستی بۆ دوو کێو ڕاکێشا، یەکێکیان بەرامبەری بوو و ئەوی تر لەپشتیەوە:

”لەو کێوەوە بۆ ئەو کێوە.“

”مەبەستت چییە؟“

”زیارەت و ڕاز و نیاز و...“

یەحیا بە سەرسووڕمانەوە پرسیی، ”بۆ لەوێ هیچ مەزارێکی لێیە؟ یا...“

”نەخێر، ئەوێ شیزە. پەرستگەیەکی دێرینی لێیە، بە ئاتەشکەدەی ئازەگوشەسب ناسراوە.“

”خەڵکەکەی مەجووسن؟“

”هەموو، نا. زۆربەیان موسڵمانن! هەندێ جوولەکە و مەسیحی و مەجووسیشی بەپەرشوبڵاوی لێیە.“

کابرای پیر قسەی دەکرد و یەحیا لێی دەڕوانی. ڕوخساری بۆ ئەم ئاشنا بوو. لەکوێ بینیبووی؟ شتێک لە مێشکیدا چەخماخەی دا. هەستی کرد پەیی بە شتەکە بردبوو. ئەمە هەمان ئەو پیرەیە، کە لە خەونیدا شوێنی باڵەکەی تری پێ نیشان دابوو.

بە خۆشییەوە لەبەر خۆیەوە وتی، ”باڵ؟“

”وتت چی؟ باڵ؟ یانی چی؟“

”باڵی فڕین، فڕینی ئینسان، باڵی ئینسان بۆ فڕین.“

کابرای پیر پێکەنی و وتی، ”لەودیو ئەو کەلەوە

موغێک هەیە، ئینسان فێری ڕێوڕەسمەکانی ئازادی دەکات؛ ڕێوڕیسمی فڕین، هەندێ جاریش دەڵێت، فڕین پێویستی بە پەڕ و باڵ نییە و کردارە باشەکانی ئینسانن، کە دەبن بە پەڕ و باڵی.“

یەحیا شاگەشکە بوو.

”من دەتوانم ئەو ببینم؟“

”بۆچی نا! هەموو کەسێک دەچێت بۆ لای، تەنانەت موسوڵمانەکانیش. تا بڵێی پیاوێکی بەشکۆیە! دیدەی وەک خۆر و دڵی وەک دەریا، پاشماوەی دانا و ئاوەزمەندەکانی ڕۆژگاری کۆنە. تەواو میهرەبانە. پیاوێکە، پێی لە زەمینە و سەری لە ئاسمان. دەیبینیت! زمان لە وەسفیدا بێتوانایە.“

یەحیا هەستی کرد دەستێک لە غەیبەوە دەیپارێزێت. ناگەهان ڕووی کردە قیبلە و سەری بۆ سوجدە برد. کابرای پیر بە سەرسووڕمانەوە لە یەحیای ڕوانی. کە هەستایەوە، دووبارە کەوتنەوە ڕێ.

لای نیوەڕۆ گەیشتنە دەم کانیاوێک، کەمێک پشوویان دا و یەحیا نوێژی نیوەڕۆی کرد و ملی ڕێیان گرتەوە بەر. یەحیا سەرنجی دا، کە کابرای پیرە بارسووکییەکەی ئەمی بەلاوە سەیر بوو. سەبارەت بەو خۆراکە کەمەی پێی بوو، وتی، ”ئەو بڕە سنجوو و نۆکەی لە گیرفانمدا پێم مابوو، پاشماوەی خواردنی شێوان بوو. حەزم بە زۆرخۆری نییە! چڵێسی و نەوسنی، ئینسان لە حەقیقەتەکان دوور دەخاتەوە. من عەودالّی دوای زانستێکم لە جۆرێکی تر، نەک لەو جۆرەی ئەمڕۆکە لەناو کۆڕ و کۆبوونەوەی زانا ئایینییەکاندا باوە.“ کابرای پیر، کە بیری هەر لای موغەکە بوو، وتی، ”پیاوێکی





دانایە. ئومێد دەکەم کۆڵەباری پرسیارەکانت سووکتر بکات. خەڵکێکی زۆر بۆ بەهرەمەندبوون لە داناییەکانی، ڕوو لە دەرگاکەی دەکەن. بەو هیوایەی دەمەوخۆرنشین بیبینین.“

”بەڵام تۆ تەمەنت هەیە و نابێ لەوە زیاتر ڕێ تەی بکەیت.“

”لاوۆ، سەیری ڕواڵەتم مەکە! کاری وەها سەختم کردووە لە ژیانمدا، کە ئەمە لە چاویدا هەر هیچ نییە. بەڵام ئەوەی پێم سەیرە، ئەوەیە کە تۆ زانایەکی موسڵمانیت، چۆن حەز دەکەیت و دەتەوێ پەیوەندیی زانستی لەگەڵ موغێکی زەردەشتیدا ببەستیت؟“

یەحیا بزەیەکی هاتێ و وتی، ”پێغەمبەری ئێمە، درووود و سڵاوی خوای لێ بێت، داوای لێ کردووین بەردەوام هەڵوەدای زانست بین، تەنانەت گەر ئەو زانستە لە چینیش بێت. مەبەست لەو زانستەش ئەحکامی دین نییە، کە لەناو عەرەب و عەجەمدا وەکوو یەک هەن. بەڵکوو هەندێ زانستی ترن، کە ئێمەومانان دەبێ بە ئیرادە و شێلگیرییەوە پێی بگەین. من قوتابییەکی موسڵمانم و زانایەکی زەردەشتی ئەزموونێکی زۆر و فراوانی هەیە و دەتوانم سوودی لێ وەر بگرم و لێی بەهرەمەند ببم. هەر وەکوو ئێستا! تۆ پیاوێکی زەردەشتیت و منیش دەبێ ڕێگەی گەیشتن بەو پیاوە دانایە لە تۆوە فێر ببم.“

کابرایەکی پیر، بە زەردەخەنەیەکەوە، سەری ڕەزامەندیی بۆ لەقاند و بە خۆشحاڵییەوە قسەکانی یەحیای پەسەند کرد و وتی، ”ئەوەندەمان نەماوە بگەینە شیز!ماڵی موغەکە کەمێک لە شیز نزیکترە. لە ئاواییەکدایە، تازە دروست

کراوە. ئێستا کەس لە شیز ناژی. فەرمانڕەوا موسڵمانەکان هەموو دانیشتووەکانی ئەوێیان پەڕاگەندە و تارومار کرد. با لای ئەو جۆگە ئاوەوە وچانێک بدەین."

یەحیا قۆڵی هەڵکرد، تا دەسنوێژ بگرێت و نوێژی عەسر بکات.



## تا بارەگای پیری موغان

گەر پیری موغان بوو بە مورشیدی ئێمە، چ باک
چون هیچ سەرێک نییە خاڵی لە سیڕی خودایی

دیمەنی زەردەپەڕی پاییز بەسەر دامێنی کێوەکانی ئەو دەڤەرەوە، کە وەکوو کۆپارەی وشتر شانیان بە شانی یەکەوە دابوو، لە چاوی یەحیادا جیلوەیەکی تری هەبوو.

پیرە وتی، "زۆرمان نەماوە بۆ شیز. ئەمشەو لەم دێیە دەمێنینەوە. ڕێگەوبان جێی متمانە نییە، هەرچەندە ئێمە هیچمان پێ نییە تا بترسین، بەڵام ئینسان هەر ئاگای لە خۆی بێت باشە. ئەو چواردەماڵەی دەکەونە بەشی خۆرهەڵاتەوە، هی زەردەشتییەکانن و ئەو حەفتا خانووەش کە دەکەونە خۆرئاواوە، هی موسڵمانەکانن. موغەکەش ژوورێکی هەیە، کە دەرگای بە ڕووی هەموو کەسێکدا ئاوەڵایە. ئیتر خۆت کوێت پێ خۆشە، دەتوانیت لەوێ بحەسێیتەوە."

"ئەگەر بێنەزاکەتی نەبێت، پێش هەموو شتێک، دەمەوێ بچم سەردانی ئەو موغە بکەم و ئیتر دوای ئەوە، گرنگ نییە لەکوێ دەمێنمەوە. لە کەلاوەدا، یان خشتێک بکەمە سەرینم و ڕۆژ بکەمەوە."

هێشتا دنیا تەواو تاریک نەبووبوو، کە گەیشتنە دێیەکە

و یەکسەر بەرەو ماڵی موغەکە چوون. خزمەتکارەکە بۆ ژوورەوەی بردن.

لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ئاگرێک کرابۆوە و پیاوێکی سپیپۆش، کە زوننارێکی لە کەمەر بەستبوو، ڕدێنێکی سپیی بەفرینی درێژی بەر دابۆوە و هەردوو لاجانگە سپییەکەشی کەوتبوونە سەر شانەکانی، بە دوو چاوی گەورە و تەوێڵێکی بەرزەوە، لەبەر ڕووناکیی ئاگرەکەدا دانیشتبوو و خەریکی خوێندنەوە بوو. وەختێ چاوی بەوان کەوت، دەسنووسەکەی دانا و وەڵامی سڵاوی تازەهاتووانی دایەوە و ئاماژەی بۆ کردن، کە دابنیشن.

بە زمانی کوردی کەوتە قسەکردن و یەحیاش، کە بە بنەچە کوردە، بەمە زیاتر خرۆشا و شەیداتر بوو. هەستی دەکرد گەیشتووە بە کانییەکی بەخوڕ و دەیویست تا زووە، تینوێتییەکەی خۆی پێ بشکێنێت. موغەکە پرسیی، "هیچتان خواردووە؟"

پیرە وتی، "نەخێر، ئەوەندە نابێت، گەیشتووینەتە ئێرە و دوای ئەم دیدارەی ئێوە، دەچین شێو دەخۆین و پشوو دەدەین."

"کەمێک کونجی و گەنمی برژاومان هەیە لەگەڵ تۆزێک شیردا، پێی قاییل بن."

ئینجا ئاماژەی بۆ خزمەتکارەکە کرد، تا بیانبات بۆ ژووری ڕێبواران و لەوێ خزمەتیان بکات.

یەحیا خۆی پێ ڕانەگیرا و وتی، "هەندێ پرسیارم لە بەڕێزتان هەیە."

موغی میهرەبان لە وەڵامدا وتی، "بەسەر چاو. بەڵام





ئەمشەو نا. سبەینێ دوای بەرچای، لە خزمەتتاندا دەبم. هەر لێرە و لای ئەم ئاگرەوە."

پاشان ڕووی کردە خزمەتکارەکە و وتی، "بەرچاییەکەشیانت لەبیر نەچێت. شیر و نانی تازەی جۆ."

یەحیا و هاوەڵەڕێکەی ڕۆیشتن، تا شەو لەوێ بحەسێنەوە.

# خەونێکی دی

بەیانی باشی کرد بولبول، لەکوێیت ساقیا، دەی هەڵسە
چون جەنجاڵی کردووە سەرم، خەیاڵی خەونی دوێشەوم

ئاگرەکە بڵێسەی دەسەند، شادیبەخش و فریودەر، سەمای دەکرد، وەک ژنانی جادووگەر، بە شێوەیەکی سیحراوی لوولی دەخوارد! ئاگرەکە و گڕە سەرگەشتەکانی، ئەفسوونێکی جاویدانی، شەپۆلێک لە نوور، بڵێسەکان سەراپا نهێنی بوون و ئیلهامبەخش، لەو چەشنەی کێوی تووری مووسای هێنابووە جۆشوخرۆش. لە هەموو جێیەک ئاگر بوو و دڵ و دیدەی لە سەرسامییەکی ئاشنادا نوقم دەکرد.

ئەو بەدوای بڵێسەکاندا دەفڕی، نە دەیزانی خەو چییە و نە بێداری. ئای کە دڵڕفێنە، وەختێ لە چاوانتدا گڕ لە تینوویێتیی هەڵکشانێکی داخ بەر ئەدەن.

باڵی لێک دەدا، مێرگبەمێرگ، کێوبەکێو تا تووری سینا! ئەوە یەحیا بوو بەدوای ئاگرێکدا ڕای دەکرد، کە ئاشیفتەی کردبوو! سواری ئاگرەکە بووبوو و ڕەشمەی ئەسپە سەرکێشەکەی، خەیاڵی بە دەستەوە گرتبوو و قەڵەمبازی دەدا. نەیدەزانی خەون دەبینێت یان بێدارە! سەرەنجام، لە دامێنی یاڵێکدا دانیشت، بایەوانی هزری هەڵکرد و کەشتیی بوونی دایە دەست بای سەبا و بە حەسرەتی میراتی

درەوشانەوەیەکی خوسرەوییانەوە، لە دووری دەڕوانی.

فەرەیدوون، پیرەی کە هاوەڵی ڕێی یەحیا بوو، لە تاوی زیارەتی ئاتەشگەکە، لە هەموو ڕۆژێک زووتر لە خەو هەڵسابوو. خوێندنی یەک لەدوای یەکی کەڵەشێرەکانی دێ، هەواڵی هاتنی سپێدەیان پێ دابوو. یەحیا لە ژوورەوە نەبوو. چووە حەوشەکە. ئاسمان لە تاریکوڕوونی شیرئاسای دەمەوبەیاندا و بە جریوەی ئەستێرەکانیەوە، سەرشار بوو لە سرووش و ئیلهام.

تەماشای ئەملا و ئەولای کرد، ئاسەواری یەحیا نەبوو. بە ترسەوە لە خانووەکە چووە دەرێ. لەولای دەشتەکەوە و لە دامێنی یاڵەکەدا، سێبەرێکی بینی، هەڵکووڕ مابوو. بێگومان یەحیا بوو. خێرا خۆی گەیاندە لای.

"ئەوە لەکوێیت، لاوۆ؟ هێشتا کازیوەی نەداوە، لە کێ هەڵاتوویت؟ هەواکە جارێ ژەهراوییە."

باڵاپۆشەکەی خۆی دا بەسەر شانەکانی یەحیادا. یەحیا بە شەرمێکەوە وتی، "بەیانیت باش. شپرزە بووم، فەرەیدوون! بمبەخشە! خەونێکی خۆش ئاشیفتەی کردم و خرۆشاندمی. نەمویست نارەحەتت بکەم، بۆیە هاتمە دەرێ."

"خەون؟ خەونی چی؟"

"خەونێکی خۆش بوو. ئاگرێک بوو، بڵێسەی دەسەند، بە شێوەیەکی هۆڤییانە و خرۆشێنەرانە. موغەکەم بینی، لای ئاگرەکەوە وەستابوو. دەتوت پاسەوانیی ئاگرەکە دەکات و نزای دەکرد. ڕووی کردە من و پێی وتم، ‹باڵەکەی ترت لەلای منە. من ڕەگی باڵەکەی ترت لەسەر شانت دەڕوێنم. پاش ماوەیەک دەڕوێت و ئیتر بەو زووانە دەتوانیت بفڕیت.› لێی





نزیک بوومەوە. لە دووتوێی ئەو کتێبەدا کە بەدەستییەوە بوو، چڵە زەیتوونێکی دەر هێنا و خستیە سەر شانم. هێندەی پێ نەچوو، چەکەرەی کرد و ڕوا. گەورەتر بوو و توانیم بفڕم. فڕیم! ئاسمان لەژێر باڵەکانمدا شەپۆلی دەدا و زەویش لە خوار پێیەکانمەوە بوو. لە خۆشییاندا هاوارم کرد و لە خەو بەئاگا هاتمەوە. فەرەیدوون، من دەبێ سوپاسگوزاری تۆ بم، کە منت بۆ ئێرە هێنا! هەمیشە مەمنونتم و مایەی ستاییشی منیت."

"کوڕم، ئەوە بەختی بێدار و ناخی پاکی خۆتە، کە لێت ناگەڕێ ئارام بیت. هیوادارم بە مەبەست و مرادی خۆت بگەیت. من لە تۆدا نیشانەی بەختباشی دەبینم. جەخار، کە بازاڕی زانین بێبرەوە و بەدەگمەن کەسانێک دەبینین، وەکوو تۆ بەدوای فڕیندا عەوداڵ بن."

یەحیا دەسنوێژی گرتبوو، نوێژی کرد و پاشان خەریکی خوێندنەوەی قورئان بوو. هەنگینێ لەکن فەرەیدوونەوە دانیشت. خزمەتکارەکە بە چەند نانێکی جۆ و دوو جام شیرەوە هات بۆ لایان.

"فەرموون، دوای نانخواردن، سەروەرم چاوەڕێتان دەکات."

دنیا ڕووناک بووبۆوە. خۆر کەوتبوو. هەردووکیان کەوتنە ڕێ. یەحیا بۆ یەکەم جار هەستی بە بێقەرارییەکی نائاسایی کرد لە ناخیدا. تا ئەو کاتە و لە زۆر بۆنەدا، ڕووبەڕووی گەلێ میر و پیاوی گەورە و زانا بووبۆوە، بەبێ ئەوەی هەرگیز هەستێکی وا دای بگرێت. ئەم حاڵەتەی نە ترس بوو و نە بێئۆقرەییەکی ئاسایی، بەڵکوو شتێکی تر

بوو. ئەم هەستەی نە لە هەستی بێئارامیی دایکێک دەچوو بۆ بینینی منالەکەی و نە هەستی ڕەعیەتێک، وەختێ دەچنە لای فەرمانڕەواکەیان.

نەیدەزانی چ نهێنییەک لە دیداری ئەم موغە بێئەنوایەدا خۆی حەشار داوە، وا بەو ئەندازەیە ئەمی سەراسیمە کردووە. خۆیشی سەری لەمە دەر نەدەکرد.

فەرەیدوون هەستی کرد ڕوخسار و جوولە و بێدەنگی و قسەکانی یەحیا ئاسایی نین. لەوە دەچوو بلەرزێ و دانەجیرەی بێت و توانای پەیڤینی نەمابێت. لە کاتێکدا چوونە ناو حەوشەی ماڵی موغەکەوە، لێی پرسی، ”چیتە، یەحیا؟ بۆ وا نیگەرانیت؟“

یەحیا بە دەستی وەڵامی دایەوە، کە ”مەپرسە!“ خزمەتکارەکە پێش ئەوان خۆی کرد بە ژووردا و پاش تاوێک، گەڕایەوە و پێی وتن، ”فەرموون!“

فەرەیدوون و یەحیا چوونە لای موغەکە. هەر کە موغەکە هەستایە سەر پێ، یەحیا، کە چەند هەنگاوێک لێیەوە دوور بوو، وەک لاشەیەکی بێگیان کەوتە سەر ئەرزەکە.

فەرەیدوون زۆر ترسا و باوەشی بە یەحیادا کرد. خزمەتکارەکە بەپەلە ئاوی هێنا و کردی بە دەموچاویدا. موغەکە، کە لە شوێنی خۆیدا دانیشتبۆوە، وتی، ”وازی لێ بێنن. ئەوەندە هەستیارە، لە ڕەگەزی ئینسانی ئەم سەردەمە ناچێت. ئینسانی لەم جۆرە زۆر ناژی! بۆ منیش ڕووداوێکی سەیرە، کە هەڵکەوتوویەکی وا پێ دەخاتە کولبەکەمەوە. هەموو دوێنێ شەو ئەو لە خەون و خەیاڵی مندا بووە. ئیتر ئەوە بوو، ئاشو زەردەشت هاتە خەونم و ڕای سپاردم، کە





ئاگام لێی بێت و هەندێ شتی تریشی پێ وتم، کە ناتوانم بە ئێوەی بڵێم.“

یەحیا وردەوردە هاتەوە هۆش خۆی. تەماشایەکی چواردەوری خۆی کرد و دەستی کرد بە گریان. فەرەیدوونیش خۆی پێ نەگیرا و گریا. موغەکە بەبێ ئەوەی هەستێت، یەحیای بانگ کردە لای خۆیەوە، ”وەرە، وەرە ئێرە! وەرە لای وەجاخەکەوە، لای من و ئاگرەکەوە!“

یەحیا بە ڕێزەوە چوو و لەو شوێنەدا دانیشت، کە موغەکە پێی وتبوو. سەری دانەواندبوو و بێدەنگ بوو.

موغەکە وتی، ”تۆ لای من گەلێ ئازیز و هێژایت. تا کەی حەز بکەیت، دەتوانیت لێرە بمێنیتەوە. من گەلێ قسەم هەن لەگەڵ تۆ. هەڵبەتە دەبێ ئاگات لە کار و وانەکانیشت بێت. تا هەوا سارد نەبووە و بەفرێکی ئەستوور نەباریوە، دەبێ خۆت بگەیەنیتە مەراغە، ئەگینا لە بەفر و کڕێوەی زستاندا، هاتوچۆ لەم دەڤەرەدا مەحاڵە. ئێستاش ئەگەر ئامادەیت، با هێدی هێدی بەرەو پەرستگەکە بچین. عادەتەن کەسانێکی تریش، لە دوور و نزیکەوە، بۆ ئێرە دێن و دەبێ بیانبینم.“

خزمەتکارەکە گوێدرێژێکی هێنا. موغەکە بەزەحمەت سواری بوو و کەوتە ڕێ. دەستی خستبووە سەر شانی یەحیا و بەکاوەخۆ قسەی لەگەڵ دەکرد، ”کە لێرە تێپەڕیین، کەمێک لەولاترەوە شیز دەبینیت. ئێستا سارد و کپ و خامۆش و خاڵییە لە دانیشتووان و سەردانکەران! کوڕم! ئەگەر پێنج سەدە لەمەوبەر لێرەدا بوویتایە، شتێکی ترت دەبینی. ناوچەیەکی ئاوەدان، پڕ لە ڕابەری ڕۆحی و سروودخوان و ئەوانەی لە کونج و قوژبنەکانی هەموو دنیاوە

بۆ زیارەتی ئێرە دەهاتن. چەندەها پادشا و میرت دەبینی، بە خۆیان و دیاری و خزمەتکار و دەسوپێوەندەوە بۆ نەزر و پیرۆزی ڕوویان لێرە دەکرد. کورِم! گەورەپیاوانی وا دەهاتن بۆ ئەم سەرزەمینە، کە لە مەزنیدا، چاوی ڕۆژگار، کەمی وەکوو ئەوانی دیوە. کەسانێکی گەورەی وەکوو بوزورگمیهر و جاماسپ."

نەیتوانی قسەکانی تەواو بکات. قولپی گریان گەرووی گرت. شتێک لە چاوەکانیدا جۆشی دەدا. یەحیا سەری دانەواندبوو و هیچی نەدەوت. دوای کەمێک، موغەکە دەستی بۆ شوێنێک درێژ کرد و وتی، "ئەوێ شیزە! ئاتەشکەدەی ئازەرگوشەسپ، ئێستا بووە بە وێرانە، وێرانە، وێرانە..."

نەیتوانی زیاتر بڵێت، گریان ڕێی پێ نەدەدا. هەموو بێدەنگ بوون. کەمێک لەولاترەوە و لە کۆتاییی وێنجەزارێکدا، شووراکەی شیز دەبینرا. موغەکە لە گوێدرێژەکە دابەزی. دەیویست ئەو ماوەیەی ماوە، بە پێ بیبڕێت. یەحیا دەستی دابووە بنباڵی و لەسەرخۆ هەنگاویان دەنا. لەژێر لێوەوە شتێکی دەوتەوە. لە ئاتەشکەدەکە نزیک بوونەوە، ساختومانێکی مەزن، کە ڕوو لە وێرانی بوو. ساڵانێکی زۆر بوو موریدان و باوەڕداران پەرتەوازە بووبوون و پەرستگەکە لەو سەرچاوەی داهاتە بێبەش بووبوو، کە لە نەزر و دیاریی شاکانەوە لێی بەهرەمەند بوو.

شوورایەکی بەرز چواردەوری ئاتەشکەدەکەی دابوو، کە لە گاشەبەردی تاشراو دروست کرابوو. تاق و بورجە بەرز و دەروازە گەورەکانی، شکۆ و مەزنییەکی تایبەتییان بە ئاتەشکەدەکە دابوو. دەریاچەیەکی شێوە هێلکەیی، دیمەنی





حەسارە گەورەکەی تەواو کردبوو. ئاوێکی سازگار لە دوولای دەریاچەکەوە دەهات، کە هەمیشە بەخوڕ بوون. بینای پەرستگەکە و ئاتەشکەدەکە، بە گومەزە جوان و هیلالییە زیوینەکەیەوە و بە میحراب و وەجاخ و ئاگردان و سەرسەرای میوانەکان و مووبەقەکانیەوە، پێکهاتەیەکی بەشکۆ و دڵڕفێن بوو، کە لە ساڵی ٦٢٧ی زایینیدا و لە هێرشەکەی هیراکلیۆسی ئیمپراتۆری بێزانسدا، زیانێکی زۆری لێ کەوت و گەنجینەی بەڵگەنامە و نووسراوەکانی یان تاڵان کرا، یان سووتێنران.

ڕێگەیەکی درێژ بوو، بەڵام دەتوت ئەم موغە حیسابی مزی هەنگاوەکانی دەکرد. لای شووورای ئاتەشکەدەکەوە کەسانێک بۆ پێشوازیی هاتن و دەوریان دا.

دەڵێن ئاگری هەرچی ئاتەشکەدەکانی ئێرانە، لێرەوە براون. داگیرکەرانی دژ بە ئاییینی زەردەشتیش بۆ کوژاندنەوەی ئەم ئاگرە، هەوڵ و تەقەللایەکی زۆریان داوە، بەڵام هەرگیز لە توانایاندا نەبووە گڕی ئەم ئاگرە کپ بکەنەوە. دەڵێن ئاگری پیرۆز و هەمیشەهەڵایساوی ئەم ئاتەشکەدەیە، قەت خۆڵەمێشی دوای خۆی جێ نەهێشتووە.

خەڵکی ئەم دەوروبەرە باوەڕیان وایە، کە ئەم ساختومانە تەلیسماوییە و هیلالی زیوینی سەر گومەزی ئاتەشکەدەکەشی، نیشانەی ئەو تەلیسمەیە. هەمیشە هەوڵی دوژمنان بۆ داگیرکردنی ئەم ئاتەشکەدەیە، شکستی هێناوە. ئەوان بە مەنجەنیقی گەورە بەردیان تێ دەگرت، بەڵام بەردەکان یان دەکەوتنە ناو دەریاچەکەوە، یاخود ئەودیوی شووراکەوە. هەروەها دەڵێن، کاتێ حەزرەتی عیسا لەدایک

بووە، نێردراوەکانی پادشای ئێران بۆ پیرۆزبایی چوون بۆ بەیتول لەحم و دیارییەکانی پادشای ئێرانیان پێشکەش بە دایکی ئەم پەیامبەرەی خودا کردووە، مریەمی دایکی عیساش، توورەکەیەک خۆڵی داونەتێ.

نێردراوەکانی پادشا وتوویانە، کە مریەم پێی وتوون، "ئەم خۆڵە زۆر پیرۆزە و لە شوێنی لەدایکبوونی مەسیحەوە لەگەڵ خۆمدا هێناومە، بۆیە بیپارێزن و قەدری بزانن." بە فەرمانی شا، ئەو خۆڵە پیرۆزەیان هێناوە بۆ ئەم شوێنە و لەو ڕۆژە بەدواوە، شەوانە لەم ناوەدا ڕووناکییەکی زۆر و سەرسامکەر بینراوە و ئەم ساختومانەش بەو بۆنەیەوە لێرەدا بینا کراوە. بەڵێ، ئێرە ئاتەشکەدەی هەمیشە داگیرساوی شیزە، کە بەردەوام ڕووناکی و گەرمیی بۆ مەملەکەتەکانی تر ناردووە و ڕۆحی فەرمانڕەوایانی بە سەفا و خۆپارێزی و دادپەروەری ڕازاندۆتەوە.

لە سای فراوانیی زانین و ڕووناکیی ڕۆژگاری ئاهوراییەوە بوو، کە لە هەرجێیەک سرووش دەبینرا. لەناو دڵتاندا ئاگری عەشق بکەنەوە! بچنە سەروو زەوییەوە. بە ڕووناکی دەسنوێژ بگرن و نوێژی نوور بخوێنن، تا نوورانی بن و لە تاریکی ڕزگارتان ببێت.



# جەنابی پیری موغان

حافز! جەنابی پیری موغان داڵدەی وەفایە
دەرسی حەدیسی عەشق لای ئەو بخوێنە و ببیسە

دونیایەکی پڕخرۆش بوو و بڵێسەکانی ئاگرەکە وانەی هەڵکشانیان دەوتەوە. نزا و پەرستنی موغ و موغە بچووکەکان و پیاوان و ژنان، لەنێو بێگەردیی زانین و پاکژیدا، جیلوەیەکی تری هەبوو. ئەمیش کە تاقە موسڵمانی ئەم دیمەنە شکۆدارە بوو، لە سووچێکدا دانیشتبوو و لە پاکبوونەوەی ڕۆحی خەڵکی ئەم سەرزەمینە ئاهوراییەی دەڕوانی.

موغەکە، دوای نزاکردن، هاتە لای. دەستی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی. بە داڵانێکدا ڕۆیشتن، لە کۆتاییی داڵانەکەدا ژوورێک هەبوو، لەوێ بەرامبەر بەیەک دانیشتن. موغەکە، کە لێی ورد دەبۆوە، جارێک وەکوو ئاشنایەک دەیبینی و جاریکی دی وەک بێگانەیەک. ئەو نە ئاشنا بوو و نە بێگانە! موسڵمانێک بوو، لە ئاتەشگەی موغەکاندا. ڕووی کردە یەحیا و پێی وت، "نازانم کێیت، لەکوێوە هاتوویت و بۆ کوێ دەچیت، بەڵام بەبێ ئەوەی بزانم بۆ، خۆشم دەوێیت. چەند شەوێک بەر لە هاتنت بۆ ئێرە، حەزرەتی زەردەشت هاتە

خەونم. سەبارەت بە تۆ ڕای سپاردم و وتی ‹فەڕێک* لەو لاوەدا هەیە، کە بەم زووانە پەڕوباڵی لێ دەڕوێت و بەرەو دنیای باڵ دەفڕێت.› من لە خزمەتی تۆدام و چەند لێرە بمێنیتەوە، میوانی ئەم ئاتەشکەدەیەیت. منیش لێرە دەمێنمەوە و هەرچییەکت بوێت و بتوانم، قسەی لەسەر دەکەین."

یەحیا، لە ئاست ئەو هەموو میهرەبانییەدا، دەیتوانی چی بڵێت؟ ئەو کەشە ڕۆحییەی باڵی بەسەر ئەو نێوەدا کێشابوو، ئەوی بێخود کردبوو. بە شەرمێکەوە لە ئاستی ئەو میهرەبانییە زۆرەدا وتی، "من قوتابییەکی لاوم. هەندێ وانەی کەمم خوێندووە، ئەدەبیاتی عەرەب، مەنتیق، کەلام و فەلسەفەی سروشتی و لاهوت و ماتماتیک و بڕێک فیقهـ و تەفسیر. بەڵام هەموو ئەوانەی خوێندوومن، منیان قاییل نەکردووە. ڕاستە من لاوم و لە سەرەتای ژیان و کاردام، بەڵام قەوارەی ئەو زانینە بە جۆرێک نابینم، کە ساڵانێک بۆ فێربوونیان تەرخان بکەم. بۆ نموونە، مەنتیق کۆمەڵێک مەسەلەی سنوورداری گرتۆتە خۆ و پەیڕەوی لە هەندێ بنچینە و بنەمای قبوڵکراو دەکات. من ئەگەر پەنجا ساڵی تریش خەریکی خوێندنی مەنتیق بم، ناچارم هەمان ئەو شتانە دووپات بکەمەوە. تاقە شتێک کە دڵ خۆش دەکات، ئەوەیە کە هەمان بابەت جارێک لە نووسینەکانی غەزالیدا دەیخوێنیتەوە و جارێکی تر

---

* لە ئایینی زەردەشتیدا، *فەڕ* حەقیقەتێکی یەزدانی و چلۆنایەتییەکی ڕۆحییە، کە ئەگەر بوو بە نسیبی کەسێک، بەرەو شکۆداری و مەزنایەتی و قۆناغی پیرۆزی و گەورەیی ڕۆحیی دەبات و بە واتایەکی دی، دەبێتە خاوەن توانا و بلیمەتی و خوڕەم و بەختەوەری.
بۆ لێکدانەوەی ئەم زاراوەیە، سوود لە *فرهنگ فارسی*، د. مهشید مشیری وەر گیراوە.





لە نووسینەکانی ئیبنوسینادا و جارێکی تریش لای سەهلان ساوی. ئەمەش دەرمانێک نییە دەردەکە چارەسەر بکات. ڕوو لە هەرکوێیەک بکەیت، سەرەنجام دەچیتەوە لای چەند کەسێک و چەند کتێبێک. ئەرستۆ، ئیبنو سینا، ئەشعەری، یان شیفا و ئیشارات. ئەگەر یەکێکیش بیەوێ قسەیەک بکات و شتێکی تازە بڵێت، لە هەزار لاوە داوای لێ دەکەن بێدەنگ بێت و تەسلیم ببێت و بگرە هەڕەشەی سزا و ئازاردانی لێ دەکەن. بۆ نموونە، ڕۆژێکیان لەناو پیرێک مامۆستای ئایینیدا وتم، ئێمە نەناسراو بە ناساندن ئاشکرا دەکەین و دەیناسێنین و باشترین ناساندنی ئێمەش، کە سنووری تەواو -*الحد التامە*، لە ڕەگەز و جیاکاری *الجنس و الفصل* پێک دێت. ئێمە چۆن ئەم جیاکارییە دیاری دەکەین؟ کاتێکیش نازانین ئەو شتە چییە، لەکوێوە دەزانین جیاکاریی تایبەت بەو چییە؟ خۆ ئەگەر دەیشیزانین، ئەوا ئەوکات پێویستی بە ناساندن نییە. وتم ئێمە چۆن و لە چ ڕێگەیەکەوە دەتوانین ئەوە قبوڵ بکەین، کە حەقیقەتی ئەسپ، هەرچییەکی هەیە، لە چوارچێوەی *گیانلەبەرێکی حیلەکەر*دا کورت بکەینەوە، کە ڕەگەز و جیاکاریی ناسێنراوی ئەوە؟ لەکوێوە بزانرێ ئەدگاری تری نییە. ئاخۆ کەسێک کە نازانێ ئەسپ چییە، بەم پێناسەیە، واتە بە بیستنی هەردوو وشەی گیانلەبەرێکی حیلەکەر، ئیدی دەزانێ ئەسپ چییە؟ یان کەسێک کە مرۆڤ نەناسێت، بە بیستنی دوو وشەی *گیانلەبەرێکی بیرکەرەوە* ئیتر دەیناسێت؟ من کە بیر دەکەمەوە، باوکم کە منی گەورە کردووە، بەتەواوی من ناناسێت و بەو دوو وشەیەش، بۆ ناسینی من، هیچی دەست ناکەوێ، چ جای ئەوەی ئەگەر

بوونەوەری تر هەبن و مرۆڤیان نەبینیبێت، ئاخۆ بەو دوو وشەیە دەتوانن بیناسن؟ کاتێ ئەمەم وت، هەموو لێم تووڕە و دەهری بوون و وتیان بچکۆل، یانی تۆ دەتەوێ بڵێیت کە ئیبنو سینا تێناگات؟ گەمژەی دێوانە، تۆ خۆت لە فارابی و ئەبوعەلی بە ئاقڵتر دەزانیت؟

گەرموگوڕیی دانیشتنەکەیان وای کردبوو، یەحیا دەردەدڵیی خۆی بکات. تاوێک بێدەنگ بوو، وەک ئەوەی سەرنجی دابێت، کە بە جەسارەتەوە دواوە و زۆریشی وتووە. بۆیە بە شەرمێکەوە وتی،

"ببوورن، جەسارەتم کرد، ببوورن!"

"نا، تکایە، کوڕم! دنیا وەهایە و مەردومی ئەم دنیایەش بەو چەشنەی تۆ دەیڵێیت، وا تەسکبین و دەمارگیرن. ئەمە حاڵی زاناکانە، نەخاسمە خەڵکی عەوام. گەرچی جاری وایە زاناکانیش زۆر لە عەوامەکان عەوامتر و کەللەڕەقترن. کوڕم! بۆ هەرکوێیەک بچیت، ئاسمان هەمان ڕەنگە. زاناکانی ئێمەش سەختگیرن، تەنانەت لەگەڵ ئێمەشدا. بەڵام چونکە ئێزەدی دادوەر سروشتێکی لە ڕووناکی داوەتێ و فەڕی پێ بەخشیوە، لە گرفت و کێشە ناترسێ و لە مشتومڕیدا لەگەڵ خراپەکاران و چەپەڵیدا، بە سەرکەوتوویی و سەربەرزییەوە دەر دەچێت. تۆش ئەی لاوە بەختباشەکە، هەرکەسێ بیت و لە هەرکوێیەکەوە هاتبیت و سەر بە هەر دین و میللەتێک بیت، بەلای منەوە گرنگ نییە. بەلای منەوە ئەوە گرنگە، کە خاوەن سروشتێکی پاک و فەڕێکی ئێزەدییت! ئەم فەڕەش سەرچاوەی ڕەندیی ڕاستەقینە و دانایی و توانایە. هەموو کەسە گەورە ڕاستەقینەکان و فەرمانڕەوا مەزنەکان، هێزی





خۆیان لەو فەڕەوە وەر گرتووە. من لەمڕۆ بەدواوە، ڕۆژی دوو جار، واتە بەیانییان و عەسران، لەگەڵتدا دادەنیشم و هەموو ئەو شتانەی کەسە مەزنەکانی ئێران، سینەبەسینە و دەفتەربەدەفتەر فێری ئێمەیان کردووە، منیش فێری تۆی دەکەم. بەڵکوو بە کارت بێت. بەم پێشنیارە ڕازیت؟"

یەحیا بە شەوقەوە وتی، "ڕۆحم بەقوربانت بێت، من کە لە شار و دیاری خۆم ئاوارە بووم و ماڵوحاڵم جێ هێشتووە و خۆم ڕووبەڕووی مەترسی کردۆتەوە، مەگەر لەپێناوی چیدا بووە؟ سوپاس بۆ خوا، خانوو و ژیانی خۆم و دایک و باوکێکی بەڕێز و میهرەبانم هەبوو. نە لە نانم کەم بوو و نە لە جلوبەرگ، ئێستا کە بەم پۆشاکەی بەرمەوە لە ڕووتەڵەیەک دەچم، خۆم پێم خۆشە وا بم، نەک لە ناچاریدا وام کردبێت. هەر لەو پێناوەشدایە، کە دەیان کۆسپ و تەگەرەم تێپەڕاندووە، مەگەر من چیم دەوێت؟ من تینووی زانینم، تینووی فێربوونی شتی تازە، هیی ئیلهامی نوێ و نەگوتراو. بێزارم لە دەمارگیری و کەللەڕەقی و دووبارەکردنەوە و قانعبوون بەوەی دەیزانم و دڵخۆشبوون بەوەی لە دۆخێکدا بمێنمەوە. دوای ئەوەی لە ئێوەوە فێر دەبم، سەرلەنوێ درێژە بە گەشتەکەم دەدەم و ڕوو لە شوێنانی تر دەکەم. ژیان زۆر لەوە کورتترە، کە ئینسان بەفیڕۆی بدات."

موغەکە لە خۆشییاندا نەیدەزانی بڵێ چی. یەحیای لە خۆی نزیک کردەوە و ماچێکی تەوێڵی کرد و وتی، "لەگەڵ کەسدا باسی کاروباری ئێرەی خۆت مەکە! ئەگینا یەکێک دەڵێت ئەم پیرەمێردە دەیەوێ ئەو لاوە لەسەر دینی خۆی هەڵگەڕێنێتەوە و بیخاتە سەر دینی گاور، یان یەکێکی تر

دەڵێت، ڕەنگە ئەم لاوە لەلایەن میرێکەوە نێردرابێ، تا ئەم پیرە بکات بە ئیسلام و پاشان ئەویش هەموو مەجووسەکان لە دین وەر گێڕێت. ئەو ماوەیەی لێرە دەمێنیتەوە، بەناسراوی بمێنەرەوە و هەرکاتێکیش ویستت بڕۆیت، ڕێی خۆت بگرە بەر و بڕۆ! ئێستایش با دەست بە کاری خۆمان بکەین. ئەوەی کە پێتی دەڵێمەوە، بە زەینی خۆتی بسپێرە و پاشان کە بەتەنیا بوویت، بینووسەرەوە! بەر لە هەموو شتێک، ئەوە بزانە کە مەبەستی من لەم کارە هیچ نییە، جگە لە خزمەتکردن بە زانست و زانینەکانی ئینسان و مرۆڤایەتی. من بە تۆدا ڕادەبینم هەوڵ بدەیت ئەم زانست و زانینانە بیووژێنیتەوە. هەر بەو هیوایەشەوە ئەو شتە نەگوتراوانەت بۆ باس دەکەم، کە تایبەتن بە موغەکان و مۆبەدە* پلە بالاکان. پاشان من مەبەستم لەم کارە ئەوە نییە بەرگری لە قەومێک بکەم و ڕابردووی زیندوو بکەمەوە. نەخێر، هەرگیز! ئەمە کارێکی جاهیلانەیە و بەدرێژاییی مێژووش، بووەتە مایەی شەڕ و ڕقەبەرایەتی. ئەوە لە کەسانی دانا ناوەشێتەوە، کە بەرگری لە دەمارگیریی قەومی بکات. مەبەستی من ئەوەیە، کە شەجەرەی ڕەچەڵەک و بنەچەیەکی پیرۆز ئافەرۆز نەکرێ و دەسکەوتەکانی زنجیرەیەکی مەزنی ئاهوراییانی ئەم سەرزەمینی نوور و ئیشراق و ئیلهامە بە فەرامۆشی نەسپێردرێ. دەزانیت کە لەناو ئایین و میللەتە جیاوازەکاندا، قسە لەسەر زاتی خودا و سیفەتەکانی کراوە؟"

"بەڵێ، لەناو بیرمەندانی ئیسلامیشدا، ئەم جۆرە قسە و گفتوگۆیانە هەیە."

* مۆبەد: زانای ڕۆحانیی زەردەشتی.





"زۆر باشە! دەزانیت خودا وەکوو سەرەتای بوون و قیامەت و کۆتایی باس دەکرێ؟ واتە خواوەند خولقێنەری جیهانی بوونە و بەڕێوەی دەبات و حاکمی ڕۆژی هەڵسانەوەشە؟"

"بەڵێ!"

"لە فەلسەفەدا، سەرچاوەی جیهان بوونە و وەهاش وەسف دەکرێ، کە خۆی پێویستە و پێویستی بە هیچیش نییە. ئێستاش سەرنج بدە، کە لە حیکمەتی خوسرەوانیدا* سەرچاوەی جیهان *مینوی پاکە*، مینووش واتە ئەقڵ، لەم حیکمەتەدا، جیهان لە *ڕووناکیی سەرشار* و *ڕۆح* و *ئەقڵەوە* پەیدا بووە و ئەدگاری دیاری سەرەتا و سەرچاوەی جیهانیش داناییە. ئاهورامەزدا، واتە دانایی مەزن."

"حیکمەتی خوسرەوانی، باوەڕی بە یەکتاپەرستی هەیە یان دووانەپەرستی؟"

"لە حیکمەتی خوسرەوانیدا، یەکتاپەرستی بنەمایەکی حاشاهەڵنەگرە. لە ئایینی زەردەشتدا، بە پێچەوانەی ئەوەی باوە و نەیارانی ئەم دینە دەیخەنە پاڵی، چەندخودایی یان دووانەپەرستی بوونی نییە. ئاهورامەزدا تاقە خودایە، خودایەکی دادوەر و میهرەبان. تاقە خولقێنەر و فەرمانڕەوای جیهان. ئێرانییەکان هەر لە ڕۆژگاری دێرینەوە، لە ڕێی ڕێنماییەکانی ئاشو زەردەشتەوە گەیشتبوونە باوەڕهێنان بە یەکتاپەرستی و یەکتاناسی. فریشتەکان، کە لە ڕووی مەجازەوە پێیان دەوتن ئێزەدەکان، هەرگیز شەریک و هاوشانی ئاهورامەزدا نین، بۆیە لە گاتاکانیشدا بوونیان نییە. لە گاتاکاندا خولقێنەر لە دیدی ئایینی زەردەشتەوە تاک و تەنیا و بێ سەرەتا و کۆتاییە. خولقێنەری

* دانایی شاهانە، کە مەبەست لێی دانایی زەردەشتییە.

جیهانی ماددی و مینوویی و ڕێکخەریانە. توانایەکی بێهاوتای هەیە، کە بە هۆی زانستی بێسنووریەوە ئاگاداری هەموو شتە نهێنی و ئاشکراکانی جیهانە. فەیلەسووفێکی بەناوبانگی وەکوو فیتاگۆرس، ئیلهامی لە ڕێنماییەکانی زەردەشتەوە وەر گرتووە. گەرچی لەناو تاقمە زەردەشتییەکاندا هەندێ لادان دەبینینەوە لەو ڕێنماییە ئەسڵییانەی زەردەشت، بەڵام ئەو لادانانە پەیوەندییان بەو تاقمانە خۆیانەوە هەیە، نەک بە ڕێنماییەکانی زەردەشت و حیکمەتی خوسرەوانییەوە. میهر، یان میترا، کە هەندێ جار بە جیا دەپەرستریێ، نێوانگیرێکە لەبەینی خولقێنەر و ئافەریدەکاندا. پارێزەری ئەو گفت و بەڵێن و ڕەمزەیە، کە بە گوێرەی پەیمانی ئەلستی لەنێوان خولقێنەر و مەخلووقدایە. بۆیە بە ناوی ئەم ئیزەدە و ئەم فریشتە گەورەیەوە ئاتەشکەدە و نزایان دامەزراند. ئەو فریشتەی نوور و ڕۆشناییە و هیچ شتێک لای ئەو شاراوە نییە. شوێنی میهر، سەروو کێوی *هەرا*یە. ئەوێ نە ڕۆژە و نە شەو، نە تاریکی و نە پیسی. خۆریش یەکێکە لە نیشانەکانی ئەو، کە جێی ستاییشی زەردەشتییەکانە. پادشای ڕۆژی ڕووناکی خەڵکی گێتی، دەدرەوشێتەوە، تا بە درەوشانەوەکەی و ڕووناکییەکەی، ئافەریدەکان پاک ببنەوە و لەو پیسوپۆخڵییەی ئەو دێوانەی* بە ڕەگەز دەچنەوە سەر شەو، بەرهەمی دەهێنن و ڕزگاریان ببێت."

موغەکە تاوێک بێدەنگ بوو، ئینجا وتی، "کاتی ئەوە هاتووە، کەمێک پشوو بدەیت. بڕۆ بەلای نانخواردن و نوێژەکەتەوە، عەسر هەر لێرە دەتبینمەوە."

---

* دێو: هەموو ئەو بوونەوەر و ئافەریدانەی هاوکاری ئەهریمەنن.



# یەك ئاقار و دوو قیبلە

من موسڵمانم
قیبلەم گوڵەباخێکە
بەرماڵم کانییە، بەردەمۆرم ڕووناکییە
دەشت، فەرشی نوێژمە!

دەریاچەکە ئارام ئارام بوو و جووڵەی لێ بەدی نەدەکرا. ڕەنگدانەوەی شینایی ئاسمان، جوانییەکەی کردبوو بە دوو ئەوەندە و شکۆیەکی تایبەتیی بەو دەوروبەرە بەخشیبوو. یەحیا بەدەوری دەریاچەکەدا پیاسەی دەکرد. لای موغەکە گەڕابۆوە و هێشتا لەژێر کاریگەریی قسەکانی ئەو ڕزگاری نەبووبوو، نەک لەبەر ئەوەی موغەکە شتێکی بۆ ئەو پێ بووبێت، بەڵکوو هەستی دەکرد ئەو قسانەی ئەو کردنی، لەو قسانە نەدەچوون کە بیستبوونی و خوێندبوونی. خۆرەکە وردەوردە دەچووە ناوەڕاستی ئاسمان. لای دەریاچەکەوە دانیشت و دەستی کرد بە ئاوەکەدا. فێنکیی خۆشی ئاوە سازگارەکە، ئەوی بەرەو دونیایەکی دی برد. ئەوێ چەند دڵڕفێن و بەشکۆ بوو! نیگەرانییەکی ناڕوون، چنگی لە دڵی گیرکردبوو.

یەحیا نەیدەزانی بۆچی و چۆن گەیشتۆتە ئەو شوێنە. لە دڵی خۆیدا وتی، نەکا کەوتبێتە داوی شەیتانەوە؟ ئاخر دوای ئەو هەموو ساڵە لە خوێندن و قوتابێتیی زانا گەورەکانی ئیسلام،

بەلایەوە شتێکی مەنتیقی نەبوو، کە بێت بۆ ناو مەڵبەندێکی مەجوسی و بە قسەکانی موغێک سەرسام ببێت. دوودڵی خەریک بوو ڕۆحی دەخوارد، هەرچی زووترە، دەبێ ئەوێ جێبهێڵێت. دەنگی بانگێک لە لادێیەکی نزیکەوە ئەوی هێنایەوە سەرخۆی. هێشتا دەستی لەنێو ئاوەکەدا بوو، دەسنوێژی گرت و هەستا. تازە لە نوێژ بووبۆوە، کە هەستی بە دەستێک کرد، کەوتە سەر شانی. جلی خزمەتکارانی ئاتەشکەدەکەی پۆشیبوو.

"بینیمیت تەنیایت، نەمویست لێتان تێک بدەم. هاتووم پێتان بڵێم، کە بۆ نانی نیوەڕۆ چاوەڕێتانم."

کابراکە دەستی بۆ خانوویەکی گڵی نزیک ئاتەشکەدەکە درێژ کرد و ڕۆیشت.

یەحیا هەڵسا و بەدوای خزمەتکارەکەدا چوو، تا گەیشتنە ناو خانووەکە. دووکەڵی تەنوورەکە، دیوارەکانی ڕەش کردبوو و بنمیچە دارینە نزمەکەشی، بنیادەمی ناچار دەکرد دابنەوێتەوە.

"بەخێر بێن! ئێرەماڵی خۆتانە. موغی سەروەرم شانازیی میوانداریێتیی ئێوەی بە من داوە، تا ئەو کاتەی لێرە دەمێنیتەوە. هەرچییەکتان ویست، بە من بڵێن، ئەو ژووورە بچووکەی تەنیشتیش، شوێنی خەوتنتانە."

یەحیا سوپاسی کرد. خزمەتکارەکە ڕۆیشت و خولەکێک تێپەڕی. یەحیا لای پەنجەرەکەوە ڕاوەستابوو، کە دەنگی کردنەوەی دەرگاکە هات و ئاوڕی دایەوە، سەیری کرد کچێک بە سینییەکەوە خۆی کرد بە ژووردا. سڵاوی کرد و سینییەکەی لەسەر ئەرزەکە دانا. یەحیا لای سینییەکەوە دانیشت.

"هیچتان پێویست نییە؟"





یەحیا سوپاسی کرد و کچەکە چووە دەرێ. دەنگی خزمەتکارەکە لە دەرەوە هات، "سیندوخت! بیرت نەچێت کە سینییەکەت هەڵگرت، بالیفێک بدەیت بە میوانەکەمان، تا کەمێک بحەوێتەوە."

یەحیا لە ژووورە بچووکەکەی تەنیشت خانووەکە ڕاکشابوو، چاوی بڕیبووە بنمیچە دووکەڵگرتووەکە. هەستێکی سەیر دای گرتبوو. هەوڵی دەدا قسەکانی موغەکە بهێنێتەوە یادی خۆی، بەڵام مێشکی هەر بەلای شتێکی تردا دەڕۆیی، شتێک، کە نەیدەویست باوەڕ بکات بەوەی بیری لێ دەکاتەوە: سیندوخت!

بیری لە منالیی خۆی کردەوە. ئەو دەمانەی منالان لە یارییەکانیاندا زوهرەی دراوسێیان کردبوو بە دەزگیرانی ئەو و ئیتر ئەوە بوو، ئەو دووانە تا ماوەیەکی زۆر کە سەیری یەکترییان دەکرد، شەرمیان لەیەک دەکرد، بەڵام ساڵانێک دواتر کە زوهرەیان بە شوو دا بە زەڕەنگەرێکی گەڕۆک، خەمێکی پەنهان نیشتە سەر دڵی. سیندوخت زوهرەی دەهێنایەوە یادی.

سەیر بوو، هەرچییەکی دەکرد بۆ ئەوەی ئەو کچەی بیر بچێتەوە و وێنەی لە زەین و خەیاڵی خۆیدا بسڕێتەوە، نەیدەتوانی. هەستی کرد ناتوانێ بەو حاڵەوە لە ژوورەکەدا بمێنێتەوە. بێئۆقرەیی وای لێ کرد، هەستێت و بچێتە دەرەوە. ویستی بەرەو ئاتەشکەدەکە بڕوات، لەو کاتەدا دەنگێکی ناسک، کە لە هەناسەی فریشتەکان دەچوو، وتی، "بۆ کەمێک پشوو نادەیت؟ پەلەی چیتە؟"

یەحیا گەڕایەوە دواوە، بەڵێ سیندوخت بوو، یەحیا لە وەڵامدا وتی، "پشووم دا، دەگەڕێمەوە، خواحافیز."

"خواحافیز."

یەحیا هەموو شتێکی لەبیر چووبۆوە و بەتەنها بیری لەو وتوویژەی نێوانیان دەکردەوە. هێشتا نەبووبوو بە عەسر، چوو بۆ لای حەوزەکە و دەسنوێژی گرت، بۆ هەمان ئەو جێیە ڕۆیشتەوە، کە نوێژی نیوەڕۆی تیا کردبوو. بانگی نوێژی عەسر لە دوورەوە بەرز بۆوە. نوێژەکەی کرد و گەڕایەوە، تا موغەکە ببینێت. چووە ناوە ئاتەشکەدەکە. ئاتەشدانەکەی بینی، بەڵام نەیدەزانی لەو هەشت دەرگا و چەندین ژووری هەشت گۆشەیەوە، موغەکە لە کامیاندا دانیشتووە. بیری دەکردەوە و بەدوای ڕێگەیەکدا دەگەڕا، کاتێ موغەکە بانگی کرد، "یەحیا! من لێرەم. بڕۆ بۆ ژوورەکەی دەستەڕاستت، ئێستا منیش دێم بۆ ئەوێ."

یەحیا چووە ئەو ژوورە و لەوێ چاوەڕوان بوو. موغەکە هات و دانیشت و گفتوگۆ دەستی پێ کرد، "بەسەرهاتی ئازادبوونی ڕۆح، بەسەرهاتێکی سەیروسەمەرەیە. هەرچۆن ڕەمز و ڕازی گیرۆدەبوون لەناو زیندانی گێتیدا نهێنییەکە بۆ خۆی. ئەوەی بەڵگەنەویستە، ئەوەیە کە ئازادی پێوستی بە هەوڵ و تەقەللایە. مەگەر هەندێ حاڵەتی ئاوارتە نەبێت، وەکوو ئەوەی زاڵ و مووسا و عیسا، کە هەر لە منالییەوە، لەبەر ئەوەی خاوەن فەڕێکی بەهێز بوون، لەپەنا فریشتەکاندا بوون. دەنا دەستگەیشتن بە ڕۆچنەیەک بۆ جیهانی مینوویی و گەیشتن بە ڕووناکبوونەوە و ئیلهام، پێویستی بە هەوڵ و تەقەللا و مەشق و ڕاهێنانی ڕۆحە. زەردەشت خۆی لە تەمەنی سی ساڵیدا ڕۆی بۆ کێوی سەهۆڵان و چووە خەڵوەتەوە، تا سەرەنجام ئیلهام و سرووشی بەدەست هێنا."

"ئێوە باس لە جۆرە زانینێکی تر دەکەن. لەو جۆرەی





زانین، کە سۆفی و عارفەکانی ئیسلام لافی لێ دەدەن. بەڵام چۆن دەتوانین باوەڕ بە ڕاستی و دروستیی ئەم جۆرە زانینە بکەین و متمانەی پێ بکەین؟"

"کوڕم، کاتێک زانینی مەزەنەیی* دێتە ئاراوە، مەسەلەی باوەڕپێکرن نامێنێت. ئەم جۆرە قسانە، واتە کفر و ئیمان، باوەڕداری و بێباوەڕی، پەیوەستن بە جیهانی خودئاگامەندییەوە. لە جیهانی خودئاگامەندیدا، مەودا هەیە لەنێوان ئاگامەندی و ڕاستیدا. لێرەوەیە، کە ئینسان دەتوانێ باوەڕ بکات یان باوەڕ نەکات. لە هەلومەرجێکی وەهادایە، کە هەریەکە لە کفر و دین، کڕیاری خۆیان پەیدا دەکەن. ئەمیان دەڵێت و باوەڕ دەکات بەوەی خودا هەیە و ئەوی تریش باوەڕ دەکات بەوەی خودا نییە. هەم دروستبوونی جیهان دەبێتە قابیلی بەرگریلێکردن و هەم کۆنیی جیهان! یەکێک دەڵێت، جیهان سەرەتای نییە و یەکێکی تر دەڵێت سەرەتای هەیە. بەڵام وەختێ لە ئەنجامی فەڕی ئیزەدییەوە، ئینسان دەبێتە خاوەنی بینینی دەروونی (یان بینین بە چاوی ناخ) و ڕاستەوخۆ بە هەقیقەت دەگات، ئیدی شتێک نامێنێتەوە بۆ کفر و ئیمان و باوەڕ و بێباوەڕی، چونکە ئەو زانینە، خۆی دەبێتە زانراو، نەک خەبەر لە زانراو بدات یان داوەریی لەبارەوە بکات. ئەو زانینە زانست نییە، بینینە. ئاگامەندی دەبێتە خودی ڕاستی خۆی، نەک شتێک، کە لەگەڵ ڕاستیدا مەودای هەبێت."

موغەکە هەستی کرد یەحیا زۆر ئارام نییە. وەک ئەوەی لە شتێک نیگەران بێت یان چاوەڕێی ڕوودانی شتێک بێت.

---

* مەزەنەیی: بە فارسی *شهودیییە* و بە عەرەبی حدسي و بە ئینگلیزیش *Intuition*.

باسەکەی تەواو کرد و وتی، "بۆ ئەمڕۆ، ئەمەندە بەسە. پێدەچێ هەست بە غەریبی بکەیت؟ هەقی خۆتە! گەرچی لێرەوە تا سوهرەوەرد ماوەیەکی زۆر نییە، بەڵام تۆ تا ئێستا بۆ ئێرە نەهاتوویت و نەماویتەتەوە و کەس ناناسیت! هەقتە. بڕۆ بۆ خۆت کەمێک بگەڕێ و هەندێ شوێن ببینە. هەوا سارد بووە، ئاگات لە خۆت بێت، سەرمات نەبێت و شەو زوو بگەڕێرەوە بۆ ئەو شوێنەی نیوەڕۆ لێی مایتەوە. ئەو شوێنە سەر بەم ئاتەشکەدەیە. تۆ میوانی ئێمەیت. ئەو پیاوەی میوانداریت دەکات، ناوی جاماسبە، موغێکی ئینساندۆستە و خۆی و خێزانەکەی هەر لە سەرەتاوە خزمەتی ئەم ئاتەشکەدەیەیان کردووە. کچەکەی یەکێکە لە پاسەوانانی ئاگری پیرۆزی ئەم پەرستگەیە. ئەو کچە، تا بڵێی، ژیر و بینایە. پێشبینیی گەلێ شت دەکات بەر لە ڕوودانیان. ناخی زیارەتکەرەکان دەخوێنێتەوە. هەندێ جار پێشبینیی ئایینەدەشیان دەکات! سەیرە! فەرێکی بەشکۆیە، کە هەر لە ئێستەوە کارەکانی دیارن. ناوی مەهەستی بوو، من ناوم نا سیندوخت. *سێن* هەم ناوی سیمورغ و هەم ناوی پارسایەکە، کە بە ڕووناکی گەیشتووە."

یەحیا بە ڕێزەوە موغەکەی جێ هێشت، هەستی کرد لە گشت کاتێک سافتر و سووکەڵەترە. دەتوت شتێکی نوێی بۆ کەشف بووە. گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی، سەری دانەواندبوو و نیگەران بوو. پتر لە هەموو شتێک، بیری لەو قسانە دەکردەوە، کە موغەکە سەبارەت بە سیندوخت وتبوونی. ئەو ئاگاداربوونەی سیندوخت لە ناخ و دەروونی خەڵکی، لە سەرێکەوە مایەی نیگەرانیی ئەم بوو و لە سەرێکی تریشەوە مایەی خۆشحاڵی. نیگەران لەوەی سیندوخت ئەم ئەڤینەی بە جۆرێک لە





بینەزاکەتی لەقەڵەم بدات؛ خۆشحاڵیش لەوەی هەموو عاشقێک عادەتەن پێویستی بە ماوەیەک دەبێت، تا لە خۆشەویستەکەی بگەیەنێت، کە خۆشی دەوێت و ئۆقرەی لەبەر براوە. بەڵام لەبەر ئەوەی سیندوخت دڵ و ناخ دەخوێنێتەوە، کەواتە ئێستا ئەو خۆی دەزانێ ئەم خۆشی دەوێت. هەر سەری دانەواندبوو و بەشێنەیی هەنگاوی دەنا، کە یەکێک لەدواوە پێی وت، "بۆ کوێ؟ دەڵێی خانووەکەت لێ تێک چووە؟ ناهەقت نییە، ئەم چەند خانووە لەیەک دەچن. زۆر کەس لێیان تێک دەچێت. فەرموون، ئێرەیە، فەرموون."

یەحیا بیست-سێ پێیەک زیاتر ڕۆیشتبوو. گەڕایەوە بۆ دواوە و سیندوختی بینی، کە بە چەشنی سرووشێکی غەیبی، جوان و بەشکۆ، بەسەر ئاسۆی ئیلهام و ڕێنوێنییەوە ڕاوەستابوو. ئەم نەیتوانی بجووڵێت. لە شوێنی خۆیدا ڕاوەستا. سەری بەرز کردەوە و نیگایەکی سیندوختی کرد. دووبارە سەری دانەواندەوە و دوای سیندوخت کەوت.

چووە ژوورەوە. چیلکەوچەواڵیان لای ئاگردانەکەوە دانابوو. پاش کەمێک، جاماسب خۆی کرد بە ژووردا.

"پاشنیوەڕۆت باش، میوانی ئازیز. هەوا کەمێک سارد بووە. وریا بە سەرمات نەبێت. ئێستا ئاگردانەکە دادەگیرسێنم."

ئینجا بەرەو لای ئاگرادنەکە چوو. تۆزێک دەوەنی وشکەوەبووی خستە لای دارەکانەوە و ئاگرێکی تێ بەر دا. چیلەکەکان گڕیان گرت و پاشان وردەوردە دارەکان، تا ئاگردانەکە ڕووناک بۆوە. ئینجا بە یەحیای وت، "هەرکاتێ ئاگرەکە کپ بۆوە و سەرمات بوو، یەکێک لەو دارانە بخەرە ناو ئاگردانەکەوە، تا گەرمت بێتەوە. وا باشترە ئێتر پشوویەک بدەیت."

خواحافیزیی کرد و چووە دەرەوە. یەحیا بە ڕێزەوە لەبەری هەڵسا و پاشان دەستی دایە خورجینەکەی و لای ئاگردانەکەوە، لەسەر کلیمێک دانیشت.

هێشتا دنیا تاریک نەبووبوو. هەندێ لە قسەکانی موغەکەی نووسییەوە، بەڵام چەند هەوڵی دا، نەیتوانی سیندوخت لە مێشکی خۆی دەر بکات. خۆر ئاوا بوو، چووە دەرەوە، دەسنوێژی گرت و گەڕایەوە. دارێکی خستە ناو ئاگردانەکەوە و خۆی گەرم کردەوە. پاشان هەستا تا نوێژەکەی بکات! سوبحانەڵڵا! ویستی ئاڕاستەی قیبلە بدۆزێتەوە، "بەڵێ، بەم ئاڕاستەیەیە. بەڵام ئاتەشکەدەکەش هەر بەم ئاڕاستەیەیە. دەی، قەیچێکا، من چ کارم بەوەیە." لە کاتێکدا نوێژەکەی دادەبەست، جگە لە خوا و قیبلە، دوو شتی تریش لە مێشکی دەر نەدەچوون، یەکێکیان خەیاڵی سیندوخت و ئەی تریشیان وەسوەسەی نوێژکردن بەرەو ڕووی ئاتەشکەدەکە!

نوێژەکەی کرد، بەڵام ئەزموونێکی دژوار بوو:

دڵ لای دوو دڵبەر.

ڕوو لە دوو قیبلە.

ڕەنگە ئەمەش یەکێک بێت لە شتە سەیروسەمەرە زۆرەکانی ڕێگەی عەشق! قەلەندەرانی خۆشبەخت، لە قۆناغەکانی ڕەوتیاندا دەتوانن زیکری ستاییشی فریشتەکانیان لە ئەڵقەی زوننارەکانیاندا هەڵبگرن! خودایا، بە ئومێدی تۆ!



# ڕازی نیگا

پارسایەک لەوێیە کە پێت ئەڵێ:
"باشترین شت گەیشتنە بە نیگایێ
کە بە ڕووداوی عەشق تەڕ بووبێ."

نوێژی مەغریبی کردبوو و خەریکی خوێندنەوەی قورئان بوو.

جاماسب هەندێ نان و هێلکەی بۆ شێو هێنا و یەحیا لەسەر سفرەکە دانیشت. دوای شێو، هاتە دەرەوە و بۆ ماوەی کاژێرێک لە حەوشەکەدا مایەوە و لە ئاسمان و ئەستێرەکان ڕاما. دەسنوێژی تازە کردەوە و گەڕایەوە. تۆفانێک لە ناخیدا بەرپا بووبوو. پاش نوێژی خەوتنان، دانیشت و چەند ئایەتێکی لە قورئان خوێندەوە.

ماندوویێتی بەسەریدا زاڵ بوو و دەستی دایە بالیفێک تا...

جاماسب بەنیازی پێچانەوەی سفرەکە هات، "کوڕم، هیچت ناوێت؟ ژوورەکە سارد نییە؟"

"نەخێر، سوپاسگوزارم."

"شەو شاد."

یەحیا مایەوەو: "ئەی بۆچی سیندوخت دیار نییە؟ تۆ بڵێی لە بێنەزاکەتییەکەم دڵی ئێشابێت؟ بۆچی هەر جاماسب دێت و دەچێت؟ ئەو خەونە یانی چی؟ من لەکوێ و

ئاتەشکەدەی موغان لەکوێ؟ من بەنیازی مەراغە بووم و کەچی ئێستا... ئاخۆ ڕێگەکە هەر خۆی لێرەوە بوو یان من ڕێم لێ وێڵ بوو؟ ئاخۆ من عاشقم یا...؟ ئەی عەشق ڕێ لە فڕینم ناگرێت؟ ئاکامی عەشقی موسڵمانێک و گاورێک بە چی دەگات؟

”ئاخۆ من لە ماڵی خانەخوێیەکی وا میهرەبان، بێنەزاکەتیم نواندووە یان چی؟ خیانەت؟ گوناه؟...“

دارێکی تری فڕێ دایە ناو ئاگرەکەوە و زیاتر لە ئاگرەکە دوور کەوتەوە. خەوی لێ نەدەکەوت. بڕیاری دا سوورەتە بچووکەکانی قورئان بەدوای یەکدا بخوێنێتەوە. سەرەتا سوورەتی قەدر، دوای ئەو: بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان، قل یا ایها الکافرون...

دەستی لەناو دەستی موغەکەدا بوو و چوونە ناو ئاتەشکەدەیەکەوە، کە ئاتەشدانێکی پیرۆزی تیا بوو. چەند کچێک پاسەوانیی ئاگرەکەیان دەکرد. سیندوخت، بەڵێ، سیندوختیش لەوێ بوو! ویستی بگەڕێتەوە، موغەکە توندتر دەستی گوشی و وتی، ”بۆ کوێ؟“

”هیچ، ویستم نەبم بە مایەی ئەرک بۆتان.“

”نا، نابیتە مایەی ئەرک... من لە ڕۆژێک زیاتر لە ئاتەشکەدە نامێنمەوە. مانەوەی زیاتری من، دەبێتە مایەی زەحمەت بۆ پەیڕەویکارانی زەردەشت. بەڵام ئەگەر تۆ بمێنیتەوە، ئەم جارە منیش دەمێنمەوە. تۆ ئەو کەسە ونبووەی من بوویت، کە دۆزیمیتەوە! تا تۆ لێم دانەبڕێیت، من لێت دانابڕێم. بەڵام ئیتر لەوە زیاتر ناچینە پێشەوە، ڕێزی ئەو شوێنە لەوە زیاتر ڕێمان پێ نادات. ڕێزی ئاگرەکە بۆ





من و ڕێزی سیندوخت بۆ تۆ...“

یەحیا لە خەو ڕاپەڕی. لەشی شەڵاڵی ئارەقەیەکی سارد بووبوو. لەکوێم؟ ئەمە چی بوو؟ خەوەکەی زڕا. هەڵدەلەرزی. سەری دەسووڕا. حەزی کرد کەسێکی ئاسایی بووایە. وەکوو هەموو ئەوانی تر، هەر خەمی نانخواردن و پۆشاکی بووایە. ئەمە چ چارەنووسێکە ئەو هەیەتی؟

بە هەرحاڵ، مەلی زیرەک، کە دەکەوێتە داوەوە، دەبێ تەحەممولی هەبێت. نابێ لە هەموو شتێک بترسم. خەو بردییەوە.

”چۆنیت؟ سەرمات نییە؟“

سیندوخت بوو، وەک هەمیشە، ئارام و میهرەبان.

”باشم!“

”نیگەران بوویت؟“

”نەخێر.“

”با، نیگەران بوویت، مەیشارەوە! بۆچی وا هەست دەکەیت بێنەزاکەت بوویت؟ تۆ کەسێکی پاکیت، نیگات پاکە. بەڵێ، نیگات ئەو ڕازە ئاشکرا دەکات. نیگات یەخسیری سروشت نەبووە، بالاییی تیا دەبینرێ، مەشڵەژێ، گەرچی شڵەژان لە ئەدگارەکانی عەشقە و عاشق ناتوانێ لێی هەڵێ. دیسان گەر شتێک هەیە ڕوون نەبێت، بپرسە!“

”نەخێر، چی بڵێم، نازانم، ڕەنگە... بەڵام.“

# ڕووناکی و تاریکی

لە خەو بێدارم مەکەوە تو بی خودا
چوون خەڵوەتێکی خۆشم لەگەڵ خەیاڵیدا هەیە

حەیرانی وەڵامەکەی سیندوخت بوو. حەزی نەدەکرد خەونە شیرینەکەی بە بێداریی بەیان بسپێرێت، بەڵام تیا مابوو و نەیدەزانی چۆن وەڵامی سیندوخت بداتەوە. ئەمە گرفتێکی خۆش بوو و گەر تیایدا گیریشی بخواردایە، هەر ئامادە بوو بەرگەی بگرێت.

خوێندنی کەڵەشێرەکان، مژدەدەری بەیان بوو. هەڵسا، تا بزانێ کات چەندە. دۆخ و هەوای ئاسمان ئاماژەی بە بەیانییەکی ڕاستەقینە دەدا. دەسنوێژی گرت، تا دوای خوێندنەوەی چەند ئایەتێکی قورئان، نوێژی بەیانی بکات. ئاگرێک لە ناخیدا جۆشی سەندبوو. پاش تەکبیرەتولئەحرام، چەند جارێک لە خوای داوا کرد لەو وەسوەسەی خەیاڵە ڕزگاری بکات، بەڵام ڕزگاری نەدەبوو.

بە دڵ نزای کرد، تا لە حوزووری خوادا تەواوی خەیاڵات و نیگەرانییەکانی بڕەوێنەوە. هەستی بە سەرمای ژوورەکە کرد. بیری چووبوو دار بخاتە ناو ئاگردانەکەوە. ئاگرەکە کپ بووبۆوە، بەڵام دەیتوانی تەحەممول بکات.

ئەوەندەی نەمابوو خۆر هەڵبێت، کە جاماسب هات.

سەرمای ژوورەکەی پێ سەیر بوو. دیارە میوانەکەیان بەقەناعەتە. خۆڵەمێشەکەی ژێرەوژوور کرد، چەند چیلکەیەکی خستە سەر پشکۆ نیوەخامۆشەکان، تا گڕیان گرت. گەرمییە تازەکە، بوونی نەوازش کرد. پێخەفەکەی کۆ کردەوە و چاوەڕێیی بەرچای بوو.

جاماسب بە نانی بەیانییەوە هات، "فەرموون."

"بوومەتە مایەی ئەزیەت بۆتان، بریا خۆم زیاتر بە شتەکانی ئێرە ئاشنا دەبووم و خۆم پێویستییەکانی خۆمم ئامادە بکردایە."

"هەرگیز بیر لە شتی وا مەکەرەوە. لەبەر ئەوەی من خۆم ئەم کارە بە چاکە دەزانم. سیندوخت لە ئاتەشکەدەکەیە، پێدەچێ سەرمای بووبێت."

***

کۆڵانەکەی بڕی. لەو کاتەوەی ئەو قسەیەی بیست و زانیی سیندوخت نەخۆشە، ئارام و قەراری لێ بڕا. دەتوت بەر لەوەی تامەزرۆی فێربوون بێت لە موغەکانەوە، تامەزرۆی بینینی سیندوخت بوو.

گەیشتە ئاتەشکەدەکە و لە ڕاڕەوەکەوە بەرەو ژوورەکە ڕۆیشت و لەوێ مایەوە و چاوەڕوان بوو. پاش کەمێک، گوێی لە سڵاو و هەواڵپرسی بوو، کە نیشانەی هاتنی پیری موغان بوو. هاتە ژوورەوە و یەحیا لە ڕووی ڕێزەوە لەبەری هەڵسا. موغەکەش بە ڕێزەوە وەڵامی دایەوە و پاشان بەبێ پێشەکی، کەوتە قسان، "کوڕم! لە ڕێنماییی موغاندا، جیهانی بوون بریتییە لە کۆمەڵێک ڕووناکی و تاریکی. تەواوی گەوهەرە





ڕووناکەکان، ئاسمانین و جەستە و ماددە ناگرنەوە و ئەمانە جیهانی *مینوو* پێک دەهێنن. بەڵام جیهانی هەستپێکراو، واتە جیهانی جەستەیی و ماددی، تاریکییە و پێی دەوترێ *گێتی*. لە هەرکوێیەک *گیان* هەبێت، ڕووناکی هەیە، بەڵام لەم نێوەدا، ئینسان تایبەتمەندییەکی هەیە، کە خاوەنی بینینە بە دیدەی ناخ و توانای بەدەستهێنانی زانینەکانی هەیە لە ڕێی مەزەنە ‹حەدس›ەوە. نەک هەر ئینسان، بەڵکوو هەموو بوونەرەکان لە *فرەوشی* بەرخوردارن، فرەوشی سیفەتێکی خودایی بوونەوەرەکانە. مرۆڤ بوونەوەرێکە، خاوەن ئیرادە و ئازادییە و سەرەنجام، خۆی چارەنووسی خۆی دیاری دەکات. جیلوە بە ناخی خۆی دەدات و بە بەرکەماڵی دەگات و پەردەکان لا دەبات.

"*بیری باش، وتەی باش، کرداری باش*" لەگەڵ نزاو وێرددا، جیلوە بە ناخی ئینسان دەبەخشن. پاداشتی مرۆڤە باشەکانیش، هەم لەم دنیایەدایە و هەم لەودنیا، بەڵام پاداشتی ئەولیا و کەسە تایبەتەکان، بەهرەمەندبوونە لە جلیوەی هەق.

"مەزدا لە ڕێی *وەهومنە*وە و لەگەڵ *خەشەبشرە* و *ئەشە*دا، لەناو گیان و جەستەی مرۆڤدا دەر دەکەوێت. گیان و جەستە هەردووکیان ڕەنگێکی خوداییان هەیە. ئەگەر گیان هەڵکشێت و باڵایی بەدەست بهێنێت، توانای جەستەش زیاد دەکات. جێگرەوەکانی خودا لەسەر زەوی کەسانێکن، کە گیان و جەستەیان بەرکەماڵ بووبێت و خودائاسایان لێ هاتبێت. مرۆڤی کامڵ لە ڕەوتی خۆیدا دەبێت بە *ئەشە* و پاشان بەرەو بەرکەماڵیی باڵاتر هەڵدەکشێت. مرۆڤە

خوداناساکان خەلیفەی خودان لەسەر زەوی و رابەری ڕواڵەت و ناوەوەی مرۆڤایەتین. سەرەنجام، سۆشیانس، ڕزگارکەری گەورە، پەیدا دەبێت و هەق دەسەلمێنێت و ناهەق تێک دەشکێنێت.

"ڕووناکیی دەروون بە هاوکاریی خواوەند و بۆچوون و پەروەردەی چاکەکاران و پاکان و کرداری باش و گوتەی باشی ڕێبواران دێتە دی. دواقسەم ئەوەیە، کە ڕێنماییەکانی حەکیمە خوسرەوانی و ئیشراقی و ئاهورییەکان، پڕن لە ئاماژە و ڕەمز. کلیلی ئەو ئاماژە و ڕەمزانە، بە کامڵبوونی ڕۆحی بەدەست دێت، نەک بە وتووێژ.

"یەکەمین ئاماژەی ڕەمزیبوونیشی ئەوەیە، کە نابێ بۆ بەدەستهێنانی، پشت بە فێربوون ببەسترێ. چونکە ئەم ڕێنماییانە لە ڕێی باس و وتووێژەوە فەراهەم نابن، بەڵکوو پێویستییان بە چێژ و بە پێگەیینە. یەحیا! زۆربەی خەڵکی سەر زەوی توانای ئەوەیان تیایە، خوداناسابن و من بەئاشکرا ئەمە لە تۆدا دەبینم! دەرفەت زۆر نییە! بۆ یەک ساتیش چییە، کەمتەرخەمی مەکە! بەر لەوەی سەرقاڵی کەسانی دی بیت، سەرقاڵی خۆت بەو لە خۆت ڕابمێنە. جامی جەم بوونی خۆتە. دەربەستی هەندێ شت مەبە و لە خەڵکی بێگانە شتێک داوا مەکە، کە خۆت شکی دەبەیت.

"ئیتر جارێ بەسە. عەسر وەرەوە بۆ لام. کاتێکی زۆرم بە دەستەوە نییە لەگەڵتدا بم. بوونی تۆ، گڕکانێکی نوورپڕژێنە. لەگەڵ خۆتدا بە، گەلێ باشترە لەوەی لەگەڵ خەڵکی تردا بیت! خودا ئاگای لێت بێت!"

هەرچەندە یەحیا دڵی گیرۆدەی ئەوێ بووبوو و





بۆ ڕۆیشتن بۆ مەراغە هیچ پەلەیەکی نەبوو و حەزی دەکرد لە شیز بمێنێتەوە و جێی نەهێڵێت، بەڵام قسەکانی موغەکە پەیامێکی تازەی پێ بوو بۆی؛ واتە ئیدی کاری تۆ لێرە تەواو بووە و برۆ! بەڵام ئاخۆ دەکرا دەستبەرداری سیندوخت ببێت؟

یەحیا هەڵسا و بەدڵشکاوی خێرا بەرەو شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە. ئەفسووسی بۆ ڕۆژانی ڕابردوو دەخوارد و دڵتەنگی ڕۆژانی داهاتوو بوو. جاماسب هاتە ژوورەوە،

"نیوەڕۆت باش، کوڕم!"

"نیوەڕۆت باش!"

"هیچت ناوێت؟ خواردنت بۆ بێنم؟"

"نەخێر، مەیلی خواردنم نییە."

"دڵتەنگیت؟ چی ڕووی داوە؟"

"هیچ. خوا یار بێت، ئیتر نابمە مایەی زەحمەت بۆتان، هەرگیز میهرەبانیتانم لەیاد ناچێت."

"بۆ کوێ دەچیت؟"

"مەراغە! بۆ خوێندن. تا دنیا سارد نەبووە، دەبێ بڕۆم، ئەگینا زستان و بەفر ڕێم لێ دەگرن."

"دەزانم، دوێنێ شەو سەروەرم ئەمەی پێ وتم. چەند کاربەدەستێکی دەسەڵات تۆیان لە ئاتەشکەدەکە بینیوە کە نوێژت کردووە و کەوتوونەتە هەندێ قسە، وەک ئەوەی بوونی موسوڵمانێک لە ئاتەشکەدەکە و میوانبوونی تۆ لای ئێمە، بووبێتە جێی پرسیار لای ئەوان. لەوانەیە تووشی دەردەسەرییەکمان بکەن. تۆ بە هەڵگەڕانەوە لە دین مەحکوم دەکەن و ئێمەش بە بەلاڕێدابردنی موسڵمانان.

شتێکە مایەی پێکەنینە، بەڵام چی دەکرێ؟ سەروەرم بەخۆڕایی قسە ناکات: ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان گەڕایتەوە و ڕێت کەوتەوە ئێرە، ئەوا بزانە کە ئێرە ماڵی خۆتە و تۆ هەمیشە ئازیزیت لامان.“ لەناکاودا سیندوخت خۆی کرد بە ژووردا و نانی نیوەڕۆی هێنا. سڵاوی کرد، بە ڕێزەوە نوشتایەوە و داوای لێبووردنی کرد، کە دوێنێ شەو لە ئاتەشکەدەکە بووە و باوکی ڕاسپاردووە خزمەتی ئەو بکات. ئینجا وتی، ”ئەمشەویش دەبێ لەوێ بم! بمبەخشە!“

گەڕایەوە.



# ئاگرە جاویدانەکەی دەروون

یەحیا نائارام بوو. نائارامییەکی نامۆ ناخی تەنیبۆوە. نەیدەتوانی پشوو بدات. لەبەر ئەوەی نوێژکردن لە ئاتەشکەدەکە ببووە مایەی دەردەسەری، بەناچاری نوێژەکەی لە ژوورەکە کرد. هاتە دەرەوە و پیاسەیەکی بە کەناری دەریاچەکەدا کرد و ئینجا بەرەو شوێنی دیاریکراوی چوو. بۆ بیستنی دواقسەکانی موغەکە، پەلەی بوو. دەیویست هەرچی زووترە، بزانێ ئاخۆ موغەکە لە کۆتاییی دیدارەکەیاندا چی دەڵێت. پیری موغان لەو دەوروبەرە نەبوو. بۆیە نەیتوانی لەو ناوە بمێنێتەوە. دواتر گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی، تا نوێژی عەسر بکات، بەڵکوو سیندوختیش ببینێت، بەڵام سیندوخت دەنگی نەبوو. وردەوردە خەریکبوو دنیا تاریک دەبوو. لە دوورەوە گوێی لە دەنگی پێی یەکێک بوو. تا دەهات، دەنگەکە نزیکتر دەبۆوە. جاماسب خۆی کرد بە ژووردا، ”یەحیا، هیچت پێویست نییە؟“

”نەخێر.“

”ئەی نەچوویتە دەرەوە؟“

”چووم، بەڵام هەواکەی سارد بوو، ئیتر هاتمەوە.“

”ئاگردانەکە داگیرسێنم؟“

”نەخێر، هەوای ژوورەکە باشە و منیش دەبێ بچم بۆ ئاتەشکەدەکە، تا خواحافیزی لە پیری موغان بکەم.“

لەم کاتەدا خزمەتکارێک خۆی کرد بە ژووردا، ئیزنی لێ وەر گرت و وتی، "جاماسب! سەروەرم دەڵێت، با لەگەڵ یەحیادا بێن بۆ ماڵی فەرەیدوون، لەوێ بیانبینم."

جاماسب بەبێ ئەوەی ڕاوێژ بە یەحیا بکات، وەڵامی دایەوە، "بەسەرچاو، ئێستا دێین."

پاشان ڕووی کردە یەحیا و وتی، "یەحیا! خۆزگە سەروەرم ئێمەشی ئەوەندەی تۆ خۆش دەویست! وا چاکە بڕۆین، با دوا نەکەوین."

"با بڕۆین."

جاماسب و یەحیا چوونە لای موغەکە. جاماسب دوودڵ بوو لەوەی ئاخۆ ئەویش بۆی هەیە لایان دابنیشێت، یان تەنها کاری ئەوە بووە، یەحیا بۆ ئەوێ ڕێنمایی بکات و دەبێ بگەڕێتەوە. فەرەیدوون سەرقاڵی خزمەتکردن بوو و دانەدەنیشت. یەحیا لای موغەکەوە دانیشت و جاماسبیش هەر دوودڵ بوو. موغ هەستی پێ کرد، ئاماژەی بۆ ئەویش کرد، تا دابنیشێت. ئینجا سەیری یەحیای کرد و وتی، "یەحیا! تۆ سبەینێ دەڕۆیت! ئەم دانیشتنە، دوادانیشتنی ئێمە دەبێت. تۆ جارێکی دیکە بێرەدا تێناپەڕیت و چیی تر من نابینیتەوە. لە وڵاتێکی تریشدا گیان دەسپێریت. لە قەڵایەکدا، کە لەم ئاتەشکەدەیە دەچێت و وا بەسەر شوێنێکی بەرزەوە، بەڵام مەرگی تۆ لەناو زیندانێکدا دەبێت. دوای مەرگیش، بە ماوەیەکی کەم، هێرش دەکرێتە سەر ئەم وڵاتەی ئێمە و ئەم ئاتەشکەدەیە خامۆش دەبێتەوە. بەڵێ، خامۆش! ئاگری ئەم ئاتەشکەدەیە خامۆش دەبێتەوە."

قوڵپی گریان لە گەروویدا تاسا بوو، بەڵام دەیویست





بەسەر خۆیدا زاڵ بێت.

"بەڵام نا، ئەم ئاگرە ئاگرێک نییە خامۆش ببێتەوە! ئەم ئاگرە لەناو دڵی خەڵکی ئاهوراییی مەملەکەتی خۆرهەڵاتدا هەمیشە داگیرساوە. ئەم ئاتەشکەدە ڕووکەشانە بەتەنها چیاوەیەکن لەو ئاگرە هەمیشەداگیرساوەی ئیزەد لەناو ناخی هەموو بوونەوەرەکاندا. ئاگری ئیزەدی خامۆش نابێتەوە و لەناو دڵە ڕۆشنی مرۆڤە پاک و ئاهوراییەکاندا، تا بێت، بڵێسە دەسەنێت.

"یەحیا! ئەگەر توانیت، لە هەموو شوێنێک باس لە ئاگر و ڕووناکی بکە. بانگەشە بۆ ئاتەشکەدە هەمیشەداگیرساوەکان بکە! یەحیا! ئەمانەی کە پێتی دەڵێم، لەیادت نەچن و بیریان لێ بکەرەوە: ڕۆحی ئەم سەرزەمینەی ئێمە، ڕۆحی عەشق و ئەوینە. تۆ دەزانیت ئایەتێک بۆ پێغەمبەری ئیسلام دابەزی و هەڕەشەی لە عەرەبەکانی مەککە و مەدینە کرد، کە ئەگەر بێت و کەمتەرخەمی بنوێنن و لە دین هەڵگەڕێنەوە، ئەوا خودا قەومێکی تر بۆ ئەم دینە ڕێنمایی دەکات، کە خۆشیانی دەوێت و ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت. یارانی پەیامبەر لێیان پرسی، کە ئەو قەومە کێن؟ حەزرەت دەستی خستە سەر شانی سەلمان و فەرمووی، ئارییەکان، کە قەومی سەلمان. خۆشەویستیی خولقێنەر و مەخلووق و هەروەها عیرفان و عەشق، لە قورئاندا بە قەومی ئەم سەرزەمینەوە پەیوەستراونەتەوە.

"یەحیا! هەروەختێ دووچاری دوودڵی بوویت و پرسیت، کە ئایا بۆ جیهانێکی تر هەیە جگە لە جیهانی هەستپێکراو؟ یان هەرکاتێ گومانت لا دروست بوو لەوەی ئاخۆ حیکمەتی

ئیشراقیی خوسرەوانی، بنچینە و بناغەیەکی پتەوی هەیە یان نا؟ لەم دوو خاڵە ورد ببەرەوە:

"یەکەمیان، ئەوەی کە ئەگەر ئەم حیکمەتە بناغەیەکی پتەو و قاییمی نەبووایە، ئەو هەموو بانگەشەکار و ڕێبوارە باسیان لە ئیشراق و ڕووناکی نەدەکرد، چونکە گەر شتێک لەئارادا نەبێت، ئەو هەموو قسە و پەیڤانە لەکوێوە سەرچاوەیان دەگرت؟ بەڵام بۆچی باوەڕ بە قسەکانی پزیشکێک یان فاڵگرەوەیەک دەکەین و ئامۆژگارییەکانیان دەچێت بە گوێماندا، کەچی باس و پەیڤەکانی کەسانێکی مەزنی وەکوو بوزورگمیهر و جاماسب و کیومەرس و هەزاران ڕێبواری گەورەی تری ئەم ڕێیە ناچێت بە گوێماندا؟ بۆچی زانست و ئەزموونی زاناکانی دی بە هەند وەر دەگرین، کەچی بەرهەمی ئەزموونی ئەم دانایانە بە هەند وەر ناگرین؟

"هەروەها ئەم ڕێیە، بانگەشەکردن نییە بۆ کۆمەڵێک شتی نادیدە و نەبینراو. ئەمە بانگەشەیەکە بۆ ئەزموونی تایبەتیی تاک و بۆ بینین بە دیدەی ناخ. هەرکەسێک گومانی هەیە، با تاقیی بکاتەوە، چەند ڕۆژێک خۆی ماندوو بکات و چەند هەنگاوێک بنێت، ئەوکات بەرهەمی کارەکەی دەبینێت. ئێمە خەڵک هان نادەین تا کوێرانە بێنە سەر ڕێگەکەمان، بەڵکو داوایان لێ دەکەین خۆیان دەستبەکار بن و ئەزموونی بکەن و ئەوەی ئێمە دەیڵێین، بە چاوی خۆیان بیبینن.

"یەحیا، بواری قسەکردنمان نییە و زۆر شتیش لە قسەکردنەوە نایەتە دی. لە کۆتاییدا ئاماژە بە شتێک دەدەم، کە بیرت نەچێت. یەحیا! دەڵێن کاتێ مەنسووری حەللاجیان





لەسێدارە دا، تەمەشای هاوڕێیەکی کۆنی خۆی کرد، کە لەوێ ئامادە بووبوو و وتی، ‹ئەمەی کە دەیبینیت، ئەنجام و ئاکامی نیگایەکە، کە لە تافی لاویمدا لە کۆڵانەکەمان گرتمە کچێک، کە لە سەربان بوو.› یەحیا! لە ژیانی تۆشدا نیگایەک هەیە، کە لەوانەیە دواجار بوونت بفەوتێنێت. بەڵام ئەو نیگایانە بەهادارن، لەبەر ئەوەی هەڵگیرسێنەری بڵێسەی عەشقن و ئەم بڵێسەیەش، ئەگەر ئاگر لە دارونەداریشت بەر بدات، هێشتا دەهێنێت!"

موغەکە ئاماژەی بۆ یەحیا کرد، کە هەستێت، موغەکە خۆیشی هەستا. باوەشی بە یەحیادا کرد و ناوچەوانی ماچ کرد و بە دەستی، ئاماژەی پێ دا کە بڕوات.

# ژێیەکی سەودا

مەگەر من دێوانە ئەبم لەم سەودایە وا شەو تا سوبح
پەری لە خەوندا ئەبینم، بۆ خۆم لەگەڵ مانگدا ئەدوێم

"یەحیا! خواردنم بۆ هێناویت، دەمەوێ ئاگردانەکەت بۆ داگیرسێنم. من ئەمشەو زوو دەخەوم، دەبێ بەیانی زوو بۆ ئاتەشکەدە بچم. سیندوختیش ئەمشەو لەوێیە. سبەینێ دەتبینمەوە."

شەرمەزاری لە دەنگیدا شەپۆلی دەدایەوە. بەشێنەیی وەلامی دایەوە، "ئەزیەتم دان، ببوورن، بەلام من سبەینێ زوو دەبێ ئێرە بەجێ بهێڵم."

"بەرەو کوێ؟"

"بەرەو مەراغە دەکەومە ڕێ. ئەگەر سبەینێ نەمبینیت، گەردنم ئازاد بکە. ئەم ماوەیە زۆر میهرەبانیتان نواند. ئەوەندە ئەرکم هەبوو بۆتان، کە هەست بە شەرمەزاری دەکەم. گەردنم ئازاد بکەن."

"ماڵی خۆتە. تۆ میهرەبانیت کرد، کە بوویت بە میوانمان، خودا یار و یاوەرت بێت. بەیانی زوو دەر مەچۆ، هەوا ساردە، بەڵکوو بتبینم."

جاماسب خێرا دوور کەوتەوە و یەحیاش، کە لای ئاگردانەکەوە دانیشتبوو، هێشتا بیری لە خەونەکەی

دەکردەوە. بۆ تاوێک لە گڕی ئاگری ئاگردانەکە ڕاما. لەپڕێکدا بیری کەوتەوە، کە نوێژی مەغریبی نەکردووە. بەهەڵەداوان چووە دەرەوە، دەسنوێژی گرت، تەماشایەکی ئاسمانی کرد و خێرا گەڕایەوە و چوو تا نوێژەکەی بکات.

"ئای بە نەفرەت بیت، شەیتان! دەڵێی وڕوکاس بووم! لەم چەند ساڵەدا، ئەمە یەکەم جارە بیرم بچێت لە کاتی خۆیدا نوێژ بکەم؟ یانی چی؟ نەکا ئەنجامەکەی خراپ بێت و بەبێباوەڕی لەم دنیایە بڕۆم؟ بۆ وام لێ هاتووە؟ خۆ سیحر و جادووم لێ نەکراوە؟"

خۆی بە خوێندنەوەی قورئانەوە خەریک کرد. بڵێسەی ئاگردانەکە کپ بووبۆوە و ژوورەکە لە تاریکیدا سرەوتبوو. دارێکی خستە ناو ئاگردانەکەوە. لەبەر تیشکی ئاگرەکەدا ئەو شتانەی نووسییەوە، کە ئەو ڕۆژە بیستبوونی. کتێب و دەفتەر و کەرەسەکانی خستە ناو خورجینەکەیەوە، تا بۆ سبەینێ ئامادە بێت.

لە نزیک ئاگرەکەوە ڕاکشا. خەوی لێ نەدەکەوت. سەودای سیندوخت دابووی لە سەری. دەبوو بیبینیایە: "تەنانەت گەر لە دووریشەوە بینیومە، دەبێ بیبینم! تاقە نیگایەکی ئەو لە توانایدایە بۆ هەمیشە ببێتە تەسەللا بۆ دڵ و دەروونم."

بەڵام دوای تاوێک، پەشیمان بۆوە. "یانی چی؟ ئەگەر بزانێ جۆرێک سەیری دەکەم، لەوانەیە پێی ناخۆش بێت. ڕاست نییە. نەبادا ئەم گاورانە بە چاوی بەدبینییەوە تەماشای قوتابیی موسڵمان بکەن! گوناهە، دەبێ خۆم لە هەوا و هەوەس و فریوی شەیتان بپارێزم."

دەستێکی بە سەر و ڕوویدا هێنا. ئاسمان ساف بوو و





تریفەی زیوینی مانگەشەو، زەویی ڕازاندبۆوە. دەنگی ئاوی ئەو جۆگەیەی دەکەوتە باکووری ئاتەشکەدەکەوە، بە ئاوازی دلنشینی، خامۆشیی شەوەکەی دەشکاند. سەیری ئاسمانی دەکرد و لەبەر خۆیەوە ورینگەورینگی بوو. بە ڕێگەیەکی بازنەییدا، تا ئەودیو شووورای ئاتەشکەدەکە ڕۆی. هاژەی دلڕفێنی ئاوەکە و جلیوەی مانگە شەو و شکۆی بورجەکان و ئاتەشکەدەکە و کەشە ڕۆحانییەکە، خەونێکی دڵبزوێن بوو، کە لە بێداریدا دەیبینی. لە سەروو هەموو ئەوانەشەوە، وەختێ وێنەی سیندوختی دەهێنایە بەرچاوی خۆی، وەکوو دڵێکی پڕترپە، ئەوەندەی تر ڕۆحی بەم دیمەنە پڕشکۆیە دەبەخشی.

دەیزانی خوارووی ئاتەشکەدەکە لەژێر دەسەڵاتی کاربەدەستانی فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیەدایە، بۆیە نەدەبوو لەوە زیاتر بڕوات. بە هەمان ئەو ڕێیەدا گەڕایەوە، کە لێوەی هاتبوو. لای ئەو دەروازەیەوە، کە هەمیشە لەوێوە بەرەو ئاتەشکەدەکە دەڕۆیشت، دووبارە کەڵکەڵەی سیندوخت ڕیشەی لە ڕۆحیدا داکوتایەوە. لایەکی دەرگاکە کرابۆوە. چووە ژوورەوە. بەرەو بینای ئاتەشکەدەکە ڕۆیی. دەرگاکان هەموو کرابوونەوە، بەڵام ڕاڕەوەکە تاریک بوو. لە کۆتاییی ڕاڕەوەکەدا، چرایەک کز کز دەسووتا. زیاتر چووە پێشەوە. کەمێک لەولاترەوە ئەو هۆڵە گەورە چوار تاقە بوو، کە ئاتەشدانەکە لە ناوەڕاستیدا بوو. خزمەتکارەکان بە گوێرەی دابونەریتێکی تایبەتی خەریکی کار بوون و کیژە سپیپۆشەکانیش، کە پاسەوانانی ئاگرەکە بوون، بە دەوری ئاگرەکەدا ڕاوەستابوون. چاوی گێڕا و لەبەر خۆیەوە وتی،

"ئەی سیندوخت کوا؟ من سبەینێ سەفەر دەکەم، خۆزگە دەمتوانی بۆ دواجار بتبینم."

کێشمەکێشێکی سەیر لەنێوان ئاوەز و دڵیدا پەیدا بووبوو. دیمەنێک بوو، لە شەڕی نێوان ئاوەز و عەشق. ئاوەز دەیوت، "بۆچی بۆ ئێرە هاتوویت؟ خەتەرناکە! ئەگەر ئاگایان لێ بێت، لەوانەیە تووشی بەڵایەکت بکەن. ئەی غەریب و بێپەنا، ئاگایەکت لە خۆت بێت." عەشقیش دەیوت، "هەر دەبێ ئەو ببینیت، کێ دەڵێ جارێکی دی دەیبینیتەوە! پێویستە ئەو خۆشەویستەی دڵت ببینیت، دەشێ جارێکی تر ئەم دیدارە ڕوو نەدات. دەبێ سیندوختی مەحبووبت ببینیت!" سەرەنجام، عەشق زاڵ بوو و یەحیا بێباکانە بەدەم وریگەورینگەوە چووە پێشەوە و ئەمەی لەبەر خۆیەوە دەوتەوە:

"هەرکەس عاشق بێ لە گیان ناترسێ
لە کۆت و بەند و زیندان ناترسێ
دڵی عاشق، وەک گورگی برسییە
گورگیش لە هۆهۆی شوان ناترسێ!"

لەو شوێنەی تیایدا ڕاوەستا بوو، بەباشی ئاگری ئاتەشدانەکە دەبینرا. لەبەر ڕووناکیی ئاگرەکەدا، ڕوخساری سیندوختی بەدی کرد. ڕێک بەرامبەری وەستابوو. بەرگێکی سپیی پۆشیبوو. سەر ڕوومەتەکانی وەک دوو گۆی وەکوو خۆر دەدرەوشانەوە. بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێ، لەبەر خۆیەوە وتی، "سبحان رب المشرقین!" ئای چەند جوان بوو هەڵاتنی دوو خۆر لە دوو خۆرهەڵاتدا و لە پانتاییەکی





مانگئاسادا. چاوانی ئاتەشکەدەیەک بوون، کە ڕووناکی و گەرمییان لەمسەری ئاسۆوە تا ئەوسەری گرتبۆوە. سێبەری برژانگە ڕەش و درێژەکانی، لەبەر تیشکی بڵێسەکەدا، لە دوو هێڵی ڕەش دەچوون، کە ڕیزی برژانگەکانیان بە میحرابی برۆیەوە دەبەستەوە.

پرچە خاوەکەی سەرشانەکانی، لە نیشانەی تاریکییەکی چڕ و شەپۆلدار دەچوو، کە شوورایەکی بەدەوری ڕووناکیدا دروست کردبێت. بە سەرسامییەوە نوقمی تەماشای سیندوخت بوو، کە ئەویش ئەمی بینی و ناسییەوە. بە نازەوە نیگایەکی کرد و بەرەو ڕووی چوو. یەحیا وەختێ بۆی دەر کەوت کە ئەو دێت بۆ لای، کەمێک چووە دواوە و پاڵی دا بە دیواری ڕاڕەوەکەوە. سەراپا پەشۆکان و بێقەراری بوو. لێدانی توندی دڵی، تێکەڵ بە هەنگاوەکانی سیندوخت بووبوو. جیاوازییان نەبوو، جگە لەوەی یەکەمیان زۆر نائارام بوو و دووەمیان ئارام و لەسەرخۆ.

سیندوخت گەیشتە ڕاڕەوەکە. یەحیا وەک تەختەدارێکی وشک، کەوتە سەر زەوییەکە. کاتێک هاتەوە هۆش خۆی، دەستی لەناو دەستی یەکێک لە خزمەتکارەکانی ئاتەشکەدەکەدا بوو.

خزمەتکارەکە بە میهرەبانییەوە وتی، "ئێرە جێی خەوتن نییە، بچۆ بۆ ژوورە تایبەتەکان بۆ خەوتن." ئەو کە پێشتر یەحیای لەگەڵ موغەکەدا بینیبوو، بە یەکێک لەو مەجوسە بیانییانەی دەزانی، کە عادەتەن بە مەبەستی سەردان و پەرستن بۆ ئەوێ دەهاتن.

کاتێک لە ساختومانەکە چووە دەرێ، خوێندنی

کەڵەشێرەکان، هەواڵی سپێدەی ڕادەگەیاند. ئەمیش لەکوێوە هاتبوو، لەوێوە گەڕایەوە بۆ ژوورکەی.

ئاگردانەکە خامۆش بووبۆوە. خۆڵەمێشەکەی لا دا و هەندێ ژیلەمۆی لەژێریدا پەیدا کرد. لای یەکترەوە دای نان و فووی پیایاندا کرد. ئینجا چیلکەوچەواڵی خستە سەر و ئاگردانەکە ڕووناک بۆوە. وردەوردە خۆی بۆ سەفەرەکەی ئامادە دەکرد. خورجینەکەی هێنا و بڕیاری دابوو، بێ ئەوەی بە کەس بڵێت، ئاتەشکەدەکە جێ بهێڵێت، بەڵام جاماسب پەیدا بوو.

"بەیانیت باش. من کەمێک پەلەمە، یەحیا! خەریکە کاتی *هۆشبام** تێدەپەڕێت، دەبێ بڕۆم بۆ ئاتەشکەدە. خەونێکم دیوە، بۆ سیندوختی دەگێڕمەوە، تا بۆت باس بکات. کاژێرێک بمێنەرەوە! پاشان نانی بەیانیت بخۆ و بڕۆ." باوەشی بە یەحیادا کرد، ناوچەوانی ماچ کرد و ماڵئاوایی لێ کرد و ڕۆیشت.

---

* هۆشبام: لە ئایینی زەردەشتیدا بەو کاتە دەڵێن، کە هێندەی نەماوە خۆر هەڵبێت؛ کازیوە.



## تویشەبەرەی ئاگر

وەختێ تۆ ئەڕۆی لەم ماڵەی ئێمە
بەم ئاگرەوە و کڵپەیەی ئێمە
لە عەشق بدوێ

بڕیاری دابوو لە سەفەرەکانیدا هەر خۆی بێت و هەرکەسێکی بەڕێکەوت هاتە ڕێ، هاوشانی بڕوات و لە هەر لادێ و شارێک ویستی، لا بدات. هەر بۆیە گوێی بە بەرنامەی هەواربەهەواری کاروانەکان نەدا، چونکە ئەم دەیویست، تا زووە، خۆی بگەیەنێتە مەراغە و بۆ خوێندن ئامادەسازی بکات.

دەرفەتێکی باشیش بوو. حەزی دەکرد لەگەڵ زانایانی ئەو ناوچانەی پیایاندا گوزەر دەکات، وتووێژ بکات و سوود لە زانیارییەکانیان وەر بگرێت. دەبووایە بڕۆیشتایە، بەڵام بێهۆ میلی کاتی بۆ دواوە دەگەڕاندەوە. لە خەیاڵاتی سیندوختدا نوقم بووبوو: "کە هات، بێگومان خەونەکەی جاماسبم بۆ دەگێڕێتەوە. دەبێ چ خەونێکی دیتبێت؟ تۆ بڵێی سیندوخت، جگە لەوە، هیچی تر بڵێت؟ من چی بەو بڵێم؟"

دەنگی لێدانی دەرگاکە، ئەوی لە خەیاڵاتەکانی هێنایە دەرەوە. یەکێک بەهێواشی لە دەرگاکەی دەدا. بەپەلە هەڵسایە سەر پێ. سیندوخت بوو، نانی بەیانیی بۆ هێنابوو.

دەمەوبەیان بوو، بەڵام هێشتا ناو ژوورەکە بە ئاگری ئاگردانەکە ڕووناک بوو. سیندوخت خواردنەکەی لای ئاگردانەکەوە و لەو شوێنەدا دانا، کە یەحیا لێی دادەنیشت. هەندێ چیلکەوچەواڵی کردە ناو ئاگردانەکەوە و ڕووی کردە یەحیا و وتی، "ڕێگەیەکی درێژت لەپێشە. نانی باش بخۆ، چونکە لەوانەیە درەنگ بگەیتە جێ."

ژوورەکە ڕووناکتر بۆوە. یەحیا سەری دانەواند و وتی، "سوپاسگوزارم، من هەموو ڕۆژێک نانی باشم خواردووە."

"نا، وا نییە، تۆ زۆر کەمخۆریت. هەر دەڵێی پێویستت بە خۆراک نییە. بەڕاست، باوکم خەونێکیسەیری بە تۆوە بینیبوو. خەونەکەی بۆ من باس کرد. ئای لەو خەونە سەیرە! وتی لە خەونیدا تۆ باڵێکت هەبووە، بەڵام نەتتوانیوە بفڕیت. لە ماڵی ئێمە زوننارێک هەبووە و مۆبەدێک بە کەمەری تۆوەی بەستووە، ئیتر دوای ئەوە، لەسەر شانەکەی ترت باڵێکی دی ڕوواوە و تۆش فڕیویت و بەرەو ئاسمان لە شەقەی باڵت داوە! باوکم وتی خوا حەز بکات، سەفەرێکی باشت لەپێشە. ئەو چونکە زۆر باوەڕی بە خەونەکانی خۆی هەیە، داوای لێ کردوویت ئەم *کوشتییە*[*] لە کەمەرت ببەستیت!"

یەحیا بێ دواکەوتن وتی، "ئێوە لەگەڵ مندا زۆر میهرەبان بوون. نازانم چۆن پاداشتی ئەو هەموو باشییەتان بدەمەوە. بەسەر چاو، دەیبەستم."

"باشە، ئێستا نانەکەت بخۆ، من کەمێکی تر دێمەوە و خواحافیزیت لێ دەکەم."

---

[*] کوشتی، کشتی، یان کوستی: پشتێن یان کەمەربەندی مەزداپەرستانە.





چەند هەوڵی دا، هیچی بۆ نەخورا. پارووێکی کردە دەمیەوە. کەمێک شیری هەڵقوڕاند و بێقەرارانە چاوەڕێی گەڕانەوەی سیندوخت بوو. سیندوخت هاتەوە، شتێکی پێ بوو.

"یەحیا! ئەمە *کوشتی* یان *بەندی دینەکەیە*. ڕێم بدە با خۆم، بەپێی نەریتی خۆمان، لە کەمەرتی ببەستم. ئەم پشتێنە بە دەستی بەهدینان چنراوە و لە ٧٢ تاڵە خوری پێک هاتووە. سێ جار لەدەوری کەمەرت دەیبەستم، بە نیازی هەرسێ بنەماکەی مەزدیەسنا: بیری باش، وتەی باش، کرداری باش و ناوەکانی ئاهورامەزداش دەچرم، تا لە گورزی چەقۆ و تەور و تیر و خەنجەر و گاڵۆک و بەرد و قۆچەقانێی دوژمن، سەلامەت و پارێزراو بیت.

"یەحیا، تۆ موسڵمانیت. ئەم نەریتە لە ئایینی ئێوەدا نییە، بەڵام من و باوکم، بەم کارە ئەرکی سەرشانی خۆمان بەجێ دەهێنین. بە ئەرکی خۆمانی دەزانین، بە نزای پاراستنی گیانەوە لێرە ڕەوانەت بکەین. کە لێرە نەمایت، دەتوانیت لە خۆتی بکەیتەوە و تەنانەت فڕێشی بدەیت. نەبادا بە هەڵگەڕانەوە لە دینەکەی خۆتان تاوانبارت بکەن و خوێنت حەلاڵ بکەن."

یەحیا، کە هەر سەری دانەواندبوو و بیری دەکردەوە، وتی، "من لەم ماوە کەمەدا، سۆز و میهرەبانییەکی زۆرم لە ئێوە بینی و زۆر شتتان لێ فێر بووم. ئێوە گەلێ میهرەبانن، لەکاتێکدا من سەر بە دینەکەی ئێوەش نەبووم، کەچی ئەو هەموو ڕێز و خۆشویستییەم لێتان بینی."

"ئەمە منەتێک نییە، بیکەین بەسەر تۆدا، چونکە ئایینەکەی ئێمە، لەسەر بناغەی میهر دامەزراوە. ئێمە لەسەر ئایینی

جەمشیدی خورشیدین، کە بەیەکسانی سەیری هەمووان دەکات. نەک ئێستا کە ژێردەستین، بەڵکوو ئەو کاتانەی لە جیهاندا باڵادەستیش بووین، شای شاهان (کۆرش)، دەستی بە هەرشوێنێک بگەیشتایە، بە گوێرەی ئەو ڕێنماییانە، ڕێزی لە هەموو خەڵکێک و بیروباوەڕێک و پەرستگەکانیان دەگرت. لە ئایینی ئێمەدا، توندڕەوی نییە."

یەحیا، کە بەرامبەر بە سیندوخت هەموو شتێکی لەیاد چووبۆوە، خوازیاری ئەوە بوو ئەم وتوویژەیان درێژە بکێشێت. ڕەنگە ئەمە دوادەرفەتی بینینی سیندوخت بێت. دەیویست سەبارەت بە خۆی لەگەڵیدا بدوێت، بەڵام ئادابی عەشق، ڕێی ئەو گوستاخییەی پێ نەدەدا. هیچی پێ نەبوو بۆ وتن، تەنها ئەوە نەبێت کە: "من دەبێ بڕۆم، بەڵام... بەڵام..."

"بەڵام چی؟"

"هیچ، ویستم بڵێم تۆ شتێکت نییە بیڵێیت؟"

سیندوخت بە هێوریی فریشتەیەک و بە سەروسیمایەکی میهرەبانەوە، کە هێندەی زەردەخەنەی قدیسەکان پڕشکۆ و جوان و ئیلهامبەخش بوو، وتی، "تۆ دەڕۆیت، منیش لە ئاستانەی فڕیندام. گیانم لە جەستەم جیا دەبێتەوە. دەفڕم. من هاوسەرگیریم نەکردووە و ناشیکەم. دەرفەتی ژیانم کەم بوو. هەوڵم دا باڵەکانم زوو بڕوێن و گەشە بکەن. من لە ئاسمانی جیهانێکی تردا دەفڕم. من بەر لە مەرگ دەمرم و چەند ساڵێک دوای ئەوە، بە مردنی سروشتی، ئەم جەستە خاکییەم بە خاک دەسپێرم. من بەر لەو پشێوییەی ئەم سەرزەمینە ئازیزە لەناو خوێن و ئاگردا نوقم دەکات،





دەمرم. بەڵام تۆ! من لەناو تۆدا بڵێسەیەکی پڕشنگدار دەبینم! دڵی تۆ ئاتەشکەدەیە. ڕێگەیەکی باشت لەپێشە. تۆ گەورەیت! تۆ ئەهلی فڕینیت! دوای ئەوە، بۆ هەمیشە یەکتر دەبینین. دوای فڕین لەگەڵ ‹ئۆردووی سوور ئاناهیددا کە چوار ئەسپی سپی- با، هەور، باران، ئاونگ - گالیسکەکەی ڕادەکێشن، ژنە خواوەندێکی لاو و جوان، بەژنزراف، مەمکقوت، کەمەرباریک، پاک و ئابڕوومەند، تاجێکی ئاڵتوون بەسەریەوە، بە سەد ئەستێرە و هەشت تیشکەوە، بە بەرگێکی زێڕین و پرچینەوە، لە بەرزاییی ئاسماندا› پێکەوە دەبین، لەسەر کانیی ژیان! یەحیا! ئێمە سەر بە ئێرە نین. شوێنی ئێمە وا لە سەروو ئاسمانەکان و ئەستێرەکانەوە. یەحیا! تۆ لەو کەسانەیت، کە هەموو ڕۆژێکیان، ڕۆژێکی نوییە. تۆ شەپۆلیت! تۆ دەڕۆیت. تۆ ئازاد دەبیت. تۆ لە زیندان ئازاد دەبیت و دەفڕیت.

"یەحیا! تۆ کە منت بینی، زوهرەت هاتەوە یاد، هەوڵ بدە *ئۆردووی سوور ئاناهید* ببینیت! من خەیاڵم دەکەمە باوەری تۆ! خەیاڵی من، هاوەڵی ڕێی تۆ دەبێت. تا بارەگای ئۆردووی سوور ئاناهید! واتە زوهرە! دەسبەرداری ڕێت نابم. ئیدی هیچی ترم نییە بیڵێم. بڕۆ. خوات لەگەڵ!"

یەحیا بێئاگایانە دەستی برد بۆ خورجینەکەی و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی، "خوات لەگەڵ!"

ملی ڕێی گرتە بەر.

"خوات لەگەڵ، ئەی غەریبە ئاشناکە، خوات لەگەڵ!"

هێشتا چەند هەنگاوێکی نابوو، کە سیندوخت بانگی کردەوە، "یەحیا! بوەستە."

یەحیا وەستا. دوای کەمێک، سیندوخت شتێکی هێنا و خستیە دەستیەوە، "دوایی ئەو نهێنییە بکەوە، کە ئێستا ڕەمزەکەیم دا پێت. خوات لەگەڵ."

یەحیا خواحافیزیی کرد و ڕۆیشت. پاش تۆزێک کە دوور کەوتەوە، سەیری ئەو شتەی کرد، کە سیندوخت خستیە دەستیەوە. پارچەیەک ئاوریشمی سەوز و شتێک لەناویدا. خورجینەکەی دا بە شانیدا. دەسرە ئاوریشمەکەی کردەوە، مۆرێکی لە قوڕدروستکراو بوو، کە ئەم نەخشانەی لەسەر بوو:



مۆرەکەی خستەوە ناو دەسرە ئاوریشمەکە و خستیە گیرفانی و بە ڕەمزێک و ئاگری هەڵایساوی ناو دڵیەوە و سەودایەکی تازە لە سەردا و ڕێگەیەکی نوێ لە بەردەمیدا، کەوتەوە ڕێ. دەڕۆیی، بەڵام نەیدەزانی دەگاتە کوێ و چی دەکات و چی دەبینێتەوە، وەلێ لە کانگەی دڵەوە، شادمان بوو و لە خۆشییاندا پێی نەدەکەوتە سەر ئەرز، بەدەم سەما و ورینگەورینگەوە دەیوت:

"وەختێ تۆ ئەڕۆی لەمماڵەی ئێمە
بەم ئاگرەوە و کڵپەیەی ئێمە
لە عەشق بدوێ."



## بە شێخم وت، تەگبیر چییە؟

دەمەوسەحەر ڕێبواری سەرزەمینێ
ئەم مەتەڵەی ئەوت بە هاونشینێ،
"برای سۆفی! شەراب کاتێ پێئەگا،
بۆ چل ڕۆژێک لە شووشەدا بمێنێ؟"

بەرەبەیانی ڕۆژی دووەمی سەفەرەکەی بوو. دوێنێ کە لە شیزەوە کەوتە ڕێ، ملەیەکی سەختی هاتە ڕێ. کە تێی پەڕاند، گەیشتە ئاواییەک. شەو لە ماڵی کابرایەکی هەژاری لادێیی مایەوە. ڕاخەرەکەیان بریتی بوو لە دوو بەڕەی کۆن و کلیمێکی پەڕپووت. یەحیا لەسەر کلیمەکە خەوت. قاچی لە کلیمەکە درێژتر بوو.

بۆ ئەوەی ئەرکی زیاتر نەخاتە سەر ماڵەکە، بەیانی زوو، دوای نوێژ، ملی ڕێی گرتەوە بەر. خانەخوێ هەژار و میهرەبانەکە تا دەرەوەی ئاواییەکەیان لەگەڵی چوو. ڕێگەکەی پیشان دا و هەندێ نیشانەی دایێ، تا ڕێی لێ وێڵ نەبێت. دنیا خەریک بوو ڕووناک دەبۆوە و ڕێگەکەش بەباشی دەبینرا. لە کاتی خواحافیزیدا، برای لادێیی پارچەیەک نانی جۆی دایێ و پێی وت، "نانی نەرممان نەبوو، بەڵام تۆ لاویت و ددانەکانت بەهێزن و دەتوانیت ئەم نانە بخۆیت. ئەمە بۆ نانی بەیانیت، نیوەڕۆش دەگەیتە ئاواییەکی تر و

دەتوانیت لەوێ نانی نیوەڕۆ بخۆیت."

یەحیا بە شەرمەزارییەکەوە وتی، "سوپاست دەکەم! برسیم نییە و پێویستم پێی نییە."

بەڵام کابرا هێندە پێی داگرت، تا یەحیای ناچار کرد نانەکەی لێ وەر بگرێت. تەوقەیەکی لەگەڵ کرد و ڕۆیشت. هەوا، تا ڕادەیەک، سارد بوو. هەتاوی خۆری پاییز لە توانایدا نەمابوو لە سەرماکە کەم بکاتەوە. خۆرەکە کەمێک بەرز بووبۆوە، کە لای کانیاوێکەوە دانیشت. پارچە نانەکەی دەر هێنا و دەستی بە خواردنی نانی بەیانی کرد. پاش پشوودانێک، کەوتەوە ڕێ. خۆر گەیبووە ناوەڕاستی ئاسمان، وەختێ گەیشتە نزیک ئاوێک. پیرەمێردێک چەند بزنێکی دەلەوەڕاند. لێی نزیک بۆوە و سڵاوی لێ کرد، "سەر چاو! ماندوو نەبیت! لەکوێوە هاتوویت و بۆ کوێ دەچیت؟"

"تۆش ماندوو نەبیت، لە سوهرەوەردەوە هاتووم و دەچم بۆ مەراغە."

"کارت چییە؟"

"قوتابیم، دەمەوێ بچم لەوێ بخوێنم."

"زۆر چاکە، خوا ئاگای لێت بێت. ئەی بۆ بەتەنیا؟ ناترسیت؟"

"نەخێر، هیچم نییە تا بترسم و پەلەشم نییە. لەم ئاواییەوە گەر بچیت بۆ ئەو ئاواییە، هیچ مەترسییەک هەیە؟"

"نەخێر، ئینشاڵڵا بە ساغ و سەلامەتی دەگەیتە مەراغە و بەخوێندنەکەت ڕادەگەیت. بەڵام وریایی هەر باشە. بەتەنیاش مەڕۆ! هەڵبەتە زۆرت نەماوە بگەیتە مەراغە."





یەحیا ویستی بڕوات، کە پیرەمێردەکە وتی، "تۆ وتت پەلەت نییە. ئەمڕۆ میوانی من بە! ئاواییەکەی ئێمە لەو سەرەوەیە. هەرچەندە ئێستا پاییزە، وەلێ بەهاران گەلێ بەسەفا و خۆشە. خانەقایەکیشمان هەیە، لەگەڵ شێخێکی پیاوچاک و سەنگیندا. هەرچییەکمان هەیە، لەسای ئەوەوەیە. هەوڵ بدە بیبینیت، شایانی ئەوەیە، سەردانی بکەیت. مەرج نییە هەر شارە گەورەکان پیاوی گەورەیان تیا هەڵبکەوێت. لە لادێکانیشدا، دەتوانیت پیاوی گەورە ببینیتەوە."

"بەسەر چاو، دەمێنمەوە! پەلەم نییە و دەمێنمەوە و شێخیش دەبینم."

پیرەمێردەکە بزنەکانی خڕ کردەوە و بە یەحیای وت، "بڕۆین؟"

"پەلەم نییە، وازیان لێ بێنە، با بلەوەڕێن."

"گرنگ نییە، کاتی لەوەڕیش نەما. هەواکەی خۆش بوو، ئیتر حەزم کرد بزنەکان بهێنمە دەرەوە و کەمێک بیانگەڕێنم."

"کەواتە نوێژەکەمان بکەین و بڕۆین؟"

"ئەرێ، نیوەڕۆیە. قسەکانت لە جێی خۆیدا بوو. زەینت باشە."

دەستنوێژیان گرت و پیرەمێردەکە بۆ نوێژ وەستا و یەحیاش لەپشتیەوە. کە نوێژەکەیان تەواو کرد، بزنەکانیان پێش خۆیان دا و پیرە وتی، "من ناوم عەبدولحەمیدە، ئەی تۆ؟"

"یەحیا."

"نەوەکەی منیش ناوی یەحیایە. برسیت نییە؟"

"نەخێر."

"باشـە، دەڕۆیـن شـتێک دەخۆیـن و لەگـەڵ شـێخدا نوێژی عەسـر دەکەیـن."

گەیشـتنە نزیـک ئاواییەکـە. چەنـد سـەگێک خەریکی خواردنی کەلاکی گوێدرێژێک بـوون. بۆگەنەکەی بەو ناوەدا بڵاو بووبۆوە. کەمێک لەولاترەوە، منالانی دێ، بە قژی ژاکاو و جلە کۆن و دڕاوەکانیانـەوە، لەسـەر خەرمانێک یارییـان دەکرد.

ماڵی کابرا لە سـەرەتای ئاواییەکەدا بوو. خۆیان کرد بە ماڵدا. پیرەمێردەکە بزنەکانی بە منالەکانی سپارد و دەستی یەحیای گرت و چوونە ژوورەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو، ژنی کابـرا هـات و بەخێرهاتنـی یەحیـای کـرد. پیـرە بـە دەنگێکی زوڵاڵـەوە وتـی، "خەدیجـە، خێـرا بکـە نانـی نیوەڕۆمـان بـۆ بێنە." پاش تاوێک، سفرەیان ڕاخست و هەندێ نان و چەند هێلکەیەکی کوڵاو و کاسـەیەک دۆیـان لەسـەر دانـا. دوای نانخـواردن، کەمێک پشـوویان داو ئینجا بـۆ دیداری شـێخ تاهیر چوون.

شـێخ تەمەنـی نزیکـەی شەسـت و پێنـج سـاڵێک دەبـوو. سەروریشـێکی سـپیی چـڕی هەبـوو. قژی درێـژ بـوو، بـەڵام بەشـی پێشـەوەی سـەری، مووی کـەم بوو. کەوایەکی لەبەردا بـوو، لەسـەر کەوڵێک دانیشـتبوو. خانەقاکەشـی هـەر لـەوێ و لـە نزیـک ژووره بچکۆلەکەیـەوە بـوو.

عەبدولحەمید و یەحیا بە سڵاو و نواندنی ڕێزەوە چوونە ژوورەوە و ئەویش ئاماژەی بۆ کردن، کە

بەرامبـەری دابنیشـن. عەبدولحەمیـد وتـی، "ئەمـە یەحیایـە! لـە سـوهرەوەردەوە هاتـووە و دەچێـت بـۆ مەراغـە، دەیـەوێ





لەوێ بخوێنێت. مـن پێـم وت بێتـە خزمـەت جەنابتـان."

"زۆر باشە، چیت خوێندووە؟"

"هیـچ! کەمێک ئەدەبیاتـی عـەرەب، فیقهـ تەفسـیر و تۆزێکیـش مەنتیـق و کـەلام و فەلسـەفە."

"لەکوێ؟"

"لە سوهرەوەرد و مەراغە و ئەسفەهان."

یەحیـا بـە هەڵـی زانـی و هەندێ پرسـیاری لـە شـێخ کـرد، لەوانـە:

"بۆچی خۆر گەورەترە؟"

"لەبەرئەوەی لە ناوەڕاستدایە."

"ئەی مانگ، خۆی ڕووناکیی هەیە؟"

"نەخێر، ئەوە تیشکی خۆرە لێی دەدات."

"چۆن؟"

"وەک ئەوەی تیشکی خۆر لە بلوورێک بدات و ڕووناکی بداتەوە."

ئینجـا شـێخ بـە یەحیـای وت، "ئـەم پرسـیارانە بـە کەڵکی تۆ نایەن. بە تۆ چی فڵانە ئەستێرە بۆچی بچووکە و ئەوی تریش گەورەیە! نۆ فەلەکمـان هەیـە یـان دە؟ وا چاکتـرە لەبری ئەمانـە، بیـر لـە نهێنییەکانـی ئاسـمان بکەیتـەوە!"

"ئاخر ئەو توانایەم نییە. ئەی تەگبیر چییە؟"

"تۆ نەخۆشیت! دەبێ چارەسەر وەر بگریت."

"تۆ پزیشکم بە و دەرمانم بکە. چارەسەر چییە؟"

"چارەسـەری تۆ ئاسـانە. مـن لـە تۆدا توانـای گەشـەکردن دەبینـم. چارەسـەری تۆ چل ڕۆژ پارێز و مەعجوونێکە!"

"چۆن پارێزێک و کام مەعجوون؟"

"چل ڕۆژ قەناعەتکردن بە خواردنێکی کەم. کەرەسەکانی مەعجوونەکەشت، بریتین لە: سامان، پایە، کەلوپەل، لەززەت و شەهوەت. دەبێ ئەم کەرەسانە لە دەسکەوانی پشتبەستن بە خوادا بە دەستی ڕەزامەندی و ئارەزوو بکوتیت و مەعجوونێکیان لێ دروست بکەیت و بە یەک کەڕەت بیخۆیت. ئەگەر ئەم مەعجوونە ڕەوانی کردیت، ئەوا زوو دیدەی ناخ ڕووناک دەبێتەوە. ئەگینا دەبێ دووبارەی بکەیتەوە، تا بەو ئەنجامە دەگەیت. زینهار وەک سەگ مەیلی پیساییەکەی خۆت نەکەیت، چونکە ئەم کارە خەتەرناکە و دەردەکەت درێژخایەن دەکات و دەرمانی زەحمەت دەبێت."

"وەختێ دیدەی ناخ ڕووناک دەبێتەوە، ئەو کەسە چی دەبینێت؟"

"بە پشکوتنی دیدەی ناخ، دەستی هەستەکانی دەرەوە کورت دەبێتەوە، ئەوکات پەی بە نهێنییەکانی ئاسمان دەبەیت. شتگەلێک دەبینیت و هەقیقەتگەلێکت بۆ دەر دەکەوێ، کە ناگوترێن و قابیلی گوزارشت نین. دەبێ ئەو کەسە خۆی بەو ئەزموونەدا تێپەڕێت."

"ئەی هەموو کەسێک دەتوانێ ئەم جۆرە زەوق و ئەزموونانەی هەبێت؟"

"لە ڕووی ئیمکانەوە، ئەم ئەزموونە بۆ هەموو کەسێکە. وەلێ کەم کەس دەتوانن دەستیان پێ ڕابگات. ئەم دونیایە، دونیای لەخۆباییبوون و غەفڵەتە و ئەهلی دونیا مەستی شەرابی لەخۆباییبوون و غەفڵەتن. بەڵام گەر کەسێک دەستی بەم ئەزموونانە بگات و بوون بۆ نەبوون بگۆڕێت، لەززەتێکی وەهای دەسگیر دەبێت، کە قابیلی بەراورد و





وەسف نییە. شادمانی و چێژی ئەو شتانەی پەییان پێ دەبات، وای لێ دەکات لە ئاست دونیا و لەزەت و پلەوپایە و ساماندا بێپەروا بێت."

درەنگ بوو و خۆر خەریک بوو ئاوا دەبوو! دەبووایە ئیدی لای شێخ بڕۆیشتنایە. گەڕانەوە بۆ ماڵی عەبدولحەمید. عەبدولحەمید لە یەحیای پرسی، "پیاوێکی چۆن بوو بەلاتەوە؟"

"شێخێکی گەورەیە، میهرەبان و چاکەخوازە..."

# دیسانەوە مژدەی فڕین

عەشقت بەهار بوو و خستمیە سەر ئەوین
ستران بوو و خستمیە سەر ئاوازچڕین
شەوقی تۆ، باڵی لەسەر شانم ڕواند
بردمی بۆ پەڕپەڕۆچکە و خستمیە فڕین

پیرەمێردەکە بە یەحیای وت، "دەتوانین لێرە نوێژی ئێوارە بکەین و بۆ نوێژی عیشا، بچینەوە بۆ خانەقاکە. شەوانی پاییز و زستان، خەڵکی لە خانەقا کۆ دەبنەوە و دوای نوێژ و نزا، بەدیار شێخەوە دادەنیشن و دەربارەی ئەحکامی شەرع شتی لێ دەپرسن. جا تۆش ئەگەر ماندوو نیت و حەز دەکەیت دووبارە شێخ ببینیتەوە، ئەوا دەتوانین پێکەوە بچینەوە بۆ لای."

یەحیا بە شەوقەوە وتی، "زۆر چاکە، ئەمڕۆ ڕێگەم زۆر نەبڕیوە و ئەوەندە ماندوو نیم. خۆیشم بەتەما بووم پێت بڵێم، تا بچینەوە بۆ لای. پێشنیارێکی باشە."

نوێژەکەیان کرد و کەمێک نانی جۆیان بە شیرەوە خوارد و خۆیان ئامادە کرد بڕۆن. عەبدولحەمید، وەک ئەوەی شەکەتی لە چاوی میوانەکەیدا بخوێنێتەوە، وتی، "ئەگەر ماندوویت، مەیە، بڕۆ بخەوە."

"نا، ناخەوم. ماندووش نیم. حەز دەکەم شێخ ببینمەوە."

"باشە، سبەینێ ببینە، خۆ پەلەت نییە."

"نەخێر، سبەینێ دەبێ بڕۆم. ئێستا باشترە! بەڕاست، دەهێڵن شەو لە خانەقا بخەویت؟"

"بەڵێ. هەندێ جار موسافیرەکان و دەروێشەکان لە خانەقا دەخەون. بەڵام ئێمە بۆ خەوتن دێینەوە بۆ ماڵی خۆمان. تۆ دەبێ لێرە بخەویت."

"ئاخر حەز دەکەم شەو بەتەنیا بم و لە خانەقا بخەوم. ئەگەر ڕێم بدەن، دەمەوێ لەوێ بم. خورجین و کەلوپەلەکانیشم دەبەم، تا سبەینێ یەکسەر لەوێوە بڕۆم و دووبارە ئەزیەتی ئێوە نەدەم."

"من هیچ ناڵێم، بەڵام ئێرەش ماڵی خۆتە. ئەگەر لەوێش دەمێنیتەوە، سبەی من نانی بەیانی دەهێنم و لەوێ پێکەوە دەیخۆین و دواتر بزانین چی دەکەین. بەڵکوو چەند ڕۆژێکی تر لێرە مایتەوە!"

"نەخێر، ئەزیەت مەکێشن."

"ئەزیەت نییە. ئەوە عادەتی ئێمەیە، کە نان بۆ میوانی خانەقا ببەین. منیش بۆتی نەهێنم، کەسێکی تر هەر بۆتی دەهێنێت. لەبەر ئەوە، خۆم بۆت دێنم."

چوون بۆ خانەقا. چەند کەسێکیش بۆ نوێژی عیشا چووبوون بۆ ئەوێ.

کە شێخ خۆی کرد بە ژووردا، هەموو لەبەری هەڵسان. بەرەو میحرابەکە چوو. بانگی دا و بۆ نوێژ وەستا. دوای نوێژەکە، شێخ هات و بەرامبەر بە میوانەکان دانیشت. لە کاتێکدا لەبەر خۆیەوە شتێکی دەخوێند، بە جووڵەی سەر و دەستی سڵاو و ئەحواڵپرسیی لێ کردن. پاش کەمێک وتی، "یاران،





سەمەندەرێک بە میوانی چوو بۆ لای مراوییەک. وەرزی پاییز بوو، سەمەندەریش کە شەیدای ئاگرە و بێ ئاگر ناتوانێ بژی، لە سەرمادا هەڵدەلەرزی، مراوییەکە ئاگای لە حاڵی ئەو نەبوو و بەردەوام باسی ئەوەی دەکرد، کە مەلەکردن لەناو ئاوی سارددا چەند خۆشە. سەمەندەرەکە تاقەتی چوو و بە تووڕەییەوە مراوییەکەی جێ هێشت. ئەرێ، برایینە! ئەگەر قسە بۆ خەڵکێک بکەیت کە ئەهلی ئەو قسەیە نین، شەپازلە دەخۆیت. لەبەر ئەوەی دەرک بە قسەکەت ناکەن، بە کوفر و شتی تری لەقەڵەم دەدەن و پشێوی دەنێنەوە."

یەحیا کە هەموو گیانی بووبوو بە گوێ، لەبەر خۆیەوە وتی:

"من کە بیروباوەڕێکی پاکم هەیە
لە تانەی خەڵکی ناشایستە،
چ باکێکم هەیە؟"

شێخ بە زەردەخەنەیەکەوە درێژەی بە قسەکانی دا، "قسەکردن لە هەموو شوێنێک هەڵەیە. پرسیارکردنیش لە هەموو کەسێک هەڵەیە! ئادەمیزاد نابێ لە قسەکردندا بۆ خەڵکی شایستە، درێخی بکات. بەڵام خەڵکی ناشایستە خۆیان لە قسەی باش بێزار دەبن. دڵی خەڵکی ناشایستە و نامۆ بە هەقیقەت، وەکوو ئەو پڵیتەیە وایە، کە لەجیاتی زەیت، بە ئاو تەڕ بووبێت. چەند بتەوێ دای بگیرسێنیت، داناگیرسێت. ئەرێ، قسەی ئەهلی دڵ، لە ئاگر و ڕووناکی خاڵی نییە، وەلێ ئاگر و ڕووناکی لە مۆم بەر دەبێت نەک پڵیتەی تەڕ."

وەعزەکانی شێخ هەمیشە کورت بوون. بێدەنگ بوو و

چاوەڕێی کرد، تا بزانێ ئاخۆ کەس پرسیارێکی هەیە یان نا، تا وەڵامی بداتەوە. کەس پرسیاری نەکرد. شێخ دووبارە ڕووی کردەوە قیبلە و دەستی بە خوێندنەوەی قورئان کرد. خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد. عەبدولحەمید دوای وەعزەکەی شێخ، دووبارە لە یەحیا نزیک بۆوە و وتی، "دەترسم ئێرە سارد بێت، با بچینەوە بۆ ماڵی خۆمان."

"نا، سارد نییە. لێرە دەمێنمەوە. حەزم لێرەیە. ئێوە بڕۆن و دڵئاسوودە بن. نیگەران مەبن. من پیاوی سەفەرم! دەمێکە لە شیر و باوەشی دایک چوومەتەوە!"

عەبدولحەمید بە زەردەخەنەیەکەوە وتی، "بە خوات دەسپێرم. من دەڕۆم، بەڵام سبەینێ، بۆ نوێژی بەیانی و بەرچای، دێمەوە بۆ لات."

یەحیا سەرگەرمی نوێژ بوو.

پاش ماوەیەک، شێخ گەڕایەوە و سەیری کرد یەحیا نوێژ دەکات. چاوەڕێی کرد، تا نوێژەکەی تەواو بکات. یەحیا سڵاوی دایەوە. شێخ هەستا، تا بڕواتەوە. پێداویستییەکانی پیشانی یەحیا دا و ڕای سپارد، کە دەرگاکە لە دیوی ناوەوە دابخات و بخەوێت. لەو سێ مۆمەی لە گۆشەکانی خانەقاکەدا داگیرسابوون، دووانیانی کووژاندەوە و خەریک بوو بڕوات، بە یەحیای وت، "کاتێ خەوتیت، ئەو مۆمەش بکوژێنەرەوە. شەو شاد!"

"شەوشاد!"

شێخ نەڕۆی، چوو هەندێ چیلکە و داری هێنا.

"ئەمشەو هەواکەی زۆر ساردە، دەترسم سەرمات ببێت.





باشە جارێ مۆمەکەت نەکوژاندۆتەوە. بیهێنە با ئاگردانەکەی پێ دابگیرسێنم. لای ئەم ئاگردانەوە بخەوە."

یەحیا مۆمەکەی هێنا و شێخ بەشێنەیی ئاگردانەکەی داگیرساند و ڕۆیشت. یەحیا لای ئاگردانەکەوە ڕاکشا، سەیری بڵێسەکانی ئاگرەکەی دەکرد و چاوەڕێ بوو خەوی لێ بکەوێت. شەپۆلێک خەیاڵ ئەوی لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچ کرد. دەنگە پرسۆز و ڕۆحنەوازەکەی سیندوختی هاتەوە یاد، کە لە ساتی جیابوونەوەدا پێی وت، "یەحیا! لەناو دڵی تۆدا، بڵێسەیەکی پرشنگدار هەیە. دڵی تۆ ئاتەشکەدەیە! یەحیا! تۆ شەپۆلیت. تۆ دەڕۆیت و دەفڕیت. من خەیاڵم دەکەمە یاوەری تۆ. خەیاڵی من، هاوەڵی ڕێی تۆ دەبێت، تا بارەگای ئۆردووی سوور ئاناهید."

نوقمێ ئەم خەیاڵانە بوو، وەختێ خەو چووە چاوی. لە خەونیدا سیندوختی بینی، لە شیز، لەو جێیەی تیایدا ماڵئاوایی لێ کرد. بە هەمان میهرەبانی و نیگای گەرم و شەرمنەوە، دەیوت، "یەحیا! نامەوێ بۆ شیز بێیتەوە. دەرفەتی ئەوەت نییە. بۆ مەراغە مەڕۆ! لەکوێیت، لەوێ بمێنەرەوە. سەرقاڵی کاری خۆت بە. کەی پێویستی کرد، دێمە سۆراخت. ئێمە سەر بە ئێرە نین، دەفڕین! بڕوا بکە! بڕوا بکە! لە کۆتاییدا، من لەپەنا تۆوە دەفڕم. باڵم لە باڵت دەخشێنم. سەرتاپا دەبێتە حەز و خۆزیا بۆ فڕین. هەنگینێ پێکەوە بەرەو ترۆپک دەچین. لەگەڵ کەژاوەی ناهید و تەواوی ڕووناکییەکاندا."

یەحیا، کە سەرتاپا جۆشوخرۆش بوو، لە خەو ڕاپەڕی، سەیری ئاگردانەکەی کرد. بڵێسەکەی خەفە بووبوو. دەستی برد بۆ مۆمە کوژاوەکە، تا دای بگیرسێنێتەوە و خەونەکەی

لەبیر بچێتەوە. بەڵام لەخۆڕا پەشیمان بۆوە. ماوەیەک چاوی بڕییە ئاگردانەکە. پاشان لەژێر لێوەوە، کەوتە وتنەوەی ئایەتەکانی قورئان. چەند جارێک سوورەتی جومعەی وتەوە. دڵی تەنگ بوو. گریا، تا دواجار دووبارە خەو بردییەوە. ئەم جارەیان لەخەونیدا کۆمەڵێک مۆری گڵی بینی، کە لەسەر یەک کەڵەکە بووبوون و هێندەی گردێک دەبوون. یەکێکیانی هەڵگرت، وەک ئەو مۆرە وا بوو، کە سیندوخت لە کاتی ماڵئاواییدا پێی دابوو. مۆرێکی تر، هەموو بەیەک شێوە و یەک ئەندازە بوون، بەڵام بە خەتی جیاواز. یەحیا، بە هەردوو دەستی، ژێرەوژووری دەکردن و جارناجارێکیش هەوڵی دەدا بەسەر ئەو گردەدا سەر بکەوێت، بەڵام مۆرەکان دەخزان و یەحیاش لەناویاندا تەپاوتلی دەخوارد.

لە خەو بێدار بۆوە. گوێی لە دەنگی چەند کەسێک بوو، کە پێکەوە نوێژیان دەکرد. بەپەلە ڕاپەڕی و هەستایە سەر پێ. چووە دەرەوە. کانییەک لەولای خانەقاکەوە بوو. دەستنوێژی گرت و گەڕایەوە و دەستی بە نوێژ کرد. کە تەواو بوو، عەبدولحەمیدی بینی، جامێک شیر و نانێکی پێ بوو، لای ئاگردانەکەوە دای دەنا. شێخ ڕووی کردە عەبدولحەمید و پێی وت، "ئەمڕۆ مەهێڵە میوانەکەت بڕوات، کارم پێیەتی."

"نەخێر، هەواکەی ساردە و ئاسمانیش هەورە، لەوانەیە بەفر و باران ببارێت. ئەمڕۆ نابێ بڕوات."

شێخ لە کاتێکدا لە خانەقاکە دەچووە دەرێ، ڕووی کردە یەحیا و وتی، "لێرە بە! نانەکەت بخۆ، من سەعاتێکی تر دێمەوە. شتێک هەیە، دەبێ لەگەڵتدا باسی بکەم."



# هەرچییەکت دەوێت، لە خۆتی داوا بکە

هەرچی لەم دونیایەدایە، وا هەروا لەناو خۆتا
لە خۆت داوای کە چیت ئەوێ، کە وا لەناو خۆتا

عەبدولحەمید وتی، "یەحیا وا هەست دەکەم شێخ کاری بە تۆ بێت. چونکە دەیویست بەتەنیا بیت، ئەگینا بە منیشی دەوت بمێنمەوە. من دەڕۆم. بۆ نیوەڕۆ ساوەرمان هەیە و تۆ میوانی منیت. دوای ئەوەی لەگەڵ شێخدا قسەتان کرد، وەرەوە بۆ ماڵی خۆمان. خۆ ئەگەر قسە و باسەکانیشتان درێژەی کێشا، ئەوا من بۆ نوێژی نیوەڕۆ دێم بۆ ئێرە و پێکەوە دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە."

زۆری نەخایاند، شێخ بەچەند کتێبێکەوە هاتەوە. دەستی یەحیای گرت و لە سووچێکدا دانیشتن. شێخ وتی، "من دوێنێ شەو تا بەیانی خەونم بە تۆوە بینیوە. وا هەست دەکەم تۆ عەودالی شتێکیت! دەروونت پتر لە ڕوخسارت بێقەراری هەقیقەتە. وەلێ کوڕم، مەراغە ئێستا بە دۆخێکی نائارام و خراپدا تێدەپەڕێت. ئەرسەلان ئابە ئەتابەک، کوڕە بچووکەکەی سوڵتان محەمەدی سەلجووقی، زیاتر لە بیست ساڵە خوێنی خەڵک دەمژێت. لەسەر جێنشینی سوڵتان بائەتابەک کەوتوونەتە گیانی یەکتر. لەم بگرەوبەردەیەشدا، خەڵکی دارونەداریان لەدەست داوە. پاشان هێرشی گورجییەکان دەستی پێ کرد و

ئەو دووانە لەگەڵ یەکدا ڕێک کەوتن و بوون بە یەک، بەڵام دوای شکستی گورجییەکان، دیسانەوە کەوتنەوە شەڕ. مەراغە لەلایەن ئاتابەک ئیلدیگوزەوە گەمارۆ درا، وەلێ سەرەنجام سوڵحیان کرد و ئەرسەلانیش دوای ئەوە مرد. ئینجا کوڕەکانی ئەم دوو ئەتابەکە کەوتنە گیانی یەک.

مەراغە ئێستا تا بڵێی نائارام و پڕئاشووبە و تۆش لاوێکی غەریب، زەحمەتە بتوانیت لەوێ خەریکی خوێندنەکەت بیت. من خۆم لە مەراغە بووم و لێی هەڵاتم. زیاتر لە چوار ساڵە هاتووم لەم دێیە نیشتەجێ بووم. کاتێ لەوێ بووم، لەبەر ئەو دۆخە خراپەی، ژمارەیەکی زۆر لە زاناکان ئەوێیان جێ هێشت. من فەزڵی ئەم دێیەم دا بەسەر مەراغەدا. لێرە شێخێک هەبوو، ناوی ئەحمەد بوو، هۆگری من بوو، خانوویەک و ژیانێکی ساکاری بۆ دابین کردم. وەختێ وەفاتی کرد، بەبێ ئەوەی پێشتر پێی وتبێتم، وەسیەتی کردبوو، کە دوای خۆی، لەم خانەقایە من بخەنە جێی ئەو. من بایەخ بە کەلام و حیکمەت دەدەم. لە مەراغە، وانەی کەلامم دەوتەوە و پێگەیەکی تایبەتم هەبوو لەوێ، وەلێ لەدەست گرفتاریی خەڵکەکە و ئەو شتانەی کەسانی ناحاڵی چاوەڕێیان دەکرد لێم، بێتاقەت بووم و ئیتر ئەوە بوو، ئەوێم جێ هێشت. چەند جارێک ناردیان بەدوامدا، وەلێ من نەگەڕامەوە و ئێرەم پێ خۆشتر بوو. دوێشەو خەونم پێتەوە دی، نوقمی ناو خەرمانێک نهێنی بووبوویت. تا کاتی نوێژی بەیانی، من دەرگیری خەونێکی پڕ ڕەمز و ڕاز بووم، کە تۆ لە هەموو دیمەنەکانیدا بوویت. ئەگەر تۆ لێرە بمێنیتەوە، منیش لەم تەنیاییەم دێمە دەرەوە. پێکەوە قسە و باس لەسەر کەلام و





حیکمەت دەکەین، مەنتیق و زانستە سروشتییەکان دەخوێنین و تۆش خۆت لاوێکی پڕجۆش و دڵ و دەروون باشیت، دەتوانیت لەم دەوروبەرە هێمنەی ئێرەدا و لە چۆڵەوانیی ئەم دەشت و کێوانەدا، وردەوردە خۆت دروست بکەیت. بەردەوام هەواڵی مەراغەش دەپرسین، هەرکاتێ ئەوێش ئارام بوو و مامۆستای باشی لێ بوو، ئەوسا دەتوانیت بچیت بۆ ئەوێ. بەڵام کوڕم، دەبێ ئەوە بزانیت، کە تۆ خۆت مامۆستای خۆتیت. دواجار، ئەوانی تریش هەر ئەوەندەی من و تۆ دەزانن. یەک-دوو هۆ بۆ دروستبوونی ئەم دنیایە و سەلماندنی بوونی خودا و چەند شتێک لەسەر مەنتیق و ئەوەی کە نۆ فەلەکمان هەیە و دە ئەقڵ. من و تۆ بەزانینی ئەم شتانە ناگەینە هیچ. دەبێ سەرچاوەی کانیاوی زانین لە ناخ و دەروونی خۆتەوە هەڵبقوڵێت. دەڵێن لە بیابان کرمێک هەیە، کە بە شەو نەبێت، لە کونەکەی خۆی نایەتە دەرەوە. هەناسەی ئەم کرمە وەکوو ئاگر تیشکی هەیە و ڕووناکی دەدات و ئەویش لەبەر تیشکی ئەو هەناسەیەی خۆی، دونیا دەبینێت و هێز وەر دەگرێت و منەتی خۆرەتاو هەڵناگرێت."

یەحیا وتی، "ئەگەر پرکێشی نەبێت، ماوەیەک لە خزمەتتاندا دەمێنمەوە. منیش دوێنێ شەو خەونی خۆشم دەبینی. من گوێ بە پۆشاک و خۆراک نادەم. جلێکی سادە بەرگەی چەند ساڵێکم دەگرێت و ڕۆژی پارچەیەک نانی جۆشم بەسە. ئەوەی بەلای منەوە گرنگە، ئەم شتانە نییە. من سەوداسەری ئازادی و فڕینم. ئێستا پێم بڵێ، ئایا ئادەمیزاد توانای ئەوەی هەیە، لە کۆتی هەموو ئەو شتانەی هەیەتی، خۆی ڕزگار بکات؟"

"بەڵێ!"

"ئەی کە هیچی نەبوو، بە چی بژی؟"

"کوڕم! ئەو کەسەی وا بیر دەکاتەوە، هیچ نادات و ئەو کەسەی کە بە هەمووانیش بدات، وا بیر ناکاتەوە. جیهانی تەوەکول، جیهانێکی خۆشە و هەموو کەسێک نابێتە خاوەنی ئەو زەوقە، تۆ بە شتێک لەو زەوقە گەیشتوویت. نیشانەکانیت تیا دەبینم."

***

بەم جۆرە یەحیا دوو ساڵ لای شێخ مایەوە و بەدرێژاییی ئەم ماوەیە، لە باس و وتووێژدا بوون سەبارەت بە کەلام، حیکمەت، تەفسیر، مەنتیق و زانستە سروشتییەکان و هەندێ کۆڕ و کۆبوونەوەی وەعز و زیکر و سەمای دەروێشانیشیان هەبوو.

یەحیا لەم ماوەیەدا، گەرچی بایەخی بە مەسەلە ئەقڵییەکان دەدا، بەڵام لە دوو ڕووشەوە کەوتبووە ژێر کاریگەریی مەسەلە زەوقییەکانەوە*: یەکێکیان لە ڕووی ئەو ئاماژانەوە، کە لە شێخەوە وەری دەگرتن، دووەمیشیان لە جۆشوخرۆشەکەی دەروونی خۆیەوە. بە ڕۆژ لەگەڵ شێخ دەرگیر بوو و شەوانیش لەگەڵ دەروونە نائارام و ڕووناکەکەی خۆیدا. دەرەوەی لە شێخەوە هێز و تینی وەر دەگرت و دەروونیشی لە سیندوختەوە. بەئاشکرا هەستی دەکرد، کە هەر ڕۆژە هەنگاوێک بەرەو پێشەوە دەنێت و دەبێتە کەسێکی تر و پێ دەنێتە قەڵەمڕەوی دونیایەکی ترەوە.

* مەسەلە عەقڵییەکان و مەسەلە زەوقییەکان: بڕوانە پێشەکیی کتێبەکە.





پاشنیوەڕۆی ڕۆژێکی بەهار، کە لە نزیک باخچەیەکەوە دانیشتبوون، بە شێخی وت، "جاران کە دەمڕوانییە ئەو لەوحەی پیشانت دەدام، هیچ زەوقێکم لە خۆمدا شک نەدەبرد. بەڵام ئێستا هەرجارێک سەیری دەکەم، لە زەوقدا وام لێ دێت، کە خۆشم نازانم چیم لێ هاتووە."

"تۆ ئەو دەمە تەواو پێنەگەییبوویت، ئێستا تەواو پێگەییویت. گیانیش وەکوو جەستە، پێویستی بە پێگەیینێکە، کە تاکوو پێی نەگات، نەک تەنها زەوقی مانا، بەڵکوو مانای زەوقیش نازانێ چییە. ئێستا تۆ پێگەییویت و دەتوانیت لە خەڵوەتی فەنابوونی ناو پەردەی نهێنییەکاندا، لەگەڵ نۆبووکەکانی مانادا هۆگر بیت و لەزەت ببینیتەوە."

"هەموو ئەمانە، لە چاوی میهرەبانی و هیممەتی ئێوەی دەبینم."

"من و تۆ هەردووکمان، دەبێ سوپاسگوزاری عەشق بین، کە:

"گەر عەشق نەبایە و غەمی عەشق نەبایە
ئەم پەیڤە جوانانە کێ بیوتنایە و کێ بیبیستایە؟
گەر ‹با›یش نەبێ، تا سەری زوڵفەکان لا با
کێ ڕوخساری مەعشوق نیشانی عاشقان با؟"

# سیندوخت، لەکوێیت؟

دوێشەو لە سەیلی ئەسریندا خەوم تۆرا لە چاوان
بە یادی خەتی نەرمەمووت خەتم لەسەر ئاو نەخشان
زووزوو ڕوخساری تۆم بە خەیاڵ وێنا ئەکرد
بە یادی ئەو ڕوخسارەت، لە دوورەوە مانگم ماچباران ئەکرد
لە شوێنکاری دیدەی خەولێزڕاوما، تاکوو بەیان
وێنەی خەیاڵی ڕوخساری جوانی تۆم ئەکرد بەیان

دەوروبەری کۆتاییی بەهار، چووبوو پیاسەیەک بەناو باخ و گوڵاندا بکات، بەڕێکەوت لاوێکی هاوتەمەنی خۆی بینی. یەکیان دەناسی. لە خانەقاکە چەند جارێک لای یەکەوە دانیشتبوون. ناوی محەمەد بوو. سڵاوی کرد. محەمەد وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە.

"یەحیا! دەبینم شێخ شەو و ڕۆژ لەگەڵ تۆدایە. بێگومان ئەو شتێک لە ناخی تۆدا بەدی دەکات، ئەگینا ئەوەندە هۆگرت نەدەبوو. دەیان دەروێش و قوتابی دێن و دەچن بۆ لای. بەڵام لەم چەند ساڵەی مانەوەیدا لێرە، ئەوەندەی هۆگر و دڵبەستەی تۆ بووە، بۆ کەسی تر وا نەبووە. قەدری خۆت بزانە، چونکە تۆ دەبیتە پیاوێکی گەورە."

"محەمەد، نازانم، بە هەرحاڵ، وا کەوتەوە کە دەیبینیت! ئەگینا من بەنیازی مەراغە بووم. نە ناوی ئەم دێیە و

نە ناوی ئەم شێخەشم بیستبوو. کەچی ئەوەتانێ، دوو ساڵە لەگەڵ ئەودام و هێشتا لێی تێر نەبووم و دڵم لێی هەڵنەکەنراوە. من لەوەوە بەرەکەت وەر دەگرم و ڕۆحم بە هەناسەی گەرمی ئەوەوە بەندە."

محەمەد، وەک ئەوەی چاوەڕێی هاوەڵی و هاودەمییەک بێت، وتی، "یەحیا، من هەروەختێ چواردەی مانگ ڕێکەوتی هەینی بکات، شەوەکەی لە دەشت و دەر دەمێنمەوە. دوو ساڵە لەسەر ڕاسپاردەی دەروێشێکی ڕاگوزار ئەم کارە دەکەم. بەڵام تەنها لە کۆتاییەکانی بەهار و هاوین و سەرەتای پاییزدا، کاتێ هەوا سازگار دەبێت. ئەگەر پێت خۆش بێت، عەسر پێکەوە دەچین بۆ ئەو کێوە و شەو لەوێ بەسەر دەبەین. سبەینێ هەینییە و چواردەی مانگە، تا نیوەڕۆ دەگەڕێینەوە."

یەحیا پێشنیارەکەی هاوڕێکەی پەسەند کرد و کەوتنە ڕێ. بەدەم ڕێوە، محەمەد لێی پرسی، "یەحیا! کەمێک لەبارەی عەشقەوە قسەم بۆ بکە."

"وشەی عەشق لە " عشقة"وەر گیراوە، کە گیایەکە لە باخدا، لە بنی درەختەوە پەیدا دەبێت و لە درەختەوە دەئاڵێت. هەر دەڕوات، تا هەموو لقوپۆپی درەختەکە دەگرێتەوە و بە ئەندازەیەک خۆی لێوە دەپێچێت و دەئاڵێنێت، کە درەختەکە دەخاتە ئەشکەنجەوە و هەرچیی ئاوی ڕەگی درەختەکە هەیە، هەڵی دەمژێت، تا درەختەکە بەتەواوی وشک دەکات. درەختی بوونی ئینسانیش هەر کە گەشە دەکات و خەریکە بەرکەماڵ دەبێت، عەشق لە کونجێکەوە سەر دەر دەکات و لێوەی دەئاڵێت، تا دەگاتە ئەوەی تەڕایی ئادەمی لەو





ئینسانەدا ناهێڵێت. بەڵێ، عەشق ئەگەرچی ڕۆح بە دونیای بەقا دەگەیەنێت، بەڵام جەستە بەرەو دونیای فەنا پەلکێش دەکات. لەبەر ئەوەی لەم جیهانەدا، هیچ شتێک نییە لە توانایدا بێت بەرگەی عەشق بگرێت:

"دشمن که فتادست به وصلت هوسش
یک لحظه مبادا به طرف دسترسش
نی نی، نکنم دعای بد زین سپسش
گر دشمن از آهن است، عشق تو بسش"*

"محەمەدا! کردار بە قسە ناپێورێ. ویستم وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە، ئەگینا لەم ناو سروشتەدا، کەی کاتی قسەکردنە لەسەر زانین. لە ئاسمان و زەمینەوە زانین دەبارێت."

"ئیدی ناپرسم. ئەم بێدەنگییە خۆشترە. بێدەنگی شتێکی شکۆدار و جوانە."

کانییەک لەو نزیکانە بوو، هەردووکیان چوون و دەسنوێژیان گرت و گەڕانەوە جێی خۆیان. چەندێ تاریکییەکە زیاتر دەبوو، شەو بەشکۆتر دەبوو. وردەوردە خامۆشی باڵی بەسەر هەموو شوێنێکدا کێشا، تەنانەت مێرووەکانیش.

---

* ئەمە شیعری سوهرەوەردی خۆیەتی و لە کتێبی *في حقیقة العشق*دا هاتووە. واتە: دوژمن کە کەوتۆتە داوی ویساڵی هەوەسیەوە، هەرگیز بۆ تاوێک چییە، ناگات بە خۆشی، نا، لە ئێستا بەدواوە، من نزای خراپی لێ ناکەم، با دوژمن لە ئاسنیش بێت، عەشقی تۆی بەسە.

یەحیا هەستی بە کەشێکی ڕۆحی کرد. بڕیاری دا نەخەوێت و تا کۆتاییی شەو، بەبێداری بمێنێتەوە. ئەم بەم کارە ڕاهاتبوو. لە سووچی گاشەبەردێکدا دانیشت و ڕوانییە مانگ، چاوی نەدەترووکاند و هەر تەماشای دەکرد. دەتوت چاوەڕێی شتێکە ڕوو بدات. ناگەهان، بڵێسەیەکی بینی لەگەڵ تاقێکدا، کە بەسەر بڵێسەکەوە بوو. ڕێک وەکوو ئاتەشکەدەکەی شیز. بەڵام نارۆون و تەومژاوی، شتێک لەنێوان بوون و نەبووندا، خەیاڵ و ڕاستیدا. لەپڕێکدا نەما و لە بەرچاوی ون بوو! خوایە ئەمە چی بوو؟ میهرەبانییەکەی جاماسب و دڵسافیی موغەکە و ڕۆحانییەتەکەی سیندوختی هاتەوە یاد. دڵی پڕ بوو لە گریان، بەڵام بۆ ئەوەی محەمەد هەستی پێ نەکات، بەئارامی و بێدەنگ، لەبەر خۆیەوە دەگریا. هەرچەندە نەشیدەویست خەوی لێ بکەوێت، بەڵام خەو بردییەوە. سیندوختی لە ئاسماندا بینی، گەلێ دوور. تا دەهات، دوورتریش دەکەوتەوە. یەحیا بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێت، هاواری کرد، "سیندوخت! سیندوخت؟ سیندوخت لەکوێیت؟"

محەمەد بە هاوارەکەی ئەو لەخەو ڕاپەڕی. بەپەلە خۆی گەیاندە لای یەحیا. یەحیا خۆیشی لەو هاوارەی خۆی خەبەری بووبۆوە و نوقمی غەم و فرمێسک بووبوو. محەمەد بە شپرزەییەوە وتی،

"یەحیا! ترسایت؟ چی بووە؟ ترساویت؟"

"نەخێر."

"وتم ڕەنگە گورگێک یان ورچێکت دیبێت و ترسابێت."

"نەخێر! بێخەم بە، شتێکی وا نییە."





"ئەی کەواتە چییە؟"

"هیچ! وا بزانم خەونم بینی."

نەیویست باسی حاڵی خۆی بۆ بکات. هەردووکیان چوون بۆ سەر کانییەکە و دەستنوێژیان گرت و تا سپێدە سەرگەرمی نوێژ و نزا بوون. وەختێ ئاسمان وردەوردە خەریک بوو ڕووناک دەبۆوە، لە کێوەکە هاتنە خوارێ و بەرەو لادێکە ڕۆیشتنەوە. یەحیا هێشتا هەر نوقمی ئەو کەشە بوو. بۆیە بڕیاری دا، جارێکی دی بۆ ئەو کێوە بچێتەوە.

## له باخی شەودا

وەختێ سێوی زیوینی مانگ پێئەگا
کاتی ویساڵی ئێمەیە لە باخی بەرینی شەو

دەمەوعەسر چوو بۆ لای شێخ. ماجەراکەی دوێنێ شەوی خۆی بۆ باس کرد و وتی، "حاڵێکی باشم هەبوو. حەز دەکەم ئەم چەند شەوە کە دنیا مانگەشەوە، سەرلەنوێ بچمەوە بۆ ئەو کێوە."

"زۆر باشە، هەرشتێک حاڵت بگۆڕێت و دەروونت ئاوەڵا بکات، باشە. ئەو کێوانە خۆش و دڵگیرن. ئەو دوندانە لە ئاسمانەوە نزیکترن. دوێنێ شەو منیش خەیاڵم لات بوو و نزام بۆ کردیت."

لە خانەقاکەی شێخ هاتە دەرێ و ملی ڕێی گرت. تا ئێوارە بەڕێوە بوو. هەوڵی دەدا بەرەو دوندی کێوەکە بچێت. لە بناری کێوەکە، لای کانییەک لای دا و کەمێک ئاوی خواردەوە و ئینجا درێژەی بە ڕۆیینەکەی دا. بەتەنیا بوو و خێرا بەسەر کێوەکەدا سەر دەکەوت. مانگ هەڵهاتبوو، سێبەری دەوەن و گاشەبەردەکان، هێندەی تر نهێنیی بەو ناوە بەخشیبوو. بە دۆڵێکی بچووکدا ڕۆیشت، کە ئاوی پیا تێدەپەڕی. بڕیاری دا بە قەراغی دۆڵەکەدا ڕێگەکەی بەرەو دوندی کێوەکە درێژە پێ بدات.

لە شوێنێکی تری کێوەکەدا ئاوێکی بینی، کە لە بەرزیی دوو مەترەوە دەڕژایە خوارەوە و تاڤگەیەکی ئارام و بچووکی دروست کردبوو. کەمێک لە ڕێگەکە لای دا، لە دەستەڕاستی دۆڵەکەوە، بەرەو سەرەوە چوو، کانی و حەوزێکی بچووکی هاتە ڕێ، کە چەند بەردێک بەدەوریەوە بوو. لەسەر یەکێک لە بەردەکان نوێژی عیشای کرد. پاشان خورجینەکەی دەر هێنا، کە گەنمی برژاوی تیا بوو لەگەڵ پارچەیەک نانی جۆ و لەسەر سووچێکی بەردەکە دای نا. لەسەر بەردەکە جێی بۆ ڕاکشان و دانیشتنی خۆی خۆش کرد. ڕووەو قیبلە دانیشت، بۆ ئەوەی وەختێ مانگ هەڵهات، ڕێک بەرامبەری بێت.

خۆی بە خوێندنەوەی ئایەت و زیکر و وێردەوە خەریک کرد، بەڵام سەرتاپای بوونی نوقمی ئەو کات و یادگارییانە بوو، کە ڕوخساری خۆیان پیشان دەدا. باوک و دایکی هاتنەوە یادی. دڵی تەنگ بوو. هەمووی چەند ڕۆژێکە لە ڕێی شێخەوە وەڵامی ئەو نامەیەی وەر گرتەوە، کە ناردبووی بۆ سوهرەوەرد. نووسیبوویان، کە ئێمە سەلامەتین و پەتایەک بە شاردا بڵاو بۆتەوە، نزایان بۆ شار کردووە و سەیدێک سواری ئەسپ بووە و پەتاکەی ڕاوەدوو ناوە. وەختێ تەرمی کوڕەکەی ڕەحمانمان برد بۆ گۆڕستانەکە، لە سوهرەوەردەوە هاوارمان کرد، گەر کەسێکی تر بمرێت، جێ بۆ ناشتن ماوە؟ ئەویش وەڵامی داینەوە، نەخێر، جێ نەماوە. ئیتر ئەمە نوقڵانەیەک بوو، کە ئیدی بە پەنای خودا مەرگ و نەخۆشی نامێنێت. هەرچەندە ئەوەش خودا خۆی دەیزانێت، بەڵام تۆ مەیەرەوە بۆ سوهرەوەرد، چونکە تا ئێستاش، ئاسەواری پەتاکە ماوە و ئاوڵەش بڵاو بۆتەوە و بارودۆخی ڕێگەوبانیش خراپە.





یەحیا جارجار کەڵکەڵەی ئەوەی دەچووە سەر، کە ئەگەر وەزعی مەراغە باش بوو، سەرێک لە دایک و باوکی بداتەوە و چەند شەوێکیش لە شیز بمێنێتەوە. بەڵام سەرباری هەموو ئەو خوشەویستییەی بۆ دایک و باوکی و بۆ شیز هەیبوو، جۆرێک لە دوودڵی بەسەریدا زاڵ دەبوو و نەیدەتوانی ئەو بڕیارە بدات. دڵی ڕێی پێ نەدەدا بگەڕێتەوە. ئەو ڕاسپاردەیەی باوکیشی ڕۆڵی هەبوو.ماڵی دڵی لەو خەیاڵاتە پاک کردەوە و وەکوو پڵنگێکی برسی، بێئۆقرە خۆی دایە دەست چاوەڕوانیی ڕووداوەکان. نوێژی کرد و هەندێ ئایەت و وێردی خوێند. بڕیاریشی دا ئەو شەوە، تا پێی دەکرێ، نەخەوێت.

دەستی برد بۆ خورجینەکە، ئاوریشمە سەوزەکە و مۆرە گڵێنەکەی دەر هێنا. هێشتا بۆنی عەتریان لێ دەهات. عەترێکی پڕنهێنی و ڕۆحنەواز. لەبەر تریفەی مانگەکەدا، ئاوریشمەکەی دا بەسەر سووچێکی تاقە بەردەکەدا. مۆرە گڵێنەکەی خستە سەری و بۆ ماوەیەک لێی ڕاما. بڕیاری دا لە سبەینێوە بۆ ماوەی چل ڕۆژ بەڕۆژوو ببێت و لەوێ بمێنێتەوە و بۆ دێکە نەگەڕێتەوە. لە دڵی خۆیدا وتی، باش بوو بە شێخم وت چەند شەوێک لە کێو دەمێنمەوە. نیگەرانم نابێت و گەر نیگەرانیشم بوو، ئەوا لە ڕۆژانی ئاییندەدا وەڵامی بۆ دەنێرم، کە تا سی-چل ڕۆژی تر چاوەڕێم نەبێت.

بەم جۆرە یەحیا چووە قۆناغێکی تری ئەزموونە ئیشراقییەکانی خۆیەوە. بیری چوو وەڵام بۆ شێخ بنێرێت. کەسی شک نەبرد وەڵامی پیادا بنێرێت. دوو هەفتە تێپەڕیبوو، کاتێ شێخ بە نیگەرانییەوە لە محەمەدی پرسی، "هەواڵی

یەحیا چییە؟"

"هیچ! چەند ڕۆژێک لەمەوبەر چووم بۆ کێو، بینیم. چووم بەرەو ڕووی، بەڵام کاتێ بینیمی، ڕۆیشت و دوور کەوتەوە! دەتوت منی نەبینیوە، یا نەیناسیوەمەتەوە. دوێنێش چووم بۆ کێو. حەزم دەکرد بیبینم، بەڵام لەوێ نەمابوو. لەوانەیە بەرەو دوندی کێوەکە چووبێت. لەوانەیە بگەڕێتەوە و لەوانەشە لە کێو چلە بەسەر بەرێت، نازانم."

"باشە، خوا ئاگای لێی بێت. خودایا، ساتەکانی گەرموگوڕ و دڵ و دەروونی شاد بێت."



# لە مانگەوە تا خۆر

دەستێ ڕاوەشێنە، تا لە سەری پەنجەکانتەوە
سەد دڵۆپە بێنە خوارێ
هەر دڵۆپێ ببێتە خۆرێ
بینە سەد سووژنی نوور
تا شەوی ئێمە پڕ کەن لە ڕۆچنە

شەو تاریک بوو و مانگیش تا سپێدە هەڵنەدەهات. چل شەو بوو لەو کێوانە بوو. هەموو ڕۆژێک بە تاقی تەنیا دادەنیشت و جۆشوخرۆشی هەستێک دای دەگرت، کە لە چلەکەیەوە بەدەستی دەهێنا. مەگەر ڕۆچنەیەک لە دەروونیدا بکرێتەوە و ڕووناکییەکی لێوە دەر بکەوێت. بەڕۆژوو دەبوو و تا پارشێو نانی نەدەخوارد. تەواوی شەو نوێژی دەکرد و سەرگەرمی وتنەوەی قورئان و نزا و وێرد دەبوو، تا پێڵووەکانی چاوی قورس دادەهاتن.

زۆر لاواز بووبوو، سەری خستە سەر بەردێک، لەپڕێکدا ڕووناکییەکی بەتینی بەدی کرد، کە دەتوت هەورەتریشقەیە، پێدەچوو گرمەیەکیشی لەگەڵدا بووبێت. بە چێژ و شادییەوە، هەستی کرد وا لەبەر ئاوی گەرمی تاڤگەیەکدا. بەبێ ئەوەی بیەوێت، خەو چووە چاوی. زوهرەی لە خەوندا بینی، گۆزەیەکی بە دەستەوە بوو و بەرەو کانییەکەی خوار

گەڕەکەکەیان دەڕۆیشت لە سوهرەوەرد. چەند هەنگاوێک بەدوایدا ڕۆیشت، بەڵام زوهرە بەپەلە دوور کەوتەوە. یەحیا هەر ڕۆیی، تا گەیشتە نزیک کانییەکە، لەوێ زوهرە نا، بەڵکوو سیندوختی بینی. سەری دانەواند. دەتوت شەرم لە سیندوخت دەکات! سیندوخت بانگی کرد، "یەحیا!"

یەحیا سەری بەرز کردەوە. سەیری سیندوختی کرد و سیندوخت پێی وت، "کەمێک سەرت بەرزتر بکەرەوە، سەرووتر بڕوانە، سەرووتر."

یەحیا سەیری سەرووتری کرد! موغەکەی بینی، کە لە ئاتەشکەدەکەی شیزدا، باسی لە ئازادیی ڕۆح دەکرد و دەیوت وەدەستهێنانی ڕۆچنەیەک، کە بە ڕووی خۆردا کراوە بێت، کارێکی ئاسان نییە. دەبێ تەقەللای بۆ بدەیت. ئینجا ڕووی کردە یەحیا و وتی، "بیرت نەچێت، ئەو شەوە پێم وتیت، کە زەردەشت لە سی ساڵیدا بۆ سەهۆڵان ڕۆیشت و لەوێ چووە خەڵوەتەوە، تا ئیلهامی بەدەست هێنا. ئەم نهێنییەت بیر نەچێت."

دیسانەوە سیندوخت وتی، "سەرووتر بڕوانە."

زیاتر سەری بەرز کردەوە. لە سەرووترەوە، بارەگای خۆری بینی، کە ڕووناکیی پەخش دەکردەوە و ڕۆحی دەبووژاندەوە و گوێی لە دەنگێک بوو وتی، "منم ئیزەدی ڕووناکی و خۆر. منم کە بەر لە خۆر هەڵدێم و پاش ئاوابوونیشی، هەر لەگەڵتانم. لەناو ناخی خۆتاندا بەدوامدا بگەڕێن. من دوژمنی خەو و غەفلەتم! هەمیشە بێدارم و لە هەموو جێیەک ئامادەم و لەگەڵ هەمووواندا میهرەبان و بەخشندە و ئیلهامبەخشم."





یەحیا ڕوانییە ناخی خۆی. هەستی کرد وا ناخی سپێدە دەدات. بێ ئەوەی بیەوێ، کەوتە نزا: "ئەی خولقێنەری ڕووناکی! ئەی ڕووناکیی ڕووناکییەکان! شادمانیی ڕۆحی و فەڕی نوورانیم پێ ببەخشە و خەون و ئیلهامم بەرکەماڵ بکە."

هێشتا لە نزاکردندا بوو، وەختێ شێخ بانگی کرد، "یەحیا، یەحیا، وەرە."

بەو دەنگەی شێخ خەبەری بۆوە. هەموو بوونی نوقمی چێژێکی ناڕوون و پیوار بوو. تەماشای ئاسمانی کرد. زۆری نەمابوو ڕۆژ بێتەوە. بەرەو کانییەکە چوو، تا دەستنوێژ بگرێتەوە. نوێژی بەیانیی کرد، بەڵام چیی تر نییەتی ڕۆژووی نەهێنا و ملی ڕێی گرتە بەر، تا بچێتەوە بۆ لای شێخ.

# دەڕۆم، تا بڕۆم

ئەمڕۆ چەند سەوزم
جەستەم چەند هوشیارە!

بەپەلە لە کێوەکە چووە خوارێ. دێیەکە زۆر دوور نەبوو. دەنگێکی هاتە گوێ. یەکێک لە وێنجەزارەکەی قەراغ ڕێگەکەوە بانگی کرد، "یەحیا، یەحیا! وەرە بۆ ئێرە."

دەنگی شێخ بوو. خێرا بەرەو ڕووی چوو. باوەشیان بە یەکتردا کرد. شێخ وتی، "گەرچی ڕواڵەتت زۆر پەرێشانە، بەڵام شادمانی لە سیماتدا دەبینم. خوا حەز بکا تەقەللات بێپاداشت نابێت."

یەحیا بەبێ ئەوەی باس لە حاڵی خۆی بکات، پرسیی، "ئەی ئێوە بۆچی هاتوون بۆ ئێرە؟"

"دراوسێکەمان لێرە وێنجە درەو دەکات، ئیتر منیش حەزم کرد سەرێکی لێ بدەم و لەوانەیە بیری تۆشم کردبێت."

دراوسێکەی شێخ، کە ناوی ئەحمەد بوو، کاسەیەک دۆی بۆ یەحیا ڕاگرت. ئەویش کە شەکەت بوو، کەمێکی لێ خواردەوە و پاشان لەگەڵ شێخدا کەوتنە ڕێ.

شێخ پرسیی، "خوا بیکات، باش بوو؟"

"چیتان پێ بڵێم، هەمووی خەون و خەیاڵ بوو!"

"باشە، هەر ئەو خەون و خەیاڵاتەیە، کە سەرەنجام دەبنە

ڕاستی. منیش خەوێکم بە تۆوە دیوە. هەر بۆیە پەلەم بوو، هەرچی زووە، بۆتی بگێڕمەوە. دوێنێ شەو لە خەونمدا شێخێکی لاوم بینی، هەواڵی تۆی دەپرسی. وتی: ‹من عەینولقوزاتی هەمەدانیم، بە یەحیا بڵێ بچێت بۆ مەراغە و لەوێ درێژە بە خوێندنەکەی بدات. هەفتەیەک دوای گەیشتنی بە مەراغە، هەواڵێکی لە سوهرەوەردەوە پێ دەگات. نابێ ئەو هەواڵە کاری لێ بکات و دەسبەرداری خوێندنەکەی ببێت، چونکە کات کورتە و دەبێ سەرقاڵی بەرکەماڵیی ناخی خۆی بێت.›

"یەحیا، ئەم خەونە منی نیگەران کردووە. من هۆگری تۆ بووم. حەز ناکەم بڕۆیت، بەڵام هەر دەبێ بشڕۆیت. لە سەرێکی تریشەوە نیگەران نیم، لەبەر ئەوەی جیهان پەهلەوان ئەتابەک محەمەد جڵەوی بارودۆخەکەی کردووە و ناوچەکە ئارامە. دەڵێن مامۆستا مەعروفییشی لە ڕەیەوە هێناوە بۆ مەراغە و خەڵکی لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێ دەکەن، تا لەسەر دەستی ئەو فێر ببن. دوو-سێ ڕۆژ لەمەوبەر ئەم هەواڵەم لە تەهماسب بیست، کە دوکاندارە و هاموشۆی مەراغە دەکات و براکەی خزمەتگوزاری مزگەوتی گەورەی شارە."

یەحیا، لەکاتێکدا نیگەران دەینواند، وتی، "من نیگەرانی سوهرەوەردم. هیچت نەبیستووە؟"

"نەخێر، هیچم نەبیستووە، بەڵام سوپاس بۆ خوا، هەموو شوێنێک هێمنە. نیگەرانی ئەو شتەی، کە لە خەونەکەی مندا هەبوو؟ نیگەران مەبە، خوا بیکات، باش دەبێت. لەوانەیە باوکت بیری لەوە کردبێتەوە، ژنت بۆ بهێنێت. بە هەرحاڵ،





هیوادارم تووش نەبیت و بتوانیت درێژە بە ڕێگەکەی خۆت بدەیت."

"کەواتە من مۆڵەتتان لێ وەر دەگرم و سبەینێ دەڕۆم. دەبێ خواحافیزی لە هەمووان بکەم. بەتایبەتییش عەبدولحەمید و جەنابتان، کە لەم ماوەیەدا درێختان دەرهەقم نەکرد و دەستتان گرتم و منتان بە دنیای عەشق و زانین ئاشنا کرد."

# گەڕان بەدوای حەقیقەتدا

گەرچی دەرەتانێکی ئاشکرا نییە لەم دونیایەدا
وەلێ هێشتا، هەر ئەبێ وەک یوسف هەڵێین

تەهماسب ناوونیشانی عوسمانی برای دابوو بە یەحیا، کە خزمەتگوزاری مزگەوتی گەورە بوو لە مەراغە، تا ئەگەر پێویستی پێ بوو، بچێت بۆ لای و هاوکاریی بکات. لەو سەردەمەدا و لە هەموو شوێنێک، میرەکان ترسیان لە فیداییيە ئیسماعیلییەکان لێ نیشتبوو و گومانیان لە هەموو کەسێکی غەریبەش دەکرد، بەتایبەتییش گەر ئەو کەسە خوێندەوار بووایە.

عوسمان دوای ئەوەی مۆڵەتی لە کاربەدەستەکەی ئیمامی مزگەوتەکە وەر گرت، ژوورێکی بچکۆلەی لە مزگەوتەکەدا بە یەحیا دا. ئینجا یەحیا کەوتە سۆراخی مامۆستاکانی جارانی خۆی. هەم بە بینینی ئەوان و هەم لە ڕێی هاوپۆلەکانی سەفەری پێشووتری خۆیەوە بۆ مەراغە، لە بارودۆخی خوێندن و وانەکانی پرسییەوە. بەر لە هەموو شتێک، سۆراخی وانەکەی مەجدەدین جیلیی کرد، کە ماوەیەک لەمەوبەر لە ڕەیەوە هاتبوو بۆ مەراغە. وتیان لە ڕۆژێکدا دوو جار وانە دەڵێتەوە، جارێکیان کەمێک دوای خۆرکەوتن و جارەکەی تریش، دوانیوەڕوان، پاش نوێژی عەسر.

وانەی بەیانیی بریتییە لە وتنەوەی *ئیشاراتی* ئیبن سینا و وانەی عەسرانیشی بنچینەکانی بیروباوەڕە، کە تیایدا کتێبی *ئیقتیسادی* غەزالی دەڵێتەوە.

یەحیا لە وانەکەی بەیانیدا بەشدار بوو. دەیانوت وانەی عەسرانی گشتییە و هەموو کەسێک دەتوانێ بەشداریی تیا بکات، بەڵام وانەی بەیانیی تایبەتییە و هەموو کەسێک وەر ناگرێت، لەبەر ئەوەی کەسانی لاواز، ترسی ئەوەیان لێ دەکرێ بە لاڕێدا بچن. یەحیا، کە لەوانی تر زووتر هاتبوو، شێخێکی لاوی دی، کە لەپێشەوەی مەجلیسەکە دانیشتبوو، سڵاوی کرد و لەلایەوە دانیشت. دوای سڵاو و یەکترناسینێکی کورت، لە یەحیای پرسی، "کارت بە کێیە؟"

"بە کەس، دەمەوێ لە وانەکەی مامۆستادا بەشدار بم."

"کێیت و لەکوێیوە هاتوویت؟"

"ناوم یەحیایە و خەڵکی سوهرەوەردم. لە مەراغە و ئەسفەهان وانەم خوێندووە."

"چیت خوێندووە؟ لە کەییەوە لە مەراغەیت؟"

"پێشەکییەکان، تەفسیر، فیقهـ مەنتیق، کەلام و حیکمەت، تازەش هاتووم بۆ مەراغە. هەڵبەتە چەند ساڵێک لەمەوبەر جارێکی تر هاتووم، بەڵام دوای ماوەیەک چووم بۆ ئەسفەهان. ئیتر ئەوەتانێ، وا دووبارە هاتوومەتەوە بۆ ئێرە، بەتایبەتییش لەبەر جیلیی سەروەرمان."

"وانەکەمان ئیشاراتی ئیبن سینایە. لە بابەتی *پێنج سەنعەتەکە* داین، نازانم ئاخۆ دەتوانیت سوودی لێ ببینیت؟"

"بۆ نا، ئەگەر مامۆستا ڕێم پێ بدات."

مامۆستا لەگەڵ چەند کەسێکی تردا خۆیان کرد بە





ژووردا. لەگەڵ قوتابییەکاندا چاکوچۆنیی کرد و ئینجا چوو لە شوێنە تایبەتەکەی خۆی دانیشت. شێخە لاوەکە یەحیای پێ ناساند و داوای لێ کرد، کە لە وانەی حیکمەتدا بەشدار بێت. جیلی بە گومانێکەوە وتی، "کێشە نییە. با بزانم!"

پاشان ڕووی کردە یەحیا و بە میهرەبانییەکەوە لێی پرسی، "چۆن *حەد* بەدەست دەهێنین؟"

یەحیا بە متمانەوە و نەزاکەتەوە وتی، "من بڕوا ناکەم بتوانین حەدی ڕاستەقینەی شتێک بەدەست بهێنین."

"بۆچی؟"

"لەبەر ئەوەی حەد لە ڕوانگەی مەشائییەکانەوە، بە فەسڵ تەواو دەبێت. بەڵام ئێمە ئەگەر شتێک نەناسین، لەکوێوە بزانین فەسڵەکەی چییە؟*"

جیلی، لە کاتێکدا زەردەخەنەکەی نیشانەی خۆشحاڵی و ڕەزامەندی بوو، ڕووی کردە شێخە لاوەکە و وتی، "محەمەد، تا ئێستا هەر تۆمان هەبوو کێشە و پرسیاری سەیر و سەمەرە بورووژێنیت، ئەوا ئێستا بوون بە دوو! خوا ڕەحم بە من بکات!"

ئینجا وانەکەی دەست پێ کرد. کاتێ وانەکە کۆتایی هات، مامۆستا ڕووی کردەوە هەمان لاو، کە محەمەدی کوڕی عومەر بوو، کە بە فەخرەدین ڕازی ناسرابوو و پێی وت، "فەخرەدین! یارمەتیی بدە شوێنێکی باشی دەست بکەوێت. هەر کەموکووڕییەکیشی هەبوو، بە من بڵێ، ئاگاشت لێی بێت، هاودەم و حەریفێکی باش دەبێت بۆت. گەرچی دەبێتە مایەی دەردەسەریی زیاتر بۆ من، بەڵام لەو بڕوایەدام،

* حەد و فەسڵ: دوو زاراوەی فەلسەفین.

دەرەقەتی تۆش دێت."

بەم جۆرە یەحیا لە مەراغە دەستی بە خوێندنەکەی کرد. ئەو جگە لەو دوو وانەیەی جیلی، بۆ لای مامۆستای تریش دەچوو. لە کۆتاییی هەفتەکەدا، سۆراخی شوێنی کاروانسەراکانی کرد، تا بزانێ ئاخۆ کەسێک لە سوهرەوەردەوە یان دەوروبەری ئەوێوە بۆ ئێرە هاتووە، تا هەواڵێکی دایک و باوکی بداتێ؟ وتیان جارناجارێک کەسانێک لەوێوە دێن، بەڵام ئێستا کەسێکی وا نییە.

یەحیا ویستی بگەڕێتەوە، کاتێ بانگیان کرد و وتیان بازرگانێک، کە ناوی حسەینە و خەڵکی ئەبهەرە، لێرەیە، بەڵام چووە بۆ بازاڕ و ئێوارە دەگەڕێتەوە. یەحیا ڕۆیشت و پاشان دەمەوئێوارە گەڕایەوە بۆ کاروانسەراکە. بە هۆی ئەو خەونەوەی کە شێخ پێوەی بینیبوو، نیگەران بوو. باش بوو کابرای بازرگان لەوێ بوو. دوای سڵاو، بە دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەوە وتی، "من یەحیام، کوڕی حەبەشم لە سوهرەوەرد. نازانم ئاخۆ هەواڵێکی سوهرەوەرد دەزانیت، تا بزانم دایک و باوکم چۆنن؟"

کابرا وتی، "بەڵێ، من هاموشۆی ئەوێ دەکەم، خاڵم خەڵکی سوهرەوەردە. لەوانەشە بیناسیت، ناوی عیسایە، عیسای گۆزەگەر."

"بەڵێ، دەیناسم. پیرەمێردێکی باشە. دراوسێمان نەبوو، بەڵام چەندەها جار لە بازاڕ بۆ دوکانەکەی چووم."

"بەڵێ، خۆیەتی."

"باشە، ئەی دەنگوباسی ئەوێ چییە؟ زۆر نیگەرانم، نیگەرانی دایک و باوکم."





"بۆ؟ هیچت بیستبوو؟"

"نەخێر، بەڵام کەسێک خەونێکی دەیبوو بەوەوە، کە هەواڵێکی ناخۆشم پێ دەگات."

"خەون هیچ نییە. بنیادەم هەزار جۆر خەون دەبینێت."

یەحیا بە سەروسیما و قسەکردنە پڕ لە دوودڵییەکەی حسەیندا، زیاتر نیگەران بوو و دڵی خەبەری دا، کە شتێک ڕووی داوە. بە سووربوونەوەوە وتی، "من منداڵ نیم و بە قەزای خوا ڕازیم. سوێندت دەدەم بە خوا، هەرچییەک هەیە، پێمی بڵێیت."

"چی بڵێم؟ هەواڵەکە ناخۆشە. دایکت و باوکت هەردووکیان... هەردووکیان نەخۆش بوون... زۆر..."

"من سوێندم دایت. دیارە دایکم وەفاتی کردووە یا باوکم..."

یەحیا دایە قوڵپی گریان و حسەین دەستی گرت و فرمێسکەکانی سڕی. ماچێکی کرد و دڵی دایەوە و وتی، "لەگەڵتدا دێم بۆ ماڵەکەت و لەوێ هەقیقەتەکەت پێ دەڵێم."

ئینجا پێکەوە بەرەو حوجرەکەی یەحیا ڕۆیشتن.

# لەخۆباییبوون و غەفڵەت

هەراوزەنای ژیان
زەوق و حاڵی بیر بردینەوە

بە فەرمانی جیلی، پرسەیەکیان بۆ دایک و باوکی یەحیا ڕێک خست، کە چل ڕۆژ دەبوو کۆچی دواییان کردبوو. یەحیا بە پێویستی نەزانی بگەڕێتەوە بۆ سوهرەوەرد، جگە لەوەی شێخیش لە گەڕانەوە بۆ ئەوێ وریای کردبۆوە. لە نامەیەکدا، بەشە میراتییەکەی خۆی بە خوشکەکەی بەخشی و بەرامبەر بەوەش، داوای کرد غوڵامەکەی باوکی ئازاد بکەن.

مەجدەدین و ڕازی و هەروەها ئەوانی تریش یەحیایان خۆش دەویست. یەحیا بە ڕواڵەت لەگەڵ ئەواندا بوو و لە ناویشەوە لەگەڵ جیهانە تایبەتییەکەی خۆیدا، بەڵام وردەوردە لەژێر کاریگەریی کۆڕە گەرمەکانی مەجدەدین و سەرنجە وردەکانی ڕازیدا، دەرگیری مشتومڕ دەبوو.

هەر ڕۆژە گفتوگۆیان لەسەر شتێک دەکرد و شەوانەش بیریان لە کۆڕەکەی سبەینێ دەکردەوە. یەحیا و محەمەد، هەریەکە بەجۆرێک بۆ سەلماندنی بوونی خۆیان، بەرامبەر بە یەکدی ڕکابەرییان دەکرد. مەجدەدینیش لە کاتێکدا وەڵامی هەردووکیانی دەدایەوە، پتر دنەی دەدان. محەمەد زیاتر

بەرگریی لە هەڵوێستی ئەشعەرییەکان* دەکرد، لە کاتێکدا یەحیا نە ئەشعەرییەکانی پێ قبوڵ بوو و نە ئیبن سینا**.

ڕۆژێکیان لە وانەی ئیشاراتدا، لە شێوەی چوارەمدا، کاتێک باسی جیلی لەسەر ئەوە بوو، کە *واجب الوجود* بوونی پەتییە، ئەو و محەمەد ڕازی، هەردووکیان دژ بەو بۆچوونەی ئیبن سینا بوون. یەحیا وتی، "مامۆستای گەورە! لە هیچ بوونەوەرێکدا بوون جێی چییەتی ناگرێتەوە و ناشتوانێ جێی بگرێتەوە."

"جگە لە واجب، کە چییەتیی واجب، هەمان بوونی ئەوە."

"تەنانەت لە واجبیشدا، چییەتی دەبێ لە بوون جیا بێت. کاتێک حوکم دەدەن لەسەر ئەوەی لێرەدا شتێک هەیە، ئیدی ئەو شتە واجب بێت یان مومکین، جگە لە بوونەکەی، چییەتیشی لەئارادایە."

"ئەوە کەلامزانەکانن، کە دەڵێن واجب چییەتییەکی نەزانراوی هەیە. واتە ناتوانین پەی بە گەوهەری ماهییەتی واجب ببەین. تۆش هەمان شت دەڵێیت؟"

"نەخێر، من ماهییەت و چییەتیی واجب بە شتێک دەزانم، قابیلی پێناسەکردن و پەیپێبردنە. گەرچی لەبەر ئەوەی بەڵگەنەویستە، پێویست بە ناساندن ناکات."

---

* ئەشعەرییەکان: ڕێبازە سوننییەکەی ئەبو حەسەنی ئەشعەری، کە بە یەکێک لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەژمێردرێ. ئەشعەری دژ بە موعتەزیلە بوو.

** ئیبن سینا: زانا و پزیشک و فەیلەسووفی بەناوبانگ، خاوەنی ٢٠٠ کتێب لە بواری جۆراوجۆردا، بەڵام زۆرینەیان سەبارەت بە فەلسەفە و پزیشکین. ناوازەترین کتێبی قانون لە پزیشکیدایە، کە بۆ چەند سەدەیەک گەورەترین سەرچاوە بوو لە پزیشکیدا و لە زانکۆکانی خۆرئاوادا دەخوێنرا. لەژێر کاریگەریی فارابیدا بوو. لە هەمەدان کۆچی دوایی کرد.





"ئەی چییە؟"

"ڕووناکی (نوور)، ڕووناکیی گەوهەری!"

"کەواتە بەم پێیە، تۆ واجب بە شتێک دەزانیت لەناو ڕەگەزی ڕووناکی و گەوهەردا؟"

"بەڵێ، وایە."

"کەواتە تۆ واجب بە پێکهاتەیەک دەزانیت. لەبەر ئەوەی ئەگەر واجب ڕەگەزی هەبێت، ئەوا فەسڵیشی دەبێت و دەبێتە پێکهاتەیەک لە ڕەگەز و فەسڵ، ئەمەش بەهەڵەداچوونە. لەبەر ئەوەی پێکهاتن نیشانەی پێداویستییە و لەگەڵ وجوبدا یەک نایەتەوە."

"نا، هەرگیز، لەبەر ئەوەی بۆ جیاکردنەوەی واجب لە ڕووناکییەکی تر، پێویست بە فەسڵ ناکات. چونکە تایبەتمەندی و دانسقەییی واجب، لەچاو ئەوانی تردا بەهێزترە و دوو هێندەیە. ئەو لە ڕێی هێز و بەرکەماڵیی ناکۆتاییی خۆیەوە، تایبەتمەندیی واجبی خۆی لە بوونەوەرە کەموکووڕ و کۆتاکانەوە بەدەست دێنێت..."

بەم جۆرە یەحیا هەموو ڕۆژێک سەرگەرمی وتووێژ بوو. بایەخدانەکەی جیلی پێی و توانا و هەڵکەوتوویی یەحیا خۆی، ببووە جێسەرنجی زانایان و بۆ کۆڕوکۆبوونەوە گرنگەکان بانگهێشت دەکرا و هەمیشە ڕوویان لێ دەنا. گەرچی وای لێ هات قوتابییان لەدەوری کۆ دەبوونەوە و ببوو بە مامۆستایەکی لێهاتوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەر بۆ وانەکانی جیلی دەچوو.

جیلی دەیوت، "کەسێکم نەدیوە بیری لەو تیژتر بێت. هەر دەڵێی تیرەستێرەیە، کە پێی دەڵێن شیهاب! بۆیە پێم

خۆشە نازناوی شیهابەدینی بدەینێ. هەر بەڕاستی ئەم کوڕە سەیروسەمەرەیە!"

فەخری ڕازییش وتی، "دڵێکی هەیە، دەڵێی زاری گڕکانە! کەس دەڕۆستی نایەت."

شەوی ٢٧ی ڕەجەب، واتە شەوی میعراج، ڕێوڕەسمێکیان لە خانەقای گەورەی شار ساز کرد. یەحیاش لەگەڵ چەند قوتابییەکیدا چوون بۆ ئەوێ. سەمای دەروێشانەیان کرد و حاڵیان لێ هات. یەحیا بڕیاری دا، ئەو شەوە تا بەیانی، لە خانەقاکە بمێنێتەوە. لە حەوشەی خانەقاکە سەرقاڵی دەسنوێژ بوو، کاتێ دەروێشێک دەستی خستە سەر شانی و ئاماژەی بۆ کرد، تا بۆ سووچێکی حەوشەکە لەگەڵیدا بڕوات و لەوێ لەسەرخۆ و بە هێمنی پێی وت، "دەروێش، وریا بە، ئەقڵ فریوت نەدات! بەئاسانی ئەو ڕێگەیە بەر مەدە، کە پێشتر گرتبووتە بەر. وریای خەڵکی ئەم ڕۆژگارە بە، کە هەریەکە بە بیانوویەک خۆی نەکات بە هاوشانت. تا دەتوانیت، وەکوو ئەسپی کێوی سەرکێش و یاخی بە، وەکوو مانگ و خۆر وێڵ و سەرگەردان بە! ببە بە کۆڵەوژی ئاگری ناخی خۆت. مەبە بە ئاگردانی شێخە دوکاندارەکان! دەردەسەریی مامۆستایی، هیچی لە قوتابیێتی کەمتر نییە. خۆت بدۆزەرەوە و لە خۆت تێبگە!... خواحافیز!"

دەروێش ئەمەی وت و دوور کەوتەوە و چیی تر یەحیا ئەو کەسەی لە مەراغە نەبینییەوە.



# خەونێك

ڕوو بکەرە مەی و موتریبان، مەکەوە دووی ڕازی جیهان
چون کەسێ نەبووە و نییە، ئەم ڕازە بەحیکمەت کا بەیان

بە ڕادەیەک خووی بە باس و وتووێژەوە گرتبوو، کە تەنانەت شەوانیشی بە ڕامان و بیرکردنەوە سەبارەت بە کێشە و مەسەلەکانی حیکمەت بەسەر دەبرد. کێشە فەلسەفییەکانی لە چەشنی شیکردنەوەی لاهوتی و چۆنێتیی پەیدابوونی بوونەوەرەکان، بە ئەندازەیەک مێشکی داگیر کردبوو، کە ئارامی نەمابوو. هەر کە کتێبێکی دانا و زاناکانی بە دەست دەگەیشت، خێرا دەیخوێندەوە و ئەگەر بابەتێکی تایبەتیشی ببینییایە، لای خۆی یادداشتی دەکرد، بەتایبەتییش کتێبەکانی ئیبن سینا، فارابی، غەزالی و ئەوانی تر. بەڵام هەر ئۆقرەی نەدەگرت. تیۆرییەکانی ئەوان چەند ورد و گرنگ بوون، هێشتا تینوویێتیی ئەویان نەدەشکاند.

شەوێکیان کە تا دەمەوبەیان بێدار بوو و خەریکی خوێندنەوە و بەسەرکردنەوەی چەند کتێبێک بوو، کە بەئەمانەت وەری گرتبوون، سەرقاڵی مەسەلەی لاهوت بوو و لەو ڕووەشەوە، نوقمی سەرسووڕمان بوو. هەستی بە ماندووبوون کرد. هەر لەو جێیەدا کە لێی دانیشتبوو، سەری خستە سەر زەوییەکە و نەشئەیەکی چاوەڕواننەکراوی

هاتێ. نوقمی چێژی ئەم نەشئە نوورانییە بوو، کە لەناکاودا کەسێکی ڕووبەڕووی خۆی بینی. ئەریستۆ بوو! ئەریستۆی ڕابەری حیکمەت و یەکەمین مامۆستا، سەروسیمایەکی دڵڕفێن و پڕپێزی هەبوو و میهرەبانیی بەرامبەر بە یەحیا نواند، بە جۆرێک، کە یەحیا نەشڵەژا و هێمن بوو، تا ئەوەی سەبارەت بە لاهوت لەگەڵیدا کەوتە گفتوگۆ و لەم بارەیەوە ڕوونکردنەوەی لە ئەریستۆوە وەر گرت. ئەریستۆ پێی وت، "ئەگەر شتەکانی تریش وەکوو جەستەمان لەژێر ڕکێفی خۆماندا بووایە، ئەوکات بەبێ نێوانگیریی وێنەی زەینی و وەکوو جەستەی خۆمان دەرکمان دەکردن. خواوەندیش بەم شێوەیە، کە هەموو جیهان لەناو دەستی خۆیدایەتی، بەبێ وێنە دەرکی دەکات."

"ئەی پەیوەستبوون و یەکبوونی دەروونەکان واتە چی؟ چۆنچۆنی دەروونی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا یان لەگەڵ ئەقڵی کاریگەردا یەک دەگرن؟"

"تۆ تا لەم دنیایەدا بیت، لەمانە تێناگەیت، بەڵام وەختێ لەم دنیایە بچیتە دەرێ، بە شێوەیەکی کردەیی پەیوەستبوون و یەکبوون ئەزموون دەکەیت."

لێرەدا ئەریستۆ بە جۆرێک ستاییشی ئەفلاتوونی کرد، کە بەلای یەحیاوە سەرسووڕهێنەر بوو. یەحیا لەوی پرسی، "هیچ فەیلەسووفێکی ئیسلامی هەیە لە ئاستی ئەودا بێت؟"

"نەخێر، تەنانەت بە یەک لەسەر هەزاری ئەویش ناگەن."

یەحیا ناوی چەند کەسێتییەکی هێنا، بەڵام ئەریستۆ هیچ بایەخێکی پێ نەدان. بەڵام وەختێ ناوی بایەزیدی بەستامی و سەهلی توستەری و کەسانێکی وەکوو ئەوانی





هێنا، ئەریستۆ خۆشحاڵ بوو و وتی، "ئەمانە فەیلەسووف و زانای ڕاستەقینەن. بەتەنها بە زانستە نەریتییەکان قاییل نەبوون و پەنایان بۆ مەزەنەش بردووە و یەخسیری ئەم کەلاوەیە نەبوون. ئەو کارەی ئێمە کردمان، کردیان و ئەو شتەی ئێمە وتمان، وتیان." ئەریستۆ وردەرودە لە یەحیا دوور کەوتەوە و لە چاو ون بوو. یەحیا بەدوایدا گریا. لە دەنگی گریانەکەی خۆی بەئاگا هاتەوە. خەمێکی پڕ لە چێژ سەرتاپای بوونی تەنییەوە. بەبێ ئەوەی بیەوێ، دڵی پڕ بوو لە گریان. کەمێک گریا و پاشان هەستا و چووە دەرەوە. لە منارەی مزگەوتەکەوە، دەنگی بانگ بەرز بۆوە.

# یادی یار

به دونیا مەفرۆشە یاری خۆت چوون بێسوودە
وەک ئەوەی یوسفی بە زێڕێکی قەڵب فرۆشت

بەر لەوەی بانگەکە تەواو ببێت، بڕیاری دا نییەتی ڕۆژوو بهێنێت. تا خۆرکەوتن، لە مزگەوتەکە دانیشت. کاتی وانە هات. خێرا چووە دەرەوە. لە حەوشەی مزگەوتەکە چاوی بەو دەروێشە کەوتەوە، کە چەند ڕۆژێک لەمەوبەر، لە خانەقاکە ئامۆژگاریی کردبوو، کە "کۆڵەوژی ئاگری ناخی خۆی بێت، نەک هیی ئاگردانی شێخە دوکاندارەکان!"

یەحیا ئەو ڕێکەوتەی زۆر پێ خۆش بوو. دەستی کابرای گرت و بردییە لایەکەوە. لەسەرخۆ پێی وت، "دەستم دامێنت، یاریدەم بدە. ببە بە پزیشکم."

"تۆ خۆت پزیشکی خۆتیت! کەس ناتوانێ ببێت بە پزیشکی کەسێکی تر. تینوو بە، بەڵام با تینوویتیت ڕووی لە خۆت بێت و ئاوی کارێزی دەروونی خۆت بخۆرەوە. هەرچییەکت بوێت، لە ماڵەکەی خۆتدا هەیە، ئەگەر ڕوو لە سارا بکەیت، تەمەنت بەفیڕۆ دەدەیت و هیچت دەستگیر نابێت."

"ئەمە دەزانم! بەڵام دەبێ چی بکەم؟ بۆ کوێ بڕۆم؟ دەردی خۆم بۆ کێ باس بکەم؟ لە کێ بپرسم؟"

بە هەڵچوونێکی وەهاوە ئەم قسانەی دەکرد، کە

سەرتاپای کەوتبووە لەرزین. قوڵپی گریان بینی گرتبوو. سەرەنجام گریا. سەری خستە سەر سنگی دەروێشەکە و گریا، ئەویش باوەشی پیا کرد. کەمێک بێدەنگ بوو و هیچی نەوت. پاشان سەری بەرز کردەوە و لە کاتێکدا بە سەرقۆڵی کراسەکەی فرمێسکەکانی چاوی سڕی، سەروچاوی ماچ کرد و وتی، "یەحیا! تۆ ناخت ڕێنوێنیت دەکات و کەوتوویتە ڕێ! تۆ شەپۆلیت! تۆ زەمینی نیت! تۆ دەفڕیت. تۆ بانگەوازی سرووش دەبیستیت. بەڵێ، بەم زووانە ئازاد دەبیت، دەفڕیت."

"ڕێگەکەم پیشان بدە! ڕێنماییەک! چی بکەم؟ بۆچی لەم بارەیەوە هیچ بایەخێک لەلایەن تۆوە نابینم؟ لە کێ بپرسم؟"

"پرسیار بۆچی؟ ئەوەی کە خۆت هەتە، لە کێی داوا دەکەیت؟ یەحیا! گوێ بگرە! هێور ببەرەوە. گوێم لێ بگرە! تۆ چیی تر من لێرە نابینیت. گوێ بگرە تا بەر لە خواحافیزی، شتێکت پێ بڵێم، کە بەکەڵکت دێت. تۆ لەو ڕۆژەوەی بۆ مەراغە هاتوویت، گیرۆدەی مشتومڕ و باس و خوێندنیت. گەرچی لەو ڕووەوە پێشکەوتوویت، بەڵام خۆتت بیر چووەتەوە. من تەنها شتێک دەڵێم و بە خوات دەسپێرم، ئەویش ئەوەیە، کە تۆ چرای ڕۆشنی ئەم سەرزەمینەیت. دەرفەت زۆر نییە، ئەوەندە خۆت بە مشتومڕەوە سەرقاڵ مەکە. لەو نەشئەیەتدا کە هەتبوو، ئەریستۆ شتێکی پێ وتیت، کە کلیلی ڕێگەت بوو. مادامەکی تۆ خاوەنی فەڕی ئیزەدیت، پێویستت بە ڕێنماییی کەسانی تر نییە. هەرچییەکت دەوێت، لە ناخی خۆتی داوا بکە. ناخت گەنجینەی گەنجێکە، کە لە کیومەرسی گڵشاوە بۆت ماوەتەوە و لە دەروونی ئاهورایییەکانی ئەم سەرزەمینەوە بڵێسەی سەندووە. تۆ میراتگری کەیخوسرەوی





گەورە و بایەزید و حەللاج و خەرقانیت. خۆت بدۆزەرەوە، دواقسەشم ئەوەیە، کە سیندوختت بیر نەچێتەوە! ڕۆحی ئەو دەبێتە ڕێپیشاندەرت بۆ سەرلەنوێ دۆزینەوەی ناخت و تا دەرکەوتنی فەڕی ڕۆحیت، هاودەمت دەبێت. بیرت نەچێت، کە هەرگیز ئاسمان زەوی لەیاد ناکات و هۆرەخشی پاک* لە گەردیلەپەروەری دریخی ناکات. ستاییشی هۆرەخشەکەی خۆت بکە و ئەوەش بزانە، کە فروهەرەکانی** پاکی پارساکان، لە کیومەرسەوە تا سوشیانتی سەرفراز، هەمیشە و هەمیشە دەبن و بە بەخششی خۆر، دەستی مرۆڤ دەگرن و لە خەم و تاریکی و وەسوەسەی ڕموزنان ڕزگاری دەکەن. خوداحافیز! خوداحافیز!"

ئەو ڕۆیشت و دڵی یەحیا هیچی تیا نەما، جگە لە یادی سیندوخت و هەستێک بە شەرمەزاری، کە بۆچی لەم دوو-سێ ساڵەدا، ناخی خۆی پشتگوێ خستووە و وەکوو پێویست گوێی بە کاری دڵی نەداوە. ماوەیەک لە سووچێکدا پاڵی بە دیوارەکەوە دا و نوقمی بیرکردنەوە بوو. سەرەنجام، بڕیاری خۆی دا، "مەراغە جێ دەهێڵم!"

---

* هۆرەخش: بە مانای هۆر، واتە خۆر دێت. سوهرەوەردی خۆی لە هەردوو کتێبی *المشارع و المطارحات* و *حکمة الاشراق*دا، ئەم زاراوەیەی بەکار هێناوە.

** فروهەر: بە گوێرەی ئاڤێستا، فروهەر هێزێکە، کە ئاهورامەزدا بۆ چاودێری و ئاگالێبوونی بوونەوەرە چاکە ئیزەدییەکان، لە ئاسمانەوە بۆیانی دەنێرێت.

# نەونەمامی شێتی

شتێک لە دڵمایە، ئەڵێی بیشەڵانی نوورە
ئەڵێی خەونی بەربەیانە
ئەوەندە بێئۆقرەشم، حەز ئەکەم
تا ئەوسەری دەشتەکە هەڵێم
تا سەر دوندی کێوەکە
لە دوورەوە دەنگێک دێ، بانگم ئەکا

یەحیا، کە بە هۆی هوشیاری و بەهرە سەرسووڕهێنەرەکەیەوە لەپێش هەموو قوتابییەکانەوە بوو، لەپڕێکدا و بەبێ ئەوەی پێشتر کەس ئاگادار بکاتەوە، لە وانەکانیدا دیار نەما. ئەو کە لە سای زیرەکی و هەڵکەوتووییەوە لەناو خەڵکە خوێنەوارەکەدا بە شیهابەدین سوهرەوەردی ناسرابوو، دیار نەمانە کتوپڕەکەی هەموانی دووچاری سەرسووڕمان کرد. هەندێک دەیانوت لەوانەیە بە هۆی خوێندنەوەوە یان پەیوەندیی نهێنییەوە، ناخگەراکان لە خشتەیان بردبێت و بۆ مەڵبەندەکانی ئەوان چووبێت، یان دەیانوت دەشێ بە دەستی ناحەزێک، بەدزییەوە کوژرابێ و چەندین گریمانەی تر.

ئەبو حوسەین، کە لەناو قوتابییەکانی جیلیدا لە هەموویان بەتەمەنتر دەهاتە بەرچاو، سەرێکی با دا و وتی، "ئەم جۆرە بنیادەمانە بە سەری سەلامەتەوە دەر ناچن! زۆر لە خۆی

ڕازی بوو. ڕۆژێکیان لێم پرسی تۆ باشتریت یا ئیبن سینا؟ من بە گاڵتەوە ئەو پرسیارەم لێ کرد، کەچی ئەو زۆر بەجیددی وتی، لە حیکمەتی پەیجۆریدا ئەگەر لە ئیبن سینا زیاتر نەبم، کەمتر نیم. لە حیکمەتی زەوقییشدا، کەم تا زۆر، بەهرەیەکم هەیە، بەڵام ئەو لە زەوق و کەشفدا بێ بەهرە بوو*."

ئەبو حوسەین زەردەخەنەیەکی تەوسئامێزی کرد و بێدەنگ بوو. جیلی گەرچی زەردەیەکی هاتێ، بەڵام دیار بوو ئەو پاشەملەباسکردنەی پێ خۆش نەبوو.

بەڵام سوهرەوەردی تاقە شتێک کردبێتی، ئەوە بوو مەراغەی جێ هێشتبوو و خۆی لە مشتومڕی وانە و وتوویژ و کۆتوبەندی قوتابیێتی و مامۆستایی قوتار کردبوو.

وەختێ لە مەراغە دوور کەوتەوە، هەستی کرد پێویستیی بەوەیە چەند ڕۆژێک تەنیا بێت و بچێت بۆ دوندی چیا و ماوەیەک لە زەوی و خەڵکی دوور بکەوێتەوە. چوون بۆ دوند، واتە بەرزبوونەوە. بەرەو کێوی سەهەند بەڕێ کەوت. بنارەکانی هێشتا سەوز بوون. لە دەوروبەری دێیەکان، سپێتیی کێڵگە گەنمەکان لەملاولای وێنجەزارەکانەوە، ئەو ناوەی وا لێ کردبوو، وەک لەوحی شەترەنجێکی نارێک دەینواند. دەنگی مێرووە جۆراوجۆرەکان و نەغمەی باڵندەکان، تۆزی خامۆشی و غوربەتی لە فەزاکە دەتاراند.

هێشتا شتێکی وای لە بناری کێوەکە نەبڕیبوو، کە خۆر ئاوا بوو. بڕیاری دا کە گەیشتە کانیاوێک، ئیستێک بکات

* حیکمەتی پەیجۆری و حیکمەتی زەوقی: بۆ مانای ئەم دوو چەمکە، بڕوانە پێشەکیی وەرگێڕ بۆ ئەم کتێبە.





و ڕۆژووەکەی بشکێنێت و نوێژ بکات. زیاتر سەر کەوت. چیی دی بەتەمای کانی نەما. خۆی گەیاندە جۆگەلەیەک، کە لە دەربەندەکەوە دەهاتە خوارێ. دەسنوێژی گرت و ئاوی خواردەوە و دەستی بە نوێژ کرد.

دوای نوێژ، زیاتر سەر کەوت، تا شوێنێکی گونجاو بدۆزێتەوە و تیایدا شەو بەئارامی بەسەر بەرێت. لەپڕێکدا بیری کەوتەوە، کە خورجین و کەلوپەلەکەی لە مەراغە بەجێ ماون. دوودڵ بوو لەوەی پشتگوێیان بخات یان نا؟ خورجینەکە یادگاریی دایکی بوو و بە دەستی خۆی بۆی چنیبوو. یادداشت و نووسینەکانی، لە هەمووش گرنگتر، پارچە ئاوریشمە سەوزەکە و مۆرە گڵینەکە و زوننارەکە، کە سێ یادگاریی سیندوختن، هەموویان وان لەناو خورجینەکەدا. بۆ ئەوەی بیری خۆی بەوانەوە خەریک نەکات، بیرکردنەوە و بڕیاردان لەسەری خستە سبەینێ.

شوێنێکی گونجاوی دۆزییەوە و تیای دانیشت. بڕیاری دا ئیتر زۆر خۆی بە مشتومڕ و وتوویژەوە خەریک نەکات، تەنها لە حاڵەتی پێویستدا نەبێت. هەستی کرد خەریکە نەشئەیەک دەیگرێت. گریانی هاتێ و بەخوڕ گریا. ناگەهان، هەستی بە درەوشانەوەیەکی بەتین و تریشقەیەکی هەورەگرمەئاسا کرد. سەری خستە سەر زەوی و لە حاڵەتێکدا کە لە خەون دەچوو، سیندوختی بە دوو باڵی نوورەوە بینی، بە بەرپەڕۆچکەی ئاسمانەوە دەفڕێ و لەو دوورەوە قسەی لەگەڵ ئەم دەکرد، "یەحیا دەرفەت نەماوە. کات بەفیڕۆ مەدە. لەمەودوا لەگەڵتدا دەبم. جار دوای جار، نزیکتر دەبم لێتەوە. لە ئاسمانەوە دێمە سەر زەوی. لە ئاسۆی ڕووناکدا لەگەڵتدا

دەدوێم. هەموو جارێک نزیکتر دەبم لێتەوە، تا سەرەنجام، بە نەوازشی من لە خەونی دونیا بێدار دەبیتەوە و جەستەی زەمینیت لەسەر زەوی دادەنێیت و بە دوو شاباڵی نوورەوە، لەپەنا مندا دەفریت، تا ئاسمان، تا ترۆپک، تا ناکۆتا، تا بارەگای ڕووناکیی پەتی، تا ڕووناکیی ڕووناکییەکان. تا سەروو شوێن و کاتەوە، تا ئەو شوێنەی تیایدا وەهم و ئەقڵ ڕێ دەر نابەن. نازانم بڵێم چی؟ دەیبینیت. سبەینێ بچۆ بۆ دوند. ماوەیەک لەوێ بمێنەرەوە. خورجینەکە فەرامۆش بکە. من لەگەڵتدا دەبم. دەسرە ئاوریشمەکە و مۆرە گڵێنەکە و خورجینەکەی دایکت و دەفتەر و کتێبەکانت لەبیر بکە. لە نیشانەکان گەڕێ، تۆ چیی تر پێویستیت بە نیشانە نابێت. جگە لە فڕین، هەموو شتەکانی تر فەرامۆش بکە.



# تینووێتی و گەڕان

ئەڕۆم بۆ سەرەوە تا دوند
من پڕم لە باڵ و پەڕ
لە تاریکییا ڕێ ئەکەم، من پڕم لە چرا

چەند ڕۆژێک بوو لە دوندی سەهەند بەوپەڕی بێقەرارییەوە ڕۆژانی بە گەڕانی ناو کەژوکێوەکە بەسەر دەبرد و شەوانیش بەردێکی دەکرد بە سەرین و تا ڕۆژ دەبۆوە، گینگڵی دەدا و تینووی دەبوو.

لە قەراغ جۆگەلەیەکەوە دانیشتبوو و دەسنوێژی دەگرت، کابرایەک لە هەورازەکەی بەرامبەرییەوە بەرەو جۆگەلەکە دەهات. نزیکتر بۆوە و سڵاوی کرد. یەحیا وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە. کابرا لایەوە دانیشت، یەحیا لێی پرسی، "خەڵکی ئەم ناوچەیەیت؟"

"بەڵێ، من خەڵکی دێیەک لە دێیەکانی دەوروبەری مەراغەم. تۆ پەهلەوی دەزانیت؟."

"بەڵێ!"

"ئەی تۆ خەڵکی کوێیت؟"

"من خەڵکی سوهرەوەردم و ناوم یەحیایە."

"خەریکی کڕین و فرۆشتنیت؟"

"نەخێر، هەر بۆ بینینی ئەم ناوچەیە هاتووم. لە مەراغە

دەخوێنم. ئەی تۆ چی دەکەیت؟"

"من خەریکی مەڕومالاتم. هاوینان دێین بۆ ئێلاخ. لێرە دوو-سێ مانگێک لە سەهەند دەمێنینەوە. هەواکەی باشە و مەڕەکان کەمتر دەمرن. تۆ موسوڵمانیت؟"

"بەڵێ."

"من گاورم، زەردەشتیم، مەجوس. ناوم بارامە."

"ژمارەی مەجوسەکانی ئەم ناوە زۆرە؟"

"بەڵێ، هەر لەم ناوە، نزیک مەراغە، ئاتەشکەدەیەکمان هەبوو، کە چەندساڵێکە وێران بووە. وردەوردە ژمارەی زەردەشتییەکان کەم دەبێتەوە. لەم بارودۆخەدا کە هاتۆتە ئاراوە، هەریەکە بە جۆرێک دەکرێ بە موسوڵمان. سەرانەوەرگرتن، سووکایەتیپێکردن، زۆرهێنان بۆیان، هەموو ئەمانە، ئێمەیان لاواز کردووە. برای ئازیز! نەتبیستووە دەڵێن خەڵکی لەسەر دینی پاشاکانیانن. ئەمڕۆش پاشایانی ئەم وڵاتە موسوڵمانن و خەڵکیش دەیەوێ بژی. بۆ ئێمەش، سەردەمی دینداری ئاسان بوو، کە پاشاکانمان زەردەشتی بوون، بەڵام لەو ڕۆژەوەی ئێران کەوتە بەر شاڵاوی فتوحات و ساسانییەکان تێکشکان، ئاتەشکەدەکان کپ و خامۆش کران. بەڵێ، تەقەللایەکی بێوچان درا و دەدرێ بۆ پاراستنیان، بەڵام سوودی نییە. بۆ ئەوەی ئاتەشکەدەی ئازەرگوشەسپ لە شیز هەمیشە ڕۆشن بێت، لەگەڵ نوێنەری خەلیفە پەیمانیان بەست. قەرار بوو ساڵانە هەشت سەد هەزار درهەم بدەین و ئەم ئاتەشکەدەیە خامۆش نەکرێ. ئاتەشکەدەکە تا ئەمڕۆش ماوە، وەلێ ڕۆژ دوای ڕۆژ بەرەو نەمان دەچێت. تا بێت، ژمارەی زەردەشتییەکان ڕوو لە کەمبوونەوەیە.





کار و کاسبی بۆیان زەحمەتە و بڕیارە قورسەکانی میر و فەرمانڕەواکان بەسەریاندا دەسەپێنرێ، کە بەجێهێنانیان ئاسان نییە، کەچی هێشتا میر و فەرمانڕەواکان لێیان قاییل نین. ڕۆژبەڕۆژ ژیانی ئەو کەسانە سەختتر دەبێت، کە سەر بە قەومی کوردن. من و ئەوانەی لە من دەچن، هەرچییەک پەیدا دەکەین، فەرمانڕەواکان لێمانی زەوت دەکەن. بە هەر بیانوویەک بێت دێنە سۆراخمان و هەرچیمان هەیە، دەیبەن. هەڵبەتە موسڵمانەکان خۆشیان حاڵیان زۆر باش نییە، هەمیشە ئەم میر لەگەڵ ئەو میردا و ئەم ئەتابەک لەگەڵ ئەو ئەتابەکدا شیر و تیر لەیەک دەسوون. لەم بەینەشدا، خەڵکەکە دەبێتە قوربانیی چاوچنۆکی و ڕقەبەرایەتیی ئەم حاکمە نەخوێندەوارانە. ئەمە جگە لە تاڵانییەکانیان و لەو باجە زۆرانەی لە خەڵکی دەسەنن.

"من موغزادەم، نەوزەری باوکم موغ بوو. ئەو دەیوت ئێمە وەچەی گوشەسبین، کە لە سەردەمی ئەردەشێری بابەکاندا فەرمانڕەوای تەبەرستان و گەیلان و ڕویان و دەماوەند بووە و باووباپیرانی لە زەمانی ئەسکەندەرەوە، فەرمانڕەواییی ئەو ویلایەتانەیان کردووە. من کەسانی فامیدە و خوێندەوارم خۆش دەوێ. من خۆم حاڵەتێکم لەگەڵدایە، کە هەمیشە هەست بە غەریبی دەکەم. ئەگەر میهرەبانی بنوێنیت و قاییل بیت چەند ڕۆژێک میوانم بیت، سوپاسگوزار دەبم."

"لە ڕاستیدا من هیچ کارێکم نییە. چیت لێ بشارمەوە، ئێستا سەرقاڵی خوێندنیش نیم، حەزیش دەکەم ماوەیەک وەک دەروێش بژیم، تا بزانم چیم بۆ دێتە پێش! بەڵام نابمە ئەرک بەسەر ئێوەوە. بۆ چەند ڕۆژێک لەم دەوروبەرە دەمێنمەوە،

دەتوانین ڕۆژانە یەکتر ببینین و ماوەیەک پێکەوە بین."

"نەخێر، ئەمە نەریت نییە لای ئێمە. تۆ دەبێ میوانی من بیت. دەزانم بۆ موسڵمانێک ئاسان نییە ببێتە میوانی گاورێک، بەڵام هەوڵ دەدەین ئەوە نەبێتە کێشە و گرفتێک."

"من دەمەوێ نەبمە ئەرک بەسەرتانەوە، ئەگینا ئەوە بەلامەوە قورس نییە."

"باشە، کەواتە پێکەوە دەیگوزەرێنین. خێوەتەکەمان وا بەو بەرزاییەوە، با بڕۆین."

"من نوێژێک دەکەم و دێم."

"باشە، چاوەڕێت دەبم."

یەحیا نوێژی عەسری کرد و پاش کەمێک نزا، بەرەو خێوەتەکەی بارام چوو.



# سەرلەنوێ سەبارەت بە موغان

بۆچی سەر بدەین لە ئاستانەی پیری موغان
کە خۆشبەختی وا لەم سەرایە و ڕزگارییش لەم دەرگایە

سوهرەوەردی ڕووی کردە خێوەتەکەی ئەو موغزادەیە، بەڵام بە دەروونێکی خرۆشاوی دەست یادەوەرییەکانی شیز و خەونەکانی سیندوخت و بە ئومێدی پەیبردن بە نهێنی و ڕەمزەکانی حەکیمانی باستانەوە. بارام و خێزانەکەی لە بەردەمی خێوەتەکەیاندا هاتنە پێشوازیی ئەو و بەخێرهاتنیان کرد. بارام یەحیای برد بۆ چادرێکی بچووک، کە بۆ خەون و پشوودانی ئەو تەرخانیان کرد. بڕێک سنجوو و کشمیش و بادام و فندقیان لە قاپی گڵین و مسیندا بۆ دانا. بارام لای یەحیایەوە دانیشت و وتی، "من تۆ بە کەسێکی شایستە و دانا دەزانم. خۆشحاڵیشم کە دەعوەتەکەت قبوڵ کردم."

"ئەوە میهرەبانیی ئێوەیە. منیش سوپاسگوزارم. دەمەوێ لێت بپرسم، ئاخۆ سەبارەت بە ڕێنماییەکانی موغان چی دەزانیت؟ هیچی نووسراوت لایە؟"

"من وەکوو وتم، موغزادەم. باوکم هەر لە سەرەتاوە دەیویست من جێی بگرمەوە. هەر لە منداڵیمەوە بایەخی بە پەروەردەکردن و فێرکردنم دا. من برای یازدە خوشک و تاقە کوڕی ئەو بووم. دواتر سەروەت و سامانمان نەما و من بە

ئاژەڵدارییەوە خەریک بووم. بەڵام ئەو ڕێزەی جارانمان هەر مابوو. تەنانەت لای موسڵمانەکان و میرەکانیش ڕێزمان هەیە. هەڵبەتە ئەوان باج و سەرانەی خۆیان دەسەنن و لە پوولێکی خۆش نابن و بگرە بە زیادەوە لیمانی دەسەنن. خەڵک تەواو پڕە لێیان.

"چار نییە، دەبێ بەرگە بگرین. هەندێ جار بە ڕادەیەک زۆر بۆ خەڵک دەهێنن، کە خەڵکەکەی هیوا بە مەرگ دەخوازێ و هیچ داڵدەیەکیشی نییە. ئاسمان لە هەموو شوێنێک، هەمان ڕەنگە. من بەم تەمەنە کەمەی خۆیشمەوە، چ لە ئەسفەهان بووبێتم یان مەراغە و هەر جێیەکی تر، بینیومە خەڵک چەند بێزارن. هەم فەرمانڕەواکان و هەم ئەوانەی بە ناوی فتوحاتەوە دێن، دەکەونە تاڵانکردنی ماڵی خەڵک و کوشت و بڕیان. ئەمە جگە لە دەسدرێژیکردنە سەر ئابڕوو و ناموسی خەڵک! ئەوەی سەیرە، هەموو ئەم شتانە بە ناوی ئیسلام و فەرمانڕەوایی ئیسلامییەوە دەکەن و خۆیان بە خەلیفەی پێغەمبەر دەزانن و دروشمەکەشیان شمشێر و زۆردارییە.

"کاتی خۆی کەسانێک حوکمی ئەم وڵاتەیان دەکرد، کە کەسێتییەکی زۆر بەرزتریان هەبوو لەوانە. لە کیومەرسەوە بگرە تا گوشتاسب، هەموویان خاوەن فەڕی ڕۆحی بوون. ئەگەر ئینسان بیەوێ دادپەروەر بێت، دەبێ نووری ئیزەد لە ناخیدا بدرەوشێتەوە و بەو نوورەوە ڕابەڕایەتی بکات، ئەگینا هەمیشە هەوا و هەوەس بۆ ئینسان لە بۆسەدایە. سۆشیانتیش*، کە دوافریادڕەسی ئینسانە، بەم فەڕەوە، هەوڵی

* سۆشیانت: لە ئاڤێستادا بە مانای ڕزگارکەر هاتووە، وەکوو مەهدیی چاوەڕوانکراو لە ئایینی ئیسلامدا.





ڕزگارکردنی مرۆڤەکان دەدات. ئەم سۆشیانتە سەرفرازە ئەستوەت ئێرنیشی پێ دەڵێن و هەرچیی ئەوانەی جەستە و ڕۆحیان هەیە لە جیهاندا، لە پرشنگی ئەوەوە ژیانی نەمری بەدەست دەهێنن. دوایین فروهەر، کە بۆ سەر زەوی دێت، فروهەری ئەم سۆشیانتەیە. هەندێ جاویدانی تریشی لەگەڵدا دەبێت، وەکوو نیرسی، تووس، گیو، گودەرز، کەیخوسرەو و هەندێکی تر! هاوەڵەکانی بریتی دەبن لە پازدە پیاو و پازدە ژن. پەشووتەنی* جاویدان لەگەڵ سەد و پەنجا یار و یاوەریدا لە کەنگدژ دێتە دەرێ، سەرلەنوێ جیهان دروست دەکاتەوە و پڕی دەکات لە داد و دانایی. پاش دەرکەوتنی سۆشیانس، گیتی پڕ دەبێت لە داد و دانایی، بیر و گوتار و کرداری باش سەر دەکەوێت و درۆ و ڕق و کینە لەناو دەچێت. برسێتی و نائاسایش ڕیشەکێش دەبێت. بەڵام ئەوەتانێ، ئێستا ئێمە لە ئازار و ئەشکەنجەداین.

"منیش وا بیردەکەمەوە، تا کەسانێکی ئازاد بەرپرسیارێتیی فەرمانڕەوایی نەگرنە دەست، خەڵکی نە ژیانیان باش دەبێت و نە ئاسایش بەرپا دەبێت. لە کەلتووری موغانیشدا، ئەوانەی خاوەن فەڕی ڕۆحین، برەوپێدەرانی دادپەروەری و زانینن. شین و سروودی قەووالان بۆ ماتەمی سیاوەش، گریان و تازیداریی موغان، کۆڕ و کۆبوونەوەی ماتەمینی، هەموو ئەمانە لەپێناوی بەرزڕاگرتنی ڕۆڵی ئەو ڕابەرە مینووییانەیە لە بڵاوکردنەوەی زانین و دادپەروەری و ڕێنوێنی و کامڵکردنی مرۆڤەکاندا."

* پەشووتەن: کوڕی گەورەی گوشتاسب و برای ئەسفەندیارە، بەپێی گێڕانەوەی ئاڤێستایی، حوکمڕانیی کەنگدژ دەکات و لە دوادەیەی دواهەمین هەزارەدا، لەگەڵ یار و یاوەرەکانیدا ڕادەپەڕێت و جیهان ڕزگار دەکات.

"تۆ هیچ دەقێکی موغەکانت لایە؟"

"بەڵێ. هەندێ لەو دەقانە، لای باوکم هەبوون. ئێستا لە سندوقێکدا پاراستوومانن."

پاشان دەستی درێژ کرد بۆ سووچێکی چادرەکە و سندوقێکی بچکۆلەی پیشانی یەحیا دا، کە بە ڕووپۆشێکی جوان داپۆشرابوو، ئینجا لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوام بوو، "من زۆر جار لەگەڵ باوکمدا بۆ ئەو کێوە چووم. ئەویش لە دوندی ئەو کێوەوە، بەدوای بەرەکەتدا دەگەڕا. دەیوت سەهەند هەر ئەوەیە، کە لە ئاڤێستادا بە کێوی ئسنوەند ناوی هاتووە. لە دوندی ئەو کێوە، لەژێر تاقێکی ئەشکەوتئاسادا، ئوشو زەردەشت ئیلهامی بەدەست هێنا. لەسەر هەمان کێو، زەردەشت لەگەڵ هیوروتات، فریشتەی پاسەوانی ئاوەکاندا کەوتە گفتوگۆ. زەردەشت پەرستگەیەکی تریشی لە نزیک مەراغە هەبوو. من لەگەڵ باوکمدا چەند جارێک بۆ ئەو پەرستگەیە چووم و لەوێ نزام کردووە. باوکم ناوبەناو بە نیازی موکاشەفە، بۆ سەهۆڵانیش دەچوو. منیش بۆ ئەوێ ڕۆیشتووم."

"دەتوانم ئەو دەقانە ببینم؟"

"بەڵێ، بەڵام پێویست بە پەلەکردن ناکات. کەمێک ئارام بە و چەند ڕۆژێک لامان بمێنەرەوە، دەیانبینیت."



# لە نوورەوە تا نوور

من کتێبێکم دی وشەکانی لە جنسی بلوور

... نوور و تاریکیم دی...

شەوێکی سەرشار لە سەفا و مانایان پێکەوە گوزەراندبوو. دوای نانی بەیانی، بارام بەرەو لای سندوقە بچووکەکە چوو و بەدەم خوێندنی وێرد و هەندێ جوولەی ئارام و پڕڕێزەوە، ڕووپۆشی سندوقە بچووکەکەی لا برد، قفڵەکەی کردەوە و بە هەردوو دەستی و بەوپەڕی شێنەیییەوە ئەو کتێبەی دەر هێنا، کە لە ئاوریشمەوە پێچابووی. بە ڕێزەوە لە بەردەمی یەحیادا دای نا و بە شێوەیەکی تایبەت ئاوریشمەکەی لێ کردەوە. ئاوریشمەکەی لەولاترەوە ڕاخست و کتێبەکەی لەسەر دانا و بە سوهرەوەردیی وت، کە زۆر بە وریایییەوە تەماشای بکات و هەڵی بداتەوە.

یەحیا کەوتە سەر ئەژنۆ و بەکاوەخۆ سەرگەرمی خوێندنەوە بوو.

بارام وتی، "تۆ خەریکی خوێندنەوەی خۆت بە، منیش سووکەکارێکم هەیە، زۆرم پێ ناچێت، دەگەڕێمەوە."

ئەم کتێبە *بندهشە* و باس لە ئەمیشاسپنداکان* دەکات،

* ئەمیشاسپندا: دەستەی مینویان لە ئایینی مەزداپەرستیدا، کە بریتین لە: بەهمەن، ئۆردیبەهەشت، شەهریوەر، سپندارمد، خورداد و ئیمرداد.

پەیوەندییان بە خوداوە و ئەوەی کە هەموویان نوورن و پرشنگی نووری نوورەکانن، واتە ئاهورامەزداوە هەیە. ئەمیشاسپەندەکان، شەش بن یان هەشت، یاخود سیوسێ، گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە، هەموویان نوورن و پیرۆزن. یەکسان و یەک و یەکتا و یەکڕەنگن. هەریەکەیان ناوونیشانی خۆی هەیە: بەهمەن، ئۆردیبەهەشت، شەهریوەر، ئیسفەندارمەند، خورداد و ئیمرداد. هەریەکەیان لە گەیاندنی ڕەحمەتی ئاهورامەزدادا بۆ خەڵکی سەرزەوی، ڕۆڵێکی تایبەت و دیاریکراوی هەیە.

سوهرەوەردی زۆر بەوردی دەیخوێندەوە. ئەو چەند ڕۆژەی لەوێ بوو، چەندجارێک، لە سەرەتاوە تا کۆتایی، ئەو دەقەی خوێندەوە. ڕۆژێکیان لەگەڵ بارامدا لە سارا بوون، وەختێ قسە هاتە سەر ئەمیشاسپنداکان، بارام وتی، "من لە دەقی تری وەکوو *گاهان** و *یەسن هەفتها*دا بابەتی زیاترم لەسەریان خوێندۆتەوە. ئەمانە کۆمەڵێک بوونەوەری باڵا و بێکەموکووڕی و یەکبوو و بەهێز و جاویدانن. لە مادده خاڵین و دوور لە کەموکورتین. لەبەر ئەوەی لەنێوانیشیاندا بەربەست نییە، لە یەکتر ون نین. هەریەکێک لەمانە، لە جیهانی ماددیدا (لە گێتیدا) نیشانە و تەلیسمێکیان هەیە، لە ئاگر و ئاو و خاک و..."

لە ڕێنماییەکانی زەردەشتیدا، خوڵقاندن و فەرمانڕەوایی تایبەتە بە ئاهورامەزدا و هەرجۆرە بەرکەماڵییەک بەندە بە نزیکبوونەوە لەوەوە. تا مرۆڤ *خششرەی* خۆی نەبەخشێت، خششرەی ئیزەدی پێ نابەخشرێ. خوداوەند سەرەتا

* گاهان: واتا گاتاکان.





بەهمەنی خوڵقاند، ئینجا ئۆردیبەهەشت، پاشان شەهریوەر. جیهان سەراپاخوڵقاوی خودایە و لەژێر فەرمانی ئەودایە و ئیمشاسپنداکان هەموو نیشانەی ناو و سیفەتەکانی ئەوون.

سوهرەوەردی، کە نوقمی بیرکردنەوە و ڕامان بووبوو، سەری بەرز کردەوە و وتی، "لە سیستمی دینیی ئێوەدا، مرۆڤ چۆن ڕزگاری دەبێت؟"

"ئێمە باوەڕمان وایە، کە پەروەردگار، هەمیشە لە ڕێی خەلیفەکانی خۆیەوە بەرەکەت بە ڕووی زەوی دەبەخشێت. مرۆڤەکان دەبێ لەژێر سەرپەرشتی و ڕێنماییی ئەو بوونەوەرە گەورانەدا بن، کە نیشانەی ناو و سیفەت و زاست و توانای خودایین و بوونەوەری خودائاسان و لەسەر دەستی ئەوان ببینن و پەروەردە ببن. ئەم خاوەن *فەرە* و *خەرەیانە*، هەر لە کیومەرسەوە تا سۆشیانت، خەلیفە خوداییەکانی سەرزەمین و مرۆڤی خودائاسا و کامڵن. مرۆڤ دەبێ دوای ڕووناکیی دەروون و پاداشتیان بکەوێت، ئەو پاداشتانەی جگە لە مەزدا، هیچی تر نییە. پێویستە لە ڕێی نزا و کردار و زوهد و پاکێتییەوە دوای ئەو پاداشتە بکەوێت. لە نزاکانی یەسن هەفتهادا هاتووە: ‹ئەی گەورەترین بوونەوەر! تۆ لە هەردوو دونیادا، جەستە و ڕۆحی ئێمە بە!› جەستە و ڕۆح وەختێ دەبێتە جیلوەگەی مەزدا، کە مرۆڤ بتوانێ بە جەستە و ڕۆح سەرگەرمی پەرستنی ئەو بێت. هورمز خوازیاری پەرستن و دڵسۆزییە پێکەوە. مرۆڤی خاوەن سەیروسلوک بە جیهانی نوور دەگات و زانینی ڕاستەقینە بەدەست دێنێت. ئازیزم، مرۆڤەکان یەک جۆر و یەک چەشن نین. هەرکەسە لەم ڕێیەدا پێگەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە. لە کەوانەی

سەرەوژێردا، ئاهورامەزدا دەر دەکەوێ و لە کەوانەی سەرەوژووری بوونیشدا، نیشانەکانی ئەو دەگەڕێنەوە بۆ مەزدائاهوڕە. دادای جیهان وەهای دەوێت، کە مرۆڤەکان بە ڕێنماییی ئاسمان و هەوڵ و تەقەللای خۆیان، ببنە مرۆڤێکی تر و پێ بنێنە دونیایەکی ترەوە. مرۆڤ گرفتاری هەوا و هەوەسە، بۆیە فریو دەخوات و دووچاری چەوتی و درۆ دەبێت و بەم جۆرەش، سەفای خۆی لەدەست دەدات. ئەو کەسانەی بە بیری باش و کرداری باش و گوتاری باشەوە بژین، ڕزگاریان دەبێت، ئیتر سەر بە هەر دین و مەزەبێک بن، گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە دوای ڕیاکاران و فریودەران و ئەوانە نەکەون، کە لافی درۆ لێدەدەن."

لە کاتی گفتوگۆکەیاندا، خزمەتکارێک هاتە لای بارام و پێی وت، کە بگەڕێتەوە بۆ خێوەتەکە. ئەو گەڕایەوە، بەڵام سوهرەوەردی بڕیاری دا ئەو شەوە لە دوندی کێو بمێنێتەوە.



#ماندووی دەستی مشتومڕ

لەودیو دەرگاکانەوە، جگە لە تۆ، ئەبێ کێ بێ
ئەی زایەڵەی گشت دەنگێ و ڕۆحی گشت ماڵێ
من ئەمشەو بە یادی تۆ مەستی مەستم، تا
ڕق و بوغزی گشت ڕۆژانی هوشیاریم ڕامماڵێ

تەنیا بوو. لەسەر دوندێکی بەرز و لە ئێوارەیەکی ماتدا! تا بڵێی دڵتەنگ و غەمگین بوو. لە تەنیاییەکانی خۆیدا، خەریکی نەجوا بوو. وەک قامیشێکی نەی، کە دابڕابێت لە قامیشەڵان، بۆ غوربەتی بێکۆتای ئادەمیزاد دەگریا. لەم بێئۆقرەییەدا پەنای بۆ نزا برد و چاویشی لەسەر ئەو پانتاییە پەنهانە بوو، کە نشینگەی فریشتەکانە:

"ئەی پەنای بوون! ئەی بەخشندە! ئەی سەرچاوەی بەرەکەت! ئەی ئاکامی گشت جووڵەکان. ئەی بالاترین دڵخواز! ئەی ڕووناکیی ڕووناکییەکان! لە تاریکییەکانی خۆپەرستییەوە، بەرەو سپێدەی پاکی و ڕووناکی ڕێنماییم بکە. لەم دنیایە ڕزگارم بکە و بە جیهانی نزیکی و مەلەکوت ئاشنام بکە.

هەستی کرد خەرمانەیەک لە ڕووناکی دەوری سەری دا. دەتوت شتێک لە قژی گیر بووە و ڕای دەکێشێت. ئاوێتەیەک لە ئازار و لەزەت سەراپای بوونی تەنییەوە. نەشئەیەکی

بەشکۆ گرتی. پیرێکی نوورانیی بینی، کە باوکی ئادەمیزاد بوو. بە ڕادەیەک نوورانی بوو، هێندەی نەمابوو لە تینی ڕووناکییەکەی ئاسمان و زەوی لەبەریەک هەڵبوەشێن. لە جوانیی پیرە، سەری سووڕ مابوو. بێ ئەوەی بیەوێ، بەرەو ڕووی ڕۆی. پیرەکە سڵاوی لێ کرد. یەحیا دانەوییەوە. ئەوەندەی نەمابوو لەبەر تیشکی ڕووناکییەکەیدا بسووتێت. دەگریا. پیرە نەوازشی کرد و وتی، "باش ڕزگارت بوو! زۆری نەمابوو هۆگری جیلوەی دونیا ببیت و بکەویتە ناو چاڵی ناوبانگ و پلەوپایەوە! لەو داوەی تێی کەوتیت، باش ڕزگارت بوو! بەڵام هەر لە زینداندا دەبیت، چونکە هێشتا خۆت لە هەموو کۆتەکان ئازاد نەکردووە. وەلێ لە هەموو بارێکدا نائومێد مەبە و دەسبەرداری هەوڵ و تەقەللا مەبە."

بەم قسانەی پیرەکە، ئارامی لێ هەڵگیرا و بە دڵ و بە کوڵ گریا. پیرەکە، کە سەیری حاڵی کرد، باوەشی پیا کرد و دڵی دایەوە و وتی، "گەڕانەوە بۆ زیندانی دونیا لەم دۆخەدا، ناچارییە، بەڵام دوو مژدەم پێیە بۆت: یەکەمیان ئەوەیە، کە ئەگەرچی دەگەڕێیتەوە بۆ زیندانی دونیا، بەڵام پەیوەندیت لەگەڵ دونیاکەی ئێمە هەر دەبێت. ناوبەناوێک لە سروشت دادەبڕێیت و دەچیتە بەهەشتی ئەودیو سروشتەوە. ئەم پەیوەندییەت دەمێنێت و ڕۆژبەڕۆژیش زیاتر و ئاسانتر دەبێت. دووەمیشیان ئەوەیە، کە سەرەنجام بۆ هەمیشە لە غوربەت ڕزگارت دەبێت و دەگەڕێیتەوە بۆ مەنزڵگەی ڕاستەقینەی خۆت."

"کەی؟ لەکوێ؟ شتێک زیاترم پێ بڵێ! کەی ڕزگارم دەبێت؟"





"دان بە خۆتدا بگرە! کۆتاییی شەوی ڕەش، سپییە و زۆری نەماوە بۆ سپێدەش! تەمەنی دونیایی چ نییە، چاوترووکانێکە، ڕزگارت دەبێت. تۆ لە زیندان ڕزگارت دەبێت. لەناو زیندانێکەوە لە شەقەی باڵ دەدەیت و بەرەو ئامێزی باوک دەفڕیتەوە. من باوکی تۆم و باوکی منیش لە ژوورترە و باوانیشمان هەیە، تا دەگەینەوە بەو مەزنەی خۆی بابی گەورەی هەمووانە، لێ خۆی بێ بابە. ئێمە هەموو ڕووناکی لەوەوە وەر دەگرین و ئەو باڵاترین شکۆیە و ڕووناکیی جاویدانە. ئەو لە هەموو شتێکدا جیلوەی کردووە و دوای فەنابوونی هەمووان، ئەو خۆی دەمێنێتەوە."

حاڵی گۆڕا. وەک ئەوەی لە ئاسمانەوە کەوتبێتە خوارەوە. خۆی بەگرفتاری لەسەر زەمینی لەهۆشخۆچوون و لە غوربەتی خۆرئاوابوونی زانیندا بینییەوە. خۆی و یادەوەریی ئەو لەزەتەی وەسف ناکرێ و حەسرەت و خەمی قورسی کۆتاییی ئەو دیدارە و خوێندنی کەڵەشێر، کە مژدەی سپێدەی دەدا.

# ئەی عەشق، هیممەتێ

من هێشتاکە هەر کاڵم، کوورەی خۆت گڕ دە ئەی عەشق
هەرچیی بووڤە بیسووتێنە، لە وشک و لە تەڕ، ئەی عەشق
باری منەتی تۆم، زۆر لەسەر شان کردۆتە کۆڵ
شمشێری خۆت بوەشێنە، جارێکی دیکە، ئەی عەشق

لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا، بەرەو خێوەتەکەی بارام ڕۆیشتەوە و بە سوپاسێکی زۆرەوە ماڵئاواییی لێ کرد. نزای کرد، خودایا سەفەرم خێر بێت و کەوتە ڕێ.

بە پێچەوانەی دوێنێوە، گەلێ شاد و خۆشحاڵ بوو و لەبەر خۆیەوە گۆرانیی دەوت.

ڕۆژانە کێوبەکێو دەڕۆیی و شەوانەش سەری دەنایە سەر بەردێک. دووچاری حاڵەتێکی سەیر بووبوو. نە دونیای بیر بوو و نە ئاخیرەت و نە تەنانەت عەشقیش.

دنیای عەشق و شێتی، ڕێسا و یاسای نییە. ڕەوتی ڕێبواری ڕێی هەق، جگە لە چەرمەسەرییە ئاساییەکانی، وەک دەستهەڵگرتن لە دەسەڵات و سامان و پلەوپایە و بێبەریبوون لە ئاسایش و هەروەها ئاوارەبوون و لانەوازی، دووچاری کۆمەڵێک ڕووداو و پێشهاتی سەیروسەمەرەی تری وەها تاڵ و سەخت دەبێت، کە بەرگەگرتنیان ئاسان نییە و تەنانەت پیاوی پتەویش دەهێننە سەر چۆک.

ماوەیەک لە دەوروبەری دەریاچەی ورمێ مایەوە، پاشان ئەم دێ و ئەو دێ، بەرەو دیاربەکر و شام ملی ڕێی گرتە بەر.

ڕۆژێکیان لە قەراغ ئاوێک دانیشتبوو، کە پیاوێکی بالابەرزی سەر و ڕیش تاشراوی نیوەڕووت، کە پێستی لەشی تاوەسووت بووبوو، لێی نزیک بۆوە. لە سەروسیمای سوهرەوەردی وردبۆوە و وتی، "سڵاو."

"سڵاو لە ئێوەش."

ئینجا هەر بەدەم وردبوونەوەوە لێی، پرسی، "تۆ یەحیایت؟ یەحیای سوهرەوەردی؟ شەهابەدین؟ لە مەراغەوە هاتوویت؟ خەریکی خوێندنیت؟"

سوهرەوەردی هەرچەندی کرد، نەدەهاتەوە یادی ئەو پیاوەی لەکوێ بینیوە. بە سەرسووڕمانەوە وتی، "بەڵێ! من یەحیام. خەڵکی سوهرەوەردم. ماوەیەکیش لە مەراغە خوێندوومە."

"من چەند ڕۆژێکە چاوەڕێی تۆم. خدر بەڵخی ئەمەی پێ وتم. ئەمانەتێکی دامێ، تا بتاندەمێ، وتی کە دووشەممە لێرە دەتبینم."

"خدر بەڵخی کێیە؟"

"دەروێشێکی گەڕیدەی خەڵکی بەڵخە. ساڵانێکە بە ناوچەکانی حیجاز و شام و عێراق و کوردستان و ئازەربایجاندا دەگەڕێت. ماوەیەک لەمەوبەر، لە مەراغە بووە و لەوێ تۆی بینیوە."

یەحیا کەمێک بیری کردەوە و ئینجا وتی، "ئا... بیرم کەوتەوە! پیرەمێردێکی میهرەبانە، بالایەکی مامناوەندیی





هەیە، کەوایەکی کورتی خووری دەپۆشێت و جبەیەکی بە سەرەوەیە."

"خۆیەتی. کەواتە بابڕۆین و ئەمانەتەکەت بدەمێ."

سەری سووڕ مابوو لەوەی ئاخۆ دەبێ ئەو ئەمانەتە چی بێت؟ چەند سەد مەترێک لەولای دامێنی کێوەکەوە، ئەشکەوتێکی بچکۆلەی لێ بوو، کە ئەو قەڵەندەرەی تیا دەژیا. چوو تا ئەو شتە بهێنێت و بیداتە دەست سوهرەوەردی. تەماشای کرد، خورجینەکەیەتی لەگەڵ مۆرە گڵینەکە و ئاوریشمە سەوزەکە و ئەو کەمەربەندەی سیندوخت لە کەمەری ئەمی بەستبوو، تا لە زیانی جڕوجانەوەران بیپارێزێت.

هەرچەندە ئێستا سوهرەوەردی وای لێ هاتبوو، کە ئەم شتانە بەلایەوە ئاسایی بوون. دڵی لەو شتانە هەڵکەنرابوو و هەستی دەکرد دووبارە پابەند دەبێتەوە بە هەندێ شتەوە، کە خۆی لێیان ڕزگار کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لەو پێشهاتە خۆشحاڵ بوو، لەبەر ئەوەی دەیزانی کە ڕازێک لەوەدا هەیە هەروەها یادگارییەکانی و نووسینەکانیشی بۆ گەڕاوەتەوە. قەڵەندەرەکە پێی وت، "من ناوم مستەفایە. خزمەتگوزاری دەروێشانم. تۆ لەم دیدارەدا غەریبیت، دەتوانیت لەگەڵ مندا بیت. یان لەم نزیکانە شارێک هەیە، ناوی شنۆیە و لەوێ شێخێک هەیە، ناوی جەلالەدینە، خانەقای هەیە و پێشوازی لە دەروێشان و غەریبان دەکات. دەتوانیت بچیت بۆ خانەقاکەی ئەو.

"ئەگەر بێنەزاکەتی نەبێت، لەگەڵ تۆدا دەبم."

"نەخێر، هیچ بێنەزاکەتی نییە و هیچ زەحمەتێکیشی تیا

نییە، بەڵام ئەوەی هەیە، من تا ڕۆژی هەینی لێرە دەبم و پاشان بەرەو دیاربەکر دەڕۆم. لە دیاربەکر و دیار ڕەبیعە هەندێ دۆستم هەن، ناوبەناو سەردانێکیان دەکەم."

"لەگەڵ تۆدا دەبم و پێکیشەوە دەچین بۆ دیاربەکر."



# خدر بەڵخی

گەر کەسێ وتی ئاگرەکە خامۆش بووە، باوەڕ مەکە
چوون تۆ خۆت دووکەڵ و داری، حەیی قەییومی، بلێ!

دەروێش مستەفا لە کوردە دڵسافەکانی شارەزوور بوو. سوهرەوەردی چەند ساڵێک لەگەڵیدا بوو. ماوەیەک لەگەڵ ئەودا بە ڕێوڕەسمی قەلەندەرییانە و بە سەروسیمایەکی شێواوەوە، لەم دیارەوە دەچوون بۆ ئەو دیار. مەشقی ڕۆحیی خۆی بە ئاکام گەیاند. لەم گەڕانانەیدا، بە دیداری گەلێ شێخ و ڕەند و قەلەندەری گومناو و سەرگەشتەی دۆڵی عەشق و عیرفان گەیشت و هۆگریان بوو. زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵیش، بەڕۆژوو دەبوو. شەوانی بە ڕازونیازی ڕۆحی و سرووت و نزاوە دەبردە سەر و هەتا بڵێی، خەو و خۆراکی کەم کردبۆوە.

لە کۆتاییی ئەم قۆناغە چوار-پێنج ساڵانەیدا، هەفتەی جارێک نانێکی سادەی دەخوارد. چەند ڕۆژێک بوو لەگەڵ پێنج دەروێشی دیکەدا، لە کێوەکانی دەوروبەری شاری هانی بوون. یەکێک لە سەرچاوەکانی ڕووباری دیجلە لەم کێوانەیە. ئەشکەوتێکی لێیە، کە سەرچاوەی ئاوەکە وا لەوێدایە.

ڕۆژی هەینی بڕیاری دا بۆ نوێژ بچێت بۆ هانی. مزگەوتی گەورەی هانی، جێی ژمارەیەکی زۆر خەڵکی تیا نەدەبۆوە،

بۆیە هەندێکیان لە حەوشەی مزگەوتەکەدا نوێژیان دەکرد. سوهرەوەردی درەنگ گەیشت، هەر بۆیە ئەویش لە حەوشەکەدا بۆ نوێژ ڕاوەستا. وەختێ نوێژەکەی تەواو کرد، هەستی کرد یەکێک دەستی خستە سەر شانی. کاتێ ئاوڕی دایەوە، سەیری کرد پیرەمێردێکە. سەرتاپای گیانی کەوتە لەرزین. خێرا هەستا و باوەشی بە پیرەدا کرد. خدر بەڵخی بوو، کە پێشتر دووجار لە مەراغە بینیبووی. سۆزێک دای گرت و دەستی کرد بە گریان و لە هۆش خۆی چوو.

خەڵکەکە لە هەموو لایەکەوە لێیان کۆ بوونەوە، تا بزانن چی ڕووی داوە. خدر بەڵخی، کە زۆرکەس نەیدەناسی، بەهێواشی سەری سوهرەوەردیی لەسەر ئەرزەکە دانا. پاشان هەستایەوە و بە خەڵکەکەی وت، "بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکەی خۆتان، هیچ نییە. ئەم دەروێشە دۆستێکی دێرینی خۆمە. ماوەیەکی زۆرە لە یەک دابڕاوین و سۆزی دووری لێی داوە، بۆیە کە منی بینی، بە کوڵ گریا و لە هۆش خۆی چوو. ئیتر ڕەنگە کەمێک نەخۆشیش بێت. لێی گەڕێن بۆ من و ئێوە بڕۆن."

سوودی نەبوو، تا هەندێکیان دەڕۆیشتن، هەندێکی تر دەهاتن، تا بزانن چ باسە. سەعاتێک تێپەڕی، بەڵخی لای سوهرەوەردییەوە دانیشت. دەستی بە سەر و ڕوومەتیدا هێنا. سوهرەوەردی، کە وەکوو بیی ناو ئاو دەلەرزی، وردەوردە هاتەوە هۆش خۆی، چاوی کردەوە و توند باوەشی بە بەڵخیدا کرد. بەڵخی داوای لێ کرد لەگەڵیدا بڕوات، سوهرەوەردییش، کە لە ئەنجامی مەشقە ڕۆحییەکانیەوە تەواو باریک و بنیس بووبوو، لەگەڵیدا کەوتە ڕێ. بەڵخی بەشێنەیی پێی وت





"شەهابەدین! مژدە بێت، کە کاری خۆت بە ئەنجام گەیاند. گوێم لێ بگرە و بە قسەم بکە؛ یەکەم، مەشقە ڕۆحییەکانت کەم بکەرەوە. دووەم، دەرفەتێکی کەمت بەدەستەوەیە، لەم دەرفەتە کەمەدا کاتەکانی خۆت بۆ دوو شت تەرخان بکە، ڕێکخستن و نووسینەوەی ئەو ڕاستییانەی پێیان دەگەیت و بەییان پێ دەبەیت، هەروەها بڵاوکردنەوە و برەودان بەو ڕاستییانە و بە بۆچوونەکانت."

سوهرەوەردی بە بیستنی ئەم قسەیە، هەم شادمان بوو، هەم غەمگین. شادمان بوو لەبەر ئەوەی مژدەی جۆرێک لە بەرکەماڵیی بیست و غەمگینیش لەبەر ئەوەی ناچار دەبێت دووبارە بکەوێتەوە گفتوگۆ و وتوویژ، کە ڕەنگە زیان بە زەوق و حاڵی بگەیەنێت. لە وەڵامی شێخ بەڵخیدا وتی، "من لە گەڕانەوە بۆ ناو خەڵک، نیگەرانم، تێکەڵبوونەوە بە خەڵک، پڕ لە گیروگرفت و خەتەرناکە. من لەو ساتەوەی خورجینەکە گەیشتەوە دەستم، نیگەرانی ئەو گیروگرفتانەم."

"نیگەران مەبە! هەر تەقەللایەک بۆ بەرکەماڵی، پێویستیی خۆی هەیە و هەر نێردراوێکیش پەیامی خۆی هەیە. ئەرکی هەموو کەسێکی ئاگامەند، بێدارکردنەوەی ئەوانی ترە. تۆ لەوێشدا ڕووبەڕووی بەڵگەیەکی ڕوون دەبیتەوە، پاشان دەهێیتە ناو خەڵکەوە. نیگەران مەبە! دەستی هەق و هیممەتی روقە باش و پاکەکان یاوەرت بێت. چ لە عێراق و چ لە ڕۆم و چ لە ئێراندا، بۆ هەرکوێیەک دەتوانیت، بڕۆ و ڕووناکیی دەروونت و ئەو شتانەی بەدەستت هێناون، بەسەر گەریدەکانی هەقیقەتدا ببەخشەرەوە."

نالەیەک کە عاشقانە، دەردی مەحرومی بڵێ
پارسی بڵێ ساتێک و ساتێکیش ڕۆمی بڵێ
گەر کەسێ وتی ئاگرەکە خامۆش بووە، باوەڕ مەکە
چوون تۆ خۆت دووکەڵ و داری، حەیی قەییومی، بڵێ!



# کام من؟

بە سەد شێوە ئەمن کە خۆم ببینم
بە هەرشێوەیێ ئەڵێم، من هەمانم
ئەڵێم ئەوە منم سەد شێوەم لێ دەرچووە؟
یان هەر شێوە نیم، من بێنیشانم

خدر بەڵخی لە نیگەرانییەکانی سوهرەوەردی تێدەگەیشت. بەردەوام دڵی دەدایەوە و هانی دەدا: "سەیر بکە، شەهابەدین! نوور یان ڕووناکی، خۆی لە خۆیدا بەخشندەیە، لەبەر ئەوەی لە بنەڕەتدا خۆی ڕووناکە، هەر ڕووناکییش بە کەسانی تر دەبەخشێت. لەبەر ئەوەی خۆی ڕوون و ئاشکرایە، یارمەتیی کەسانی تریش دەدات، تا ڕوون و ئاشکرا بن. ئەوانەی دەستیان بە زانینێکی باڵاتر دەگات، مشووری خافڵان و بێئاگایان دەخۆن. گەرچی تۆ وا دێتە بەرچاوت، ئەم کارە دژوار بێت و هەر بۆیەشە نیگەرانیت. بەڵام ئەم سێشەممەیە کە دێت، ڕووبەڕووی ئەزموونێک دەبیتەوە و دوای ئەوە، ئەو کارەت لا ئاسان دەبێت. لێرە خانەقایەک هەیە، لەوێ سێ ڕۆژ پێکەوە دەبین و ڕۆژی چوارەمیش لەگەڵ خۆت نابیت. دوای ئەوە، شتەکانی تریشت پێ دەڵێم."

بە ڕێنمایی خدر بەڵخی، سوهرەوەردی سێ ڕۆژ بە مەشقی ڕۆحییەوە سەرقاڵ بوو. شەوی سێشەممە تا

بەیانی بێدار بوو. شەوەکانی تریش ئەوەندە نەنوستبوو. پاش نوێژی بەیانی، بەڵخی پێی وت کە بۆماوەی سەعاتێک بخەوێت. دەمەوخۆرکەوتن بە دەنگی بەڵخی بەئاگا هاتەوە. بەڵخی بانگی کرد، تا لە حوجرەکە بچێتە دەرێ و ئەویش چووە دەرێ. سەیری کرد بەڵخی لەگەڵ دەروێشێکی قژئاڵۆسکاو و سپیاڵپۆشدایە، پشتیان کردۆتە دیوارەکە و بەرامبەر بە خۆرەکە ڕاوەستاون. بەڵخی ڕووی کردە سوهرەوەردی و پێی وت،

"سڵاو."

"سڵاو لە ئێوەش."

بەڵخی لە کاتێکدا ئاماژەی بۆ سپیاڵپۆشە بێدەنگەکە کرد، وتی، "یەحیا، ئەمە کێیە؟ دەیناسیت؟"

یەحیا سەیری کرد، کوتومت لە خۆی دەچێت، وتی،

"نەخێر!"

"نەتبینیوە؟"

"نازانم. لەوانەیە!"

"ئەمە سوهرەوەردییە!"

"کام سوهرەوەردی؟"

"یەحیا! تۆ."

"من؟"

"بەڵێ!"

سوهرەوەردی زیاتر لێی ورد بۆوە. بەڵێ، خۆی بوو. چەند سەیرە! هەرگیز خۆی بەو شێوەیە نەبینیبوو. چەند شکۆدارە، ئەمە نیگای ڕۆحە بۆ جەستە! تا ئێستا چەند جارێک خۆی دیبوو، لە ئاوێنەدا، لە ئاودا، بەڵام بەم





شێوە کامڵ و وردە نا! هەندێ ئەدگاری لە سەروسیما و شێوەی خۆیدا بینی، کە پێشتر نەیبینیبوو. خاڵێکی بچووک لەپەنا برۆی چەپیدا بوو، ئاسەواری دوو-سێ ئاوڵە لەسەر ڕوومەتەکانی، باڵایەکی مامناوەندی، دەموچاوێکی سوورفل و ڕیشێکی نە کورت و نەدرێژ، بەڵام وەک قژی ئاڵۆسکاو. بۆ یەکەم جار بوو *لەجەستەداماڵران* ئەزموون بکات. لەجەستەداماڵران واتە مرۆڤ بتوانێ وەک کراسێک جەستەی لە خۆی داماڵێت، یان وەک مارێک، کە کاژەکەی فڕێ دەدات، لە جەستەی خۆی بێتە دەرەوە. یەحیا وای لێ هاتبوو. جەستەی خۆی دوور لە خۆی و لەپەنا پیرەی بەڵخیدا بینی، کە پشتی کردبووە دیوارەکە و ڕاوەستابوو.

بەڵخی، کە سەیری کرد یەحیا واقی وڕماوە، وتی، "یەحیا! ئەمە جەستەی تۆیە! تەماشای خۆت بکە!"

یەحیا، کە تەماشای خۆی کرد، سەیری کرد هێشتا هەر بە جەستەی خۆیەوە ڕاوەستاوە. بۆیە بەڵخی درێژەی بە قسەکانی دا، "بەڵێ، ئەوەش جەستەی خۆتە! بەڵام نەک ئەم جەستە عەردییەی لای منەوە ڕاوەستاوە. بەڵکوو جەستەیەک لە جۆرێکی تر. ئاوڕێک لەدواوەی خۆت بدەرەوە." یەحیا ئاوڕی دایەوە. شتێکی سەیری بینی؛ ڕیزێک جەستەی خۆی، تا دەگاتە خۆر. تا ڕادەیەک، هەمووی لەیەک دەچوون! بەڵام تا لە خۆر نزیکتر دەبوونەوە، ڕوونتر و شەفافتر دەبوونەوە. یەحیا لە سەرسامیدا نوقم بووبوو، وەختێ بەڵخی پێی وت، "دیسانەوە تەماشا کە. تەماشا بکە تا نیگات بە خۆر دەگات."

یەحیا تەماشای کرد، خۆری بینی، هەروەها ئەردو

یەسور ناهید و سیندوخت، کە تا نزیک خۆر بەرز بووبووەوە. سیندوخت زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و ئاماژەیەکی پێ دا. یەحیا لە ئاماژەپێدانەکەی ئەودا نوقم بووبوو، کاتێ بەڵخی پێی وت، "تەواو، برۆ کەمێک پشوو بدە."

یەحیا چووەوە حوجرەکە. جەستەی خۆی بینی، کە هێشتا ڕاکشاوە. هەستێکی هەبوو، وەسف نەدەکرا. بۆ ماوەیەک لە جەستەکە ڕاما و بێئاگایانە لەبەر خۆیەوە کەوتە شیعرچڕین.

پاشان ئاگای لە هیچ نەما.



## بە مەشخەڵی نوورەوە

بانگ ئەکەم:
"ئەی ئەوانەی سەبەتەکانتان پڕە لە خەون،
سێوم هێناوە، سێوە سوورەی خۆر!"

دوای ماوەیەک، هاتەوە سەرخۆی. سەیری کرد بەڵخی وا بەژوور سەریەوە. بەڵخی دەستی بەسەر سەریدا هێنا و وتی، "ئەو خەونەت دێتەوە یاد، کە لە سوهرەوەرد چەند شەوێک لەسەریەک دەتبینی؟"

"بەڵێ، خەونی باڵ و فڕینەکەم، کە دەمویست بفڕم و نەمدەتوانی."

"بیرتە لە خەونەکەتدا پیرەمێردێک باڵەکەی تری پیشان دەدایت؟"

"بەڵێ، باڵەکەی تر بە دەستی پیرەمێردێکی ترەوە بوو."

"ئەو دووانە، هەردووکیان من بووم. ئەوە من بووم کە باڵەکەم پیشان دەدایت و ئەوەی باڵەکەی تریشی پێ بوو، هەر من بووم.

"من لە مەراغە هانم دایت بڕۆیت و ئەو باڵە بەدەست بهێنیت! ئێستاش هاتووم تا ئەو باڵەت بدەمێ."

"کەی دەمدەیتێ؟"

"دام پێت. ئەو ساتەی لە زیندانی جەستەت ڕزگارت بوو،

فڕیت. بە دوو باڵەوە! بە دوو شاباڵەوە! فڕینەکەت دەستی پێ کرد. بەڵام تا دوافڕین، دەبێ لەپاڵ خەڵکیدا بیت و پەیامی خۆت بەجێ بهێنیت. ڕۆحە پاکەکان ئەو ڕووناکییە دەدەنەوە، کە لە سەرەوە وەری دەگرن. ئەو ڕووناکییە دەبەخشنە ئەوانی تر. تۆش پێویستە ماوەیەک لەم گێتییەدا بمێنیتەوە. ئەو ڕاستییانەی پێیان گەیشتوویت، بیانگەیەنیت، کەسانی تر بێدار بکەیتەوە."

"تا کەی؟ دەبێ چەند بمێنمەوە؟ کەی دەفڕم؟"

"پەلە مەکە! هەرکەسە مۆڵەتی خۆی هەیە. بەڕاست، هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە، کە بۆچی باڵی چەپت نەبوو؟ یانی دەزانیت بۆچی باڵی ڕاستت هەبوو، بەڵام باڵی چەپت نەبوو؟"

"نەخێر! من هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە و نەچوومەتە ناو وردەکارییەکانی خەونەکەمەوە."

"ڕاست نیشانەی جیهانی ڕۆحە و چەپیش نیشانەی جیهانی جەستە. هەموو ڕێبوارێکی ڕاستەقینە، پێویستی بە هەردووکیان هەیە. بۆیە تۆش دەبێ ماوەیەک تێکەڵ بە خەڵک ببیت، هەم بە عەوام و هەم بە بژاردە و خەریکی کتێب و نووسینەکانت بیت. لە خەوندا کە دەتویست بفڕیت، مەیلت فڕین بوو بەرەو باڵا، بەڵام باڵی خۆت لە دوورەدەست، لەلای چەپی خۆتەوە بینی، کە بە دەستی منەوە بوو، بیرتە؟"

"بەڵێ، بەتەواوی بیرمە."

"ئەو چەپە، خۆرهەڵاتە. بەڵخ لە خۆرهەڵاتی سوهرەوەردە، ئەوە ڕەمزی خۆر و ئیشراق و حیکمەتی





ئیشراقی بوو. منیش خەونم دی، کە لە خۆرئاوادا باڵ بە لاوێک دەبەخشم. یەحیا، بەتەنها باڵ بەس نییە. چوون بەرەو ترۆپک پێویستی بە هێز هەیە و تۆش لەم قۆناغی پەیامەی خۆتدا، هێز بەدەست دەهێنیت. ئازیزم، لە تەریقەتدا مرۆڤ لەپڕێکدا و یەکسەر باوەڕ ناهێنێت بە خودا. بەڵکوو بە چەندەها قۆناغی بێباوەڕی و ئیماندا تێدەپەڕێت. لە بەڵخ حیکایەتێک هەیە، دەڵێت بازۆڕییەک* دەیەوێ بگات بە خۆر، هەموو ڕۆژێک بە خوێندنی ناوەکانی خودا دەگاتە شوێنێک، بەڵام دەگەڕێتەوە و دەکەوێتەوە سەر زەوی، تا سەرنجام دەستی بە ناوی مەزن ڕادەگا و بە خۆر دەگات. ئینجا پەڕ و باڵی دەسووتێ و یەکپارچە دەبێت بە نوور. تۆش بەم زووانە توانای ئەوەت دەبێت بفڕیت، تا دەگەیتە خۆر. دەبێ سەبرت هەبێت و نیگەران نەبیت لەوەی لەمەودوا قاچت لەسەر زەوی و دەستت لە ئاسمان دەبێت. بە چاوێک ڕواڵەت دەبینیت و بە چاوێکی تر ناخ. نە خەڵک دەبێتە پەردەیەک لەنێوان تۆ و هەقدا و نە هەقیش دەبێتە پەردە لەنێوان تۆ و خەڵکدا. ماوەیەک لەسەر زەوی بمێنەرەوە، تا پەیامی ناخ ئاشکرا دەکەیت و مژدەبەخشی ئازادی دەبیت. ئیدی جلیوەت دەبێت بە خەڵوەت و ئاوێتەبوونت بە گۆشەگیری. خەونت دەبێتە بێداری و بێداریشت دەبێتە خەونی پەیبردن و زانینی ڕاز و نهێنییەکان. ئیدی تا ئەو دەمەی ڕەنگەکان بێڕەنگ دەبن و بەندی ئارەزووەکان پارەپارە دەبن، من نابینیتەوە. وەلێ سیندوخت، ئەو فریشتە ئیلهامبەخشە لە ئاسۆی ژیانت دوور ناکەوێتەوە. کاتێ سەرگەرمی ناخ

* بازۆڕی: جۆرە باڵندەیەکە

بوویت؛ سیندوخت بەرز ڕابگرە، هەروەها خۆریش. وەختی لە جیهانی ڕووکەش و بەرهەستدا دەبیت."

بەڵخی بۆ ماوەیەک باوەشی بە سوهرەوەردیدا کرد، ماچبارانی کرد و پاشان لێی دوور کەوتەوە و وتی، "یەحیا! خۆر و سیندوخت بەرز ڕابگرە و جگە لە ڕووناکی و ئازادبوون، بیر لە هیچی تر مەکەرەوە. بڕوانە باڵا. بڕوانە ئاسۆ و خۆرهەڵات."

یەحیا ڕوانییە ئەو سەمتەی بەڵخی ئاماژەی بۆ کرد. خۆر و سیندوختی بینی. بۆ تاوێک نوقمی سەرسووڕمان بوو. کاتێک هاتەوە سەرخۆی، خدر بەڵخی ڕۆیشتبوو. هەستی کرد بەهێز بووە و لە توانایدایە سەبەتە پڕ لە خەونەکانی خەڵکی، پڕ بکات لە سێوە سوورەی خۆر!



# گوێدرێژەوان یان دانای زەمانە؟

گاڵتەیان بە کونجی وێرانت کرد، ئەمما
کەس گەنجەکەی تۆی نەبینی، ئەی ماڵوێران

سوهرەوەردی ماوەیەک لە میافارقین بوو. ئەو شارەی وارشە گەورەکەی لە بەردی سپی دروست کرابوو، لەگەڵ بورجە شکۆدارەکانیدا ببووە باسی سەر زمانی گەورە و بچووک. کڵێسایەکی مەزنیشی لێ بوو، کە گوایە لە سەردەمی عیساوە مابووەوە. دەیانگوت ئەو خاچە گەورەیەی بەسەر بورجەکەی ئاشووری خۆرئاوای شارەکەوە بوو، کاری هەمان ئەو سەنعەتکارە بووە، کە بورجە گەورەکەی کڵێسای قیامەتی لە بەیتولمەقدیس دروست کردووە. ئەو دوو خاچە سەرسووڕهێنەرە یەک شێوەیان هەبوو، هەروەها مزگەوتێکی لێ بوو، کە لەو ناوچەیەدا لە گەورەیی و فراوانیدا بێهاوتا بوو. زاناکانی ئەم شارە، کەم تا زۆر، ئاگاداری بیروبۆچوون و کارەکانی سوهرەوەردی بوون و ناوبانگێکی باشی لەناویاندا هەبوو. خوێندەوارەکانی ئەو شارە، بە پیر و لاوەوە، تامەزرۆی دیداری بوون و سوهرەوەردیش لەگەڵ هەموویاندا وتووێژی هەبوو. سەدیدولدین (ئیبن ڕەقیقە)ی تازە لاو، کە لە زانستی ئەو ڕۆژگارەدا و بەتایبەتییش لە پزیشکیدا هەڵکەوتوو

بوو، ڕۆژێکیان لە مزگەوتە گەورەکەی میافارقیندا لەگەڵ سوهرەوەردیدا پیاسەیان دەکرد، سوهرەوەردی جبەیەکی شینی کورتی لەبەردا بوو و فوتەیەکیشی لە سەریەوە پێچابوو. سوهرەوەردی پێی وت، "ئەقڵ تاقە ئامرازە، کە مرۆڤ لە گیانەوەر جیا دەکاتەوە. ژیری واتە پەیبردن بەو یاسا و ڕێسا و بنەما ڕوون و بەردەوامانەی دەکرێ لە ڕێیانەوە تەفسیری بوون بکەین. ئەقڵ تاقە ڕێگە و ئامرازی ئادەمیزادە بۆ ڕاڤەکردن و ڕێکخستنی ئەزموونە هەستییەکانی. جیاوازیی نێوان مرۆڤ و بەرخێک ئەمەیە. هەست و ئەزموونەکانی بەرخێک، بەتەنها لە سنووری هەستپێکردندایە و بەس. لە کاتێکدا زەحمەتە ئەزموونی مرۆڤ بەتەنها لە ئاستی هەستدا گیر بخوات. ئەزموونەکانی ئادەمیزاد هەمیشە دەچنە چوارچێوەیەکی ڕێکخراوەوە و ڕاڤە دەکرێن. من نرخی ئەقڵ و ئەنجامگیریی ژیرانە دەزانم، بەڵام لە هەمان کاتدا، نابێ زەوق و زانینە زەوقییەکانیش فەرامۆش بکەین."

ئیبن ڕەقیقە، کە بەوردی گوێی بۆ سوهرەوەردی شل کرد بوو، قسەکانی پێ بڕی و وتی، "کاری ئەقڵ، لە سەرێکەوە، لە کاری هەست دەچێت. من و تۆ هەردووکمان ئەم درەختە و ئەو دیوارە دەبینین و دەتوانین لەبارەیەوە بدوێین و لەیەک حاڵی ببین، بەڵام زانست و زانینە زەوقییەکان بەم شێوەیە نین. کەشفی هەرکەسێک تایبەتە بە خۆی و پەیوەندیی بەوانی ترەوە نییە. ئیدی لەکوێوە بتوانین بڕوا بەوە بکەین، کە ئەو خاوەن کەشفە بەڕاستی بە هەقیقەتێک گەیشتووە و گرفتاری وەهم و خەیاڵات نەبووە؟"





"هاوڕێ! کەشفیش بۆ خۆی ئەزموونە، تۆیش دەتوانیت تاقیی بکەیتەوە. لەجەستەداماڵران شتێکی خورافی نییە، خەونێک نییە مرۆڤ دەستی پێی ڕانەگات. هەرکەسێک بیەوێ، دەتوانێ تاقیی بکاتەوە. ماوەیەک هەوڵ بدات، دەتوانێ بە شێوەیەکی کردەیی ببینێت، کە چۆن جەستەی وەکوو کەوایەک لە خۆی دادەماڵێت و لە دوورەوە سەیری دەکات. ئەودەم لە سەروسیمای خۆیدا کۆمەڵێک وردەکاری دەبینێت، کە پێشتر لە هیچ ئاو و ئاوێنەیەکدا نەیبینیون."

"باشە، گریمان هەموو ئەمانە ڕاستن، بەڵام ئەمانە کاتێک ڕاستن، کە ئەو کەسە بەو ئەزموونەدا تێپەڕیبێت. کەسێک کە هێشتا بەو ئەزموونەدا تێنەپەڕیوە، چۆن دەتوانێ باوەڕ بکات؟ تۆ کە خۆت بەو ئەزموونەدا ڕۆیشتوویت، باوەڕت پێی هێناوە، بەڵام منێک کە بەو ئەزموونەدا نەڕۆیشتووم، چۆن بتوانم باوەڕ بەو شتەی تۆ بکەم؟"

"سەیرە، تۆیەک کە باوەڕت بەو هەموو زانست و هونەرانەی کەسانی تر هەیە و متمانەیان پێ دەکەیت، بۆچی ناتوانیت متمانە بە بیروبۆچوونەکانی کەڵەدانایانی حیکمەت و زانین بکەیت لەناو نەتەوە و ئایین و دەڤەرە جیاوازەکانی جیهاندا؟ دانایانی ئێرانی کۆن و یۆنان و هیندستان و کەسانێکی وەکوو هرمس و ئەفلاتوون و کەیخوسرەو و بوودا و سەدان دانای تر، باسیان لەم جۆرە ئەزموون و زانینانە کردووە. تۆ چۆن دەتوانیت بیروبۆچوونەکانی ئەم کەڵە دانایانە لەبەرچاو نەگریت؟ مەشائییەکان لە ئەستێرەناسیدا، ڕوانگەکەی بەتلیمیۆسیان پێ قبوڵە. تەنانەت ئەریستۆ چاودێریی جووڵەی ئەستێرانی

لە بابلیەکانەوە وەر گرت. چۆن دەکرێ ئەم شتانە لە ئەستێرەناسەکان قبوڵ بکرێت، کەچی بیروبۆچوونەکانی ئەو مەزنانە قبوڵ نەکرێن؟ ئەگەر توانا و ئەقڵانیبوونی باوەڕهێنان بە شتە هەستپێکراو و ڕووکەشەکان بەجێ و مەنتیقی بێت، لە مەسەلەکانی تایبەت بە ناخ و لایەنی ڕۆحیی مرۆڤیشدا، مەنتیقی دەبێت. ئەی لاوە دڵپاک و میهرەبانەکە، ئێمە کاتێ ڕوانین و پەیبردنە هەستییەکانی ئەوان لە ئەستێرەناسیدا قبوڵ دەکەین، ئەی کەواتە بۆچی ڕوانینی حەکیم و دانا مەزنەکانمان، سەبارەت بە مەسەلە ڕۆحییەکان، پێ قبوڵ نەبێت؟ ئازیزم، من خۆم یەکێک بووم لەوانەی تەواو لایەنگیریی مەشائییەکانم کردووە و نکووڵیم لە هەموو شێواز و مەسەلەیەکی سەروو ئەقڵ کردووە و گەر بەڵگەی ڕوونی یەزدانم نەدیبایە، هەر لەسەر ئەو ڕێگەیە سوور دەبووم.“

”کام بەڵگە؟“

”دەبێ خۆت بیبینیت، ئەوە شتێک نییە بگوترێ.“

”لانی کەم، ئاماژەیەک.“

”ئەمەیان ڕێی تێ دەچێت، بەڵام گرنگ نییە، چونکە ئەوەی گرنگە، گەیشتنە، نە بینینی ئاسەوارەکانی. ئەوە چییە لە پەنجەی دەستەڕاستتدا؟“

”ئەنگوستیلەیە.“

”چۆن ئەنگوستیلەیەک؟ ئادەی کەمێک وەسفی بکە بۆم.“

”ئەنگوستیلەیەکی زیوە، نقێمی ئاقیقە. نەخشی *یا* حەیی تیایە و یادگاریی باوکمە.“

سوهرەوەردی دەستی درێژ کرد و وتی، ”دەتوانم





سەیرێکی بکەم؟“

”بەسەر چاو، سەروەرم.“

سەدیدولدین دەستی برد، تا ئەنگوستیلەکە لە پەنجەی دابکەنێت و بیداتە دەست سوهرەوەردی، بەڵام حەپەسا، کاتێ سەیری کرد ئەنگوستیلەکە لە پەنجەیدا نەماوە و وا لەناو دەستی سوهرەوەردیدا و بە سەرسامییەوە وتی، ”ئای، سەروەرم!“

سوهرەوەردی بە خوێنساردییەکەوە وتی، ”مەگەر چی بووە؟“

”ئەنگوستیلەکەم، چۆن ئەوە ڕووی دا؟“

”کوا؟ هیچ ڕووی نەداوە، سەرنج بدە.“

سەیدولدین دووبارە سەیری دەستی خۆی کردەوە، تەماشای کرد ئەنگوستیلەکە چووەتەوە پەنجەی. لەم حاڵەتی واقوڕمانەدا بوو، وەختێ ئیبن عەتای موحدیسی بینی، کە بە دەستی ئاماژەی بۆ دەکرد، وەرە، وەرە.“

کە سەدیدولدین بەرەو ڕووی چوو، بە تووڕەبوونەوە پێی وت، ”چییە؟ پیاو قاتی بووە، وا لەگەڵ ئەو گوێدرێژەوانەدا پیاسە دەکەیت؟“

”تکایە بێدەنگ بە! ئەوە شەهابەدینی سوهرەوەردییە! زانا و حەکیمی ئەم سەردەم و ڕۆژگارەی ئێمەیە.“

ئیبن عەتا بە تەوسەوە زەردەخەنەیەکی کرد و ڕۆیشت.

# گەڕان بەدوای ئینساندا

لەم هاوڕێ خاووخلیچکانە پەستم

دەستم خوازیاری شمشێرەکەی خوا و ڕۆستەمە

سوهرەوەردی بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەو پەیامە قورسەی لە ئەستۆیدا بوو، ئارام و ئۆقرەی لێ بڕابوو. لە دیاربەکرەوە بۆ ڕۆم و شام، شاربەشار سەفەری دەکرد و هەموو هەوڵ و تەقەللای خۆی دەخستە گەڕ، تا زانایان و میرانی ئەو دەڤەرانە ببینێت و باسوخواسیان لەگەڵدا بکات.

لە دیاری ڕۆم ماوەیەک لە کاروانسەرایەکدا ژیا. زستان بوو و هەواش سارد. هەموو شەوێک، دوای ئەوەی بەتڵێک لەشەو ڕادەشکا، دەنگێکی مەلەکوتی لە کاروانسەراکەدا دەنگی دەدایەوە. دەنگی سوهرەوەردی بوو، کە بە ئاوازێکی دلنشینەوە قورئانی دەخوێند.

فەقیهێکی قەزوینی، کە تازە هاتبوو بۆ ئەوێ، بە سەرسامییەوە گوێی بۆ ئەو دەنگە شل دەکرد، کە هەموو کاروانسەراکەی پڕ کردبۆوە. بەیانییەکان دوای ئەوەی ئەم دەنگە، ئارام و ئۆقرەی لێ بڕیبوو، لە بەرپرسانی کاروانسەراکەی پرسی، ”چ کەسێک لەو حوجرەیەی تەنیشت منە؟“

”کام حوجرەیە؟“

"ئەو حوجرەیەی دەستە ڕاستی حوجرەکەی من."

"شەهابەدینی سوهرەوەردی."

"چەند ڕۆژێکە لێرەم، بەزۆری هەر ناوی ئەو دەبیستم. خەڵکی ئەو دەوروبەرەی لای ئێمەیە. سوهرەوەرد لە قەزوینەوە زۆر دوور نییە. دەمەوێ بیبینم. بمبە بۆ لای."

"ئاخر ئەو پێشوازی لە کەس ناکات."

"ئەی چار؟ من حەز دەکەم بیبینم."

"لێرە چاوەڕێ بە. کاتێک خۆر هەڵدێ، سوهرەوەردی دێتە دەرەوە و دەچێتە سەربان و بەرامبەر بە خۆرەکە دادەنیشێت. وەک ئەوەی لەگەڵ خۆرەکەدا بکەوێتە ڕاز و نیاز. ئەو کاتە دەتوانیت لە سەربان بیبینیت."

قەزوینی چاوەڕێی کرد. ڕێک لەو کاتەدا کە خۆر دەر کەوت، سوهرەوەردی لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە، فەرەنجییەکی ڕەشی لەبەردا بوو، لەگەڵ کڵاوێکی لباددا. قەزوینی چووە لای و تکای لێ کرد ڕێی بدات بۆ ماوەی سەعاتێک لەلایەوە دابنیشێت. سوهرەوەردی قایل بوو. قەزوینی گەرچی سوهرەوەردیی لە خۆی بە لاوتر دەزانی، بەڵام هەرچەندی دەکرد، نەیدەزانی لەکوێوە دەست بە قسە بکات. سوهرەوەردییش چاوی بڕیبووە خۆر و لەبەر خۆیەوە ورینگەورینگی دەکرد. قەزوینی پاش ماوەیەک بێدەنگی، سەرەنجام وتی، "شەهابەدین! بە دیدارت شادمانم. دەمەوێ بڵێم، کە ئەم جۆرە جلەی پۆشیوتە، لە وڵاتی ئێمەدا باو نییە. لەو بڕوایەدام وا باشتر بوو جلێکی ترت بپۆشیایە."

سوهرەوەردی بە بێدەربەستییەوە وتی، "چڵکن دەبێت."

"باشە، دەتوانیت بیشۆیت."





"جا ئەوە سوودی چییە، دیسانەوە چڵکن دەبێتەوە."

"تۆش دیسانەوە بیشۆرەوە."

"جا گەر وا بێت، دەبێت من هەموو ژیانم بۆ جلشوشتن تەرخان بکەم، لە کاتێکدا من کاری گرنگترم لەپێشە بیکەم."

سوهرەوەردی هەستا و کابرای جێ هێشت و ئەویش نەیدەزانی چی بڵێت.

چەند ڕۆژێک تێپەڕی. عەسرێکیان ئەوی بۆ حوجرەکەی خۆی برد. ئەم جارەیان توانیی هەندێ پرسیاری سەبارەت بە حیکمەت لێ بکات. لێی پرسی، "سەبارەت بە زانستی خواوەند لە ئاست بوونەوەرەکاندا، بیروبۆچوونی زانایانی دینیت پێ قبوڵە یان بیروبۆچوونەکانی ئیبن سینا؟"

"هیچیان!"

"بۆچی؟"

"لەبەر ئەوەی ئەم فەقیهانە بەزۆری پەیڕەوی لە ئەبولحەسەنی ئەشعەری دەکەن و هەرچی کێشە هەیە، بە *ئێمە نازانین* چارەسەر دەکەن. من ئەمەم پێ قبوڵ نییە. هەرکەسێ خاوەنی دانایی بێت، مافی زانینی هەیە. شانازیی مرۆڤ لەوەدایە، کە بزانێت، نەک ئەوەی بەسەر ئەقڵ و ئەندێشەی خۆیدا هەڵشاخێت و هیچ نەدا بەدەستەوە."

"ئەی بۆچوونەکانی ئیبن سینا؟"

"من لە نووسینەکانمدا، بەتایبەتییش لە کتێبی *حیکمەتی ئیشراق*دا، بەوردی ئەوەم ڕوون کردۆتەوە، کە شیکردنەوەکانی ئیبن سینا لەو بارەیەوە دروست نین. چۆن دەکرێ زانست بە هۆ 'عیللەت' یەکسان بێت بە زانست بە بەرهۆ 'مەعلول'؟ هۆ شتێکە و بەرهۆ شتێکی تر. هەرگیز

زانست بە *ئەلف* یەکسان نییە بە زانست بە *بێ*."

"ئەی کەواتە چۆنە؟"

"زانستی خودا لە شێوەی زانستی ڕووبەڕووبوونەوەدایە. وەک چۆن من تۆ دەبینم، خوداش ئاوەها بوونەوەرەکان دەناسێت. لەبەر ئەوەی لەنێوان ئەو و بوونەوەرەکاندا، پەردەیەک لە ئارادا نییە، زانست و بینینی خودا یەک شتە."

"کارت ڕاست بێت، شتێک فێر بووم. من سەبارەت بەو قسەیەی ئەو ڕۆژەم لەبارەی پۆشاکەکەتەوە، شەرمەزارم، بمبەخشە."

"کێشە نییە. تۆ شتێکت وت، منیش وەڵامێکم دایەوە. بەڵام ئەوەندە بزانە، کە مرۆڤ کارێکی گەورەی لەپێشە. کاری ئینسان ئەوە نییە شیلەی بەخششە خوداییەکان هەڵلووشێت و بیکات بە پیسایی." کابرای قەزوینی هیچی نەوت. تێدەفکری و لە بێدەنگیدا نوقم بووبوو.

سوهرەوەردی لێی جیا بۆوە و ڕۆیشت.



# دیسانەوە لە هانی

ژێر دارهەرمێیەکی خونچەگرتوو
بە بەدەنێکەوە لە ئامادەبوون
لە چەند مەترێکا مەملەکەتی خۆم بینییەوە

مانگی ڕەشەمێ بوو. دنیا وردەوردە خەریک بوو دەبوو بە بەهار. قەڵای بەناوبانگی *شەمبا* لە داوێنی خۆیدا ئاواییەکی گەورەی گرتبووە خۆ. دانیسەر و ماردینیش هەر لەو ئاقارە بوون. ماردین شارێکی جوان بوو، کاروانسەرا و بازاڕ و قوتابخانەی لێ بوو. خانووەکان وەکوو پلیکانە لەسەریەک دروست کرا بوون. ئەو خانووانەی سەرەوە، دەیانڕوانی بەسەر ئەوانەی خوارەوەدا. ڕووبارە بەهاژوهووژەکەی سوور، کێڵگەکانی ئەو دەڤەرەی تێراو دەکرد. تا چاو بڕ بکات، باخ و کێڵگە بوو. لە بەشی باکووری ئەم ناوچەیە، شاری سەوز و جوان و سازگاری ئامەد و هانی قوت بووبوونەوە.

سوهرەوەردی حەزی بەم ناوچەیە بوو، بەتایبەتییش لە وەرزی بەهاراندا، لە هانی دەمایەوە، لەبەر ئەوەی فەخرەدین ماردینییش لەوێ نیشتەجێ بوو. سوهرەوەردی هەموو ساڵێک لە مانگی ڕەشەمێدا جۆشوخرۆش و حاڵێکی تری هەبوو. هەندێ جار وای لێ دەهات، تەحەممولی

کەسی نەدەکرد و بەرەو سارا ملی دەنا. ئیسپەندارمەدی* ژنە خواوەند کەیبانووی جیهانی زەوییە. کاری ئەو، پەروەردەکردن و بەپیتکردنی زەوییە. لە سۆنگەی ئەوەوەیە، کە خاک و ئاو دەگۆڕێن بۆ بوونەوەری ناسک و بەهاداری وەکوو گوڵ و میوە و سەرتۆپی هەموو ئەم بەروبوومە خاکی و ئاوییانەش، ڕۆحی ئادەمیزادە، کە بە هۆی ئیسپەندارمەدەوە، لە جەستەی پێگەییوی ئەوەوە پەیدا دەبێت.

ئەم جارەیان یەحیا لە جاران شەیداتر، ڕووی کردە سارا. ڕۆژان بەڕۆژوو دەبوو و بە چەند ڕۆژێک جارێک ڕۆژووەکەی دەشکاند. کە نانیشی دەخوارد، شتێکی کەمی دەخوارد و لەبری ئەوەی زیاتر خەریکی خوێندنەوەی قورئان و نزا و وێرد بێت، لەبەر خۆیەوە و بە ئاوازەوە شیعری عاشقانەی عەرەبی و فارسی و کوردیی دەوتەوە.

لەگەڵ هاتنی بەهاردا، دەیروانییە پەرەسێلکەکان وەختێ دەگەڕانەوە بۆ هێلانەکانیان، بە سەرسامییەوە و بۆ ماوەی چەند سەعاتێک، لە تەماشای گژوگیا تازە سەردەرکردووەکانی کەنار جۆگەکان و کێڵگەکاندا نوقم دەبوو. بە شادمانییەوە لە گەشەکردنی نەمام و شکۆفەکردنی خونچەکان ڕادەما. بە ئەڵهاوە نیگای تاڤگە و ڕووبار و کانیاوەکانی دەکرد. بەلای ئەوەوە، کەشوهەوای بەهار عەتراوی بوو و زەمین و زەمان تیایدا دەچوونە بەر لێزمەبارانی عەشق و ئەوینەوە.

جاری وا بوو چەندین کاژێر بەدەوری درەختێکدا

* ناوی مانگی ئیسفەند، ڕەشەمێ لەوەوە هاتووە.





دەسووڕایەوە، کە پڕ لە گەڵا و گوڵی تازە بوو، سترانی دەچڕی و بەدەوریدا دەهات و سەمای دەرویشانەی دەکرد. دەتوت زەمین و زەمەنیش لەگەڵیدا سەما دەکەن. لەبەر ئەوەی هەواکەش سارد بوو و بارانیش دەباری، شەوانە دەگەڕایەوە بۆ ژوورەکەی لە ناوچەیەکی بەرزی شاری هانی. تا سپێدە بەبێداری دەمایەوە و کە خۆر دەکەوت، لە ژوورەکەی دەچووە دەرێ و لە خۆر و شتگەلێکی تری دونیاکەی خۆی ورد دەبۆوە. کۆتاییەکانی مانگی ڕەشەمێ بوو و شەوێکیان تا بەیانی نەخەوتبوو. بڕیاری دابوو ساتی خۆرکەوتن لە جەستەداماڵران ئەنجام بدات. ئەم لەجەستەداماڵرانەی لەگەڵ ئەوانی تردا جیاواز بوو. لە یەکەم جەستەداماڵراندا، خدر بەڵخی یارمەتیی دا و جارەکانی تریش، لە ئەڵقەکانی زیکر و سەمادا بوو و تەنیا نەبوو. ئەم جارەیان دەیویست بەتەنیا ئەزموونی بکات و هەواڵی تازە لەو دنیایەوە بەدەست بهێنێت.

دوای نوێژ و نزای بەیانی، دەستی بە سەما کرد. ئەمە یەکەم جاری بوو لەو کاتەدا سەما بکات. حاڵەتێکی سەیری هەبوو. دار و دیوار لەگەڵیدا سەمایان دەکرد. بە عەرەبی لەبەر خۆیەوە ئەمەی دەچڕی:

رق الزجاج ورقت الخمر
فتشابها فتشاكل الأمر
فكأنها خمر و لا قدح
و كأنها قدح و لا خمر

پاشان بە فارسی:

گر پیشتر از مرگ طبیعی مردی
برخور که بهشت جاودانی بردی
ور زان که در این شغل قدم نفشردی
خاکت برسر که خویشتن آزردی

دەخولایەوەو دەیوت:

عشق به بازار روزگار برآمد
دمدمه حسن آن نگار برآمد
عقل که باشد، کنون چو عشق خرامید؟
صبر که باشد، کنون چو یار برآمد؟

ناگەهان دووچاری حاڵەتێک بوو، کە ژوورەکەی جێ هێشت و بەرەو سارا ڕۆی. وەختێ بەلای مزگەوتەکەدا ڕۆیی، چاوی بە فەخرەدین ماردینی کەوت، کە لەگەڵ ژمارەیەک باوەڕداردا لە مزگەوت دەر دەچوون و بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتنەوە. لە کاتێکدا لە شادیدا پێی نەدەکەوتە سەر ئەرز، سڵاوێکی کرد و تێپەڕی. ماردینی زانیی ئەو لە چ حاڵێکدایە، بۆیە هەر وەڵامێکی سڵاوەکەی دایەوە و هیچی تر، بەڵام نیگای خستە دوای ئەو سیپاڵپۆشە قەڵەندەرە، کە سەرمەست و بەدەم سەماوە دەڕۆیی و باکی بە زەمین و زەمەن نەبوو.

ساتی خۆرکەوتن نزیک بووبووەوە، وەختێ گەیشتە باخێک. پاڵی دا بە قەدی دارهەرمێیەکەوە، کە تازە چرۆی کردبوو. پێدەچوو لەو هەموو سەما و جووڵەیە ماندوو





بووبێت. چونکە شەو باران باریبوو، زەوییەکە هێشتا تەڕ بوو و گژوگیاکان دیمەنێکی دڵڕفێنیان هەبوو. ڕوانییە خۆرهەڵات. لەناکاودا هەستی کرد نوورێک هەڵات و ئەوی پەلکێش کرد و لەناو خۆیدا فەنای کرد. هەستی کرد هەموو دنیا نوقمی ئەو نوورە بووە. ئەمە جیلوەیەک بوو لە نووروڵئەنوار. جلیوەیەک لە میهر و عەشق و پاشان لەو سێڵاوی نوورەدا، لە هیچی دی حاڵی نەبوو و چووە کەوشەنی بێئاگاییەوە.

پاش ماوەیەک، کە کەمێک هاتەوە سەرخۆی، لەناو شەپۆلەکانی نوور هاتە دەرێ. ئەم جارەیان خۆری بینی، کە لە ئاسۆوە هەڵدەهات و سیندوختی بینی؛ کە لەناو دونیایەک وەنەوشەدا نوقم بووبوو و لەگەڵ خۆردا لە جلیوەدا بوو. سیندوخت لەتەک خۆردا لە ئاسۆوە بەرز دەبۆوە و یەحیاش ساتبەسات پتر لێی نزیک دەبۆوە. سیندوخت، کە دەنگی هێندەی سرووش شیرین بوو، دەیگوت، "یەحیا، وادەی دیدار نزیکە! بەڕێوەیت و دێیت بۆ لام. لە زەمینەوە تا ئاسمان، لە زیندانەوە تا ئازادی و لەو قەفەسەوە تا بەرینایی بێکۆتایی گۆڤەندی زوهرە، ئەوەندەی نەماوە."

تەماشای ئەو سەمتەی کرد، کە سیندوخت قەفەسەکەی پێ پیشان دابوو، سەیری کرد پاڵی داوە بە دارە پڕ چرۆکەوە و... مەلەکوتیش چەند مەترێک لێیەوە دوورە...

# نیگەرانم مەبن

سادەلەوحن ئەوانەی
کە چرای شین
بە نەسیم ئەترسێنن
خوێنی خۆم ئەسووتێنم و
گڕ دەگرم
ئەمێنمەوە

لە شاری هانی و وەک نەریتێکی هەمیشەیی، کاژێرێک بەر لە بانگی نیوەڕۆ، هەندێ لە قوتابییەکان و کاسبکارەکان بۆ ماڵی ماردینی دەهاتن و دەمەونیوەڕۆ لەگەڵ ئەودا دەچوون بۆ مزگەوت. ئەم کاژێرە دەرفەتێکی باش بوو بۆ پرس و باسوخواس لەسەر مەسەلەکانی شەرع و هەواڵی تازە، یان گوێگرتن لە گفتوگۆی نێوان زاناکان. سوهرەوەردییش بۆ ئەم دانیشتنانە دەچوو و لە سووچێکدا دادەنیشت و لە باس و گفتوگۆکاندا بەشداریی دەکرد. ئاسمان هەور بوو، ئەحمەدی خزمەتگوزار هەستی کرد نیوەڕۆ نزیک بووەتەوە، بۆیە چووە ژوورەوە و ڕاوەستا، تا ماردینی قسەکانی تەواو بکات. ماردینی بە سەیرکردنەکەی ئەحمەددا زانیی کە دەیەوێ بڵێت نیوەڕۆیە و دەبێ بچێت بۆ مزگەوت. تەماشای ئەحمەدی کرد و لێی پرسی، "دەڵێیت چی؟"

”گەورەم، نیوەڕۆیە. دەبێ بڕۆین!“

بەرەو مزگەوت کەوتنە جووڵە. وەختێ نوێژ تەواو بوو، ماردینی، سوهرەوەردیی بانگ کرد، ”شەهابەدین!“

”بەڵێ، سەروەر!“

”حەزدەکەم نیوەڕۆ پێکەوە نان بخۆین. بەڕاست، خۆ بەڕۆژوو نیت؟“

”بەڵێ، بەڕۆژووم.“

”کێشە نییە، لەماڵەوە پشوو بدە. عەسر پێکەوە دێین بۆ مزگەوت. بۆ بەربانگیش، میوانی من بە.“

”نامەوێ زەحمەتتان بدەمێ.“

”زەحمەت نییە.“

”بەڵام من عەسر وادەیەکم هەیە، دەبێ بچم بۆ شوێنێک. بۆ بەربانگ، بمبوورە. ئەگەر کارێکت پێمە، دەتوانم بێم بۆ ماڵتان. ئێستا یان هەرکاتێکی تر.“

”بەڵێ، کارم پێتە. پێویستە پێکەوە قسە بکەین. با بچین بۆ ماڵی خۆمان.“

ماردینی، پاش نانی نیوەڕۆ، لەگەڵ یەحیادا پێکەوە دانیشتن. بە ئەحمەدی خزمەتگوزاری وت، ”با کەس نەیەت، تا نوێژی عەسر کارم هەیە. هەرکەسێ هات، با تا عەسر چاوەڕێ بکات.“

ماردینی پشتییەکی خستە ژێر ئانیشکی و لەسەر لا لێی ڕاکشا. سوهرەوەردییش دانیشت و پاڵی دا بە دیوارەکەوە. ماردینی سەیرێکی یەحیای کرد و بە ئارامی پێی وت، ”شەهابەدین! من تۆم خۆش دەوێ و باوەڕیشم وایە تۆ پیاوێکی گەورە و سەرسووڕهێنەریت. خۆت دەزانیت نە ماڵ





و نە سەروەتی دنیا شک دەبەیت و نە پلەوپایە و دەسەڵات، تا یەکێک بۆ مەرایی بیەوێ ستاییشت بکات. من خۆشم ئەهلی مەرایی نیم، بەڵام خۆشم دەوێیت و نیگەرانتم.“

”بۆچی نیگەرانمیت؟“

”لەبەر ئەوەی جەسارەتت لەڕادەبەدەرە. سوهرەوەردی! تۆ لەم وڵاتەدا بێکەس و بێدەر و تەنیایت. ئەم جەسارەت و پڕکێشییەت تووشی کێشەی گەورەت دەکات و ئەوسا کەسیش بە دادت ناگات. من باشیی تۆم دەوێت و خۆشم دەوێیت و دڵم بە حاڵت دەسووتێ. تۆ لاویت! پاشەڕۆژێکی باشت لە بەردەمدایە. من لە هەموو تەمەنمدا کەسێکم نەدیوە، هێندەی تۆ هوشیار و زیرەک بێت. تۆ کەسێکی هەڵکەوتوو و بلیمەتیت. دڵنیام دەبیتە یەکێک لە حەکیم و زانا گەورە و بەناوبانگەکانی ئێمە. ئاگات لە خۆت بێت، با زمانت نەبێتە هۆی ئەوەی سەرت بە فەتارەت بدات.“

”قوربانت بم، سەروەرم! دەزانم لە گەورەییی خۆتانەوەیە، کە منتان خۆش دەوێت. من لەم ماوەیەدا جگە لە خۆشەویستی و گەورەیی، هیچی ترم لە ئێوە نەدیوە. دەزانم، سەروەرم، دەزانم کە تۆ نیگەرانی منیت و هەر ئەمەشە وات لێ دەکات ئامۆژگاریم بکەیت. بەڵام... بەڵام...“

”بەڵام چی؟ بیڵێ، با بزانم! هەرچییەکت هەیە، بیڵێ! حەز دەکەم گوێت لێ ڕابگرم و وەک ڕاوێژکارت بم. حەز دەکەم ڕاوێژم پێ بکەیت. کەمێک ئاگات لە زمان و قسەکانت بێت. دەی بڵێ، بزانم.“

”سەروەرم، من لە هەستی تۆ تێدەگەم و سوپاسی میهرەبانییەکانت دەکەم. بەڵام سەروەرم! ڕۆژگارەکەمان

بەڕاستی ڕۆژگارێکی خراپە. فەرمانڕەوا و میرەکان تا بڵێی خراپەکار و ستەمکارن. ئەوەتانێ زۆرینەی خەڵک ستەمدیدەن و لە دین و دونیا بێبەشن و دەڵێی بۆ ئەوە خولقاون، شەو و ڕۆژ ئازار و ئەشکەنجە بچێژن و بەرگەی ئەم ژیانە دۆزەخییە بگرن، لە کاتێکدا کەمینەیەکی سووکتر لە ئاژەڵ خۆیان بە سێبەری خوا و خەلیفەی مستەفا دەزانن و ژیانێکی پڕخۆشگوزەرانی و بەهەشتئاسایان بۆ خۆیان دروست کردووە. ڕۆژ نییە شایەتی تاوان و دەستدرێژیکردنە سەر مافی خەڵکی نەبین. سەروەرم! لەم حاڵەتەدا، ئەرکی ئێمە چییە؟ ئەرکی ئەوانەی بەڕاستی ئەهلی زانست و زانینن، نەک ئەوانەی لافی ئەوە لێدەدەن؟ لە هەلومەرجێکی وەکوو ئێستای ئەم کۆمەڵگەیەدا، سێ ڕێگە زیاتریان لە بەردەمدا نییە:

"یان ئەوەتا دەبێ خزمەتی ئەو ملهوڕانە بکەن. یان بۆخۆیان گۆشەیەک بگرن و هەقیان بەسەر هیچ شتێکەوە نەبێت. یاخود دەبێ ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەن و لەبیری ئەو خەڵکە ستەمکێشە و ژیانە سەختەکەیاندا بن. سەروەرم، من ڕێگەی سێیەمیانم هەڵبژاردووە. لە ئەنجام و ئاکامەکانیشی بەئاگام. ڕاستە غەریب و بێپشتوپەنام، بەڵام خوا باشترین پشتوپەنامە. جگە لەوە، چ پشتوپەنایەک لە هەقیقەت بەهێزترە؟ باکم نییە. من ئەو دەسەڵاتدارانە زۆر لەوە بچووکتر دەبینم، کە خەڵکی دەیانبینن. ئەمانە خۆیان و دەسەڵات و حکومەتەکەیان پوولێکی قەڵب ناهێنن. بگرە مایەی شوورەیین، ئەمانە ئادەمیزاد چەپەڵ دەکەن. ئەوانە کێن، تا من بە هەند وەریان بگرم؟"





"شەهابەدین، تۆ دەڵێیت چی؟ دواجار ئەوەتانێ، دونیا بەدەست ئەوانەوەیە. ئەوانە خۆیان بە خاوەنی سەروەت و سامان و ژیان و مەرگی خەڵک دەزانن. وەکوو نەمروود لەو باوەڕەدان، کە ئەوە ئەوانن ژیان بە ئادەمیزادەکان دەبەخشن، یان مەرگیان پێ ڕەوا دەبینن. چۆن بە هەند وەریان ناگریت؟ ئەوانە ئاوخواردنەوە و کوشتنی ئینسانیان بەلاوە وەکوو یەکە. ئەو لەسێدارەدان و ملپەڕاندنانەی بە بەرچاوی خەڵکەوە ئەنجامی دەدەن، هەر بۆ ئەوەیە خەڵکی پێ چاوترسێن بکەن."

"دەزانم! بەڵام من تەنانەت دەربەستی ئەوەش نیم. ئەوان دەتوانن هەرچییەکیان بوێت، بەرامبەر بە جەستەم بیکەن، بەڵام من دەمێکە خۆم لە جەستەم ئازاد کردووە. ئەم گورگە برسییانە هەرکاتێ ویستیان جەستەم بخۆن، با بیخۆن."

"شەهابەدین، خۆت دەزانیت من نیگەرانتم. هەر بۆیە حەزم کرد قسەشت لەگەڵدا بکەم. ئێستاش وا عەسرە و دەبێ بچم بۆ مزگەوت. سبەینێ لای بەیانی، دوای خۆرکەوتن، کەمێک زوو وەرە بۆ ئێرە، چاوەڕێت دەبم. دەبێ بێیت، چونکە کارم پێتە."

"بەسەر چاو! دێم. سوپاسگوزارم. بمبوورە گەر جەسارەتێکم کردبێت، ئێوە میهرەبانن."

"تا سبەینێ، خوات لەگەڵ."

# دیسانەوە لە حزووری ماردینیدا

سەفەرگەلێک لە کۆڵانەکانیانا خەون بە تۆوە ئەبینن
لە دێیە دوورەکانا، مەلان پیرۆزبایی تۆ لە یەکدی ئەکەن.

وەک هەمیشە لە شوێنێکی تایبەتدا دانیشتبوو و چاوەڕێی هەڵاتنی خۆر و جلیوەی سیندوخت بوو. خەڵکی لە کوچەوکۆڵانەکانی شارەوە بەرەو ماڵی ئەبو جەعفەر بەڕێ کەوتبوون. دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا دەهاتە گوێ و یەکێک بە کوردی گۆرانیی دەوت. وتیان کە زەماوەندی کوڕە تاقانەکەی ئەبو جەعفەرە، کە پیاوێکی ناسراوی شارە و حەوت ڕۆژ و حەوت شەو سەما و هەڵپەڕکێ بەردەوام دەبێت.

سوهرەوەردییش بەڕێوە بوو بۆ ماڵی فەخرەدین ماردینی، بەلای ماڵی ئەبو جەعفەردا تێپەڕی و سەیری کرد ڕەشبەڵەکە و ژن و پیاو دەستیان گرتووە و هەڵدەپەڕن، بەیتبێژێکیش دەنگی لێ هەڵبڕیبوو:

چل خەم، چل خەیاڵ، چلیش وەسواسە
سێ چل چۆن دەر کەم بە یەک هەناسە*

---

* ئەم بەیتانە لە ئەسڵەکەشدا هەر بە کوردی هاتوون.

کاتێکیش گەیشتە ئەم بەیتە:
ئەگەر مەیلی تۆ فەرامۆشم بێ
سپێتیی کفن باڵاپۆشم بێ

ئیتر سوهرەوەردی خۆی پێ نەگیرا. بەدەم سەماکردنەوە، چووە ناوەڕاستی ڕەشبەڵەکەکەوە و لە نزیک دەهۆڵژەنەکەوە مێزەرەکەی لە سەری لا برد و دەستی بە سەما کرد. کەس ئەم سپیاڵپۆشەی نەدەناسی. چەند خولەکێک دواتر، شێخ ڕوکنەدین بەوێدا تێپەڕی. وەکوو ڕێزگرتنێک لەو، هەموویان هەڵپەڕکێ و سەمایان ڕاگرت، دەهۆڵژەنەکەش بە تەریقییەکەوە چووە کەنارێکەوە و بەیتبێژەکەش بێدەنگ بوو. بەڵام سوهرەوەردی بە تاقی تەنیا لەسەر سەما و گۆرانیی خۆی بەردەوام بوو و بەدەم ئاوازەوە، دەنگی لێ بەرز کردبۆوە:

ساڵەهای ساڵە، ئەو زامە پێمە
قەترەی زووخاوان شەو لەناو جێمە
ئەترسم بمرم نەگەمە مرادم
یار بێ بە حاکم، نەپرسێ دادم

خەڵکەکە، کە لە ڕووی ڕێزەوە بۆ شێخ ڕوکنەدین بێدەنگ و خامۆش بووبوون، هەموو سەیری ئەم قەلەندەرە سپیاڵپۆشەیان دەکرد، کە شەیدایانە گۆرانیی دەوت و سەمای دەکرد. ڕوکنەدین بە سەعد کاتبی وت،





کە یەکێک بوو لە یاوەرەکانی: "ئەوە سوهرەوەردییە. ئەم کابرایە دیارە شێت بووە و ئێمە نازانین. بڕۆ دەستی بگرە و بیبەرە پەنایەکەوە. پێی بڵێ تۆ لەگەڵ زاناکانی ئەم شارەدا هەڵسوکەوت دەکەیت، ئەم سەماو گۆرانیوتنە شوورەیییە بۆت."

کەمێک بێدەنگ بوو و پاشان بە ناڕەحەتییەوە وتی، "ئەم پیاوە دەبێ ئەم شارە جێ بێڵێت، ئەگینا ئابڕووی هەموومان دەبات. هەموو شتێکمان لەبارەوە بیستبوو، جگە لە بەرەڵایی و لۆتێتی، وا بە چاوی خۆمان، ئەوەشمان لێ بینی."

سەعد کاتب چوو دەستی یەحیای گرت و بردیە پەنایەکەوە. چەند کەسێک دوایان کەوتن، تا بزانن چ باسە، بەڵام سەعد بە تووڕەیییەوە وتی، "هیچ نییە، بگەڕێنەوە."

ئینجا ڕووی کردە سوهرەوەردی و پێی وت، "ئەوە چییە؟ بۆ ڕێز لە خۆت ناگریت؟ تۆ حەکیمیت و لەم شارەدا ئەهلی زانست هەموو بە چاوێکی گەورەوە سەیرت دەکەن، بۆچی وا خۆت سووک دەکەیت؟"

"چی بووە؟ چیم کردووە؟"

"تۆ بەم گۆرانی و سەماکردنە، خۆت بچووک دەکەیتەوە."

"هاوڕێ، سەر مەکەرە سەرم. من خۆم بچووک ناکەمەوە، چونکە من خۆم بچووکم! پێویستە تۆ بەو جەنابانە بڵێیت، کە ئەوان بۆچی خۆیان گەورە دەکەنەوە و هەموو شتێکیان بۆ خۆیان قۆرخ کردووە و خۆیان لە خەڵکی تر بە جیاوازتر و بە گەورەتر دەزانن. لە کاتێکدا هەر وەکوو قورئان دەڵێت، پێغەمبەری خوداش ئینسانێکە وەکوو ئینسانەکانی تر، ئەی

بە چ هەقێک ئەمانە وەکوو تاوس دەنوێنن و لووتیان وا لە ئاسمان؟ من ئەوەم کە هەم، بەڵام ئەوانە، ئەوە نین کە هەن! ڕێی خۆت بگرە و برۆ. ئەم قسانە بە گوێمدا ناچن."

سەعد کاتب، کە سەیری کرد سوهرەوەردی بێباکە و بگرە شاد و خۆشحاڵە، تەواو پەست بوو. لە کاتێکدا جێی هێشت و دوور کەوتەوە، بە توورەیییەوە پێی وت، "باشە، دەیبینیت!"

***

سوهرەوەردی بەهەڵەداوان بەرەو لای ماردینی چوو. ماردینی وەکوو ڕۆژی پێشوو بەتەنیا ئەوی بینی و پێی وت، "شەهابەدین! من وای بەباش دەزانم، بۆ ماوەیەک ئەم شارە جێ بهێڵیت. دۆستە نەزانەکانت و دوژمنە نیازخراپەکانت دەستیان خستۆتە ناو دەستی یەکەوە و هەموو جۆرە ناووناتۆرە و تۆمەتێکیان خستۆتە پاڵت. هیوادارم ئەمە ببێت بە ئەزموونێک بۆت و وەختێ چوویت بۆ شوێنێکی تر، ئاگات لە قسە و هەڵسوکەوتی خۆت بێت. خەڵکی نەزان و خراپ زۆرن و کەم نین ئەوانەی ئیرەیی بە زانایان و کەسانی هەڵکەوتوو دەبەن و گیروگرفتی بۆ دروست دەکەن. دەبێ ئاگات لە خۆت بێت. ئێستاش لەبەر ئەوەی لاویت و ناوبانگێکی باشت هەیە، لە هەرکوێیەک بیت، دەتوانیت جێ و ڕێ و پایەی تایبەت بە خۆت هەبێت. شەهابەدین، من کابرایەکی دنیادیدەم و سەرما و گەرمای ڕۆژگارم زۆر چەشتووە. لەگەڵ زانایان و گەورەپیاواندا هەڵساوم و دانیشتووم. بەرەنجامی ئەزموونەکانی خۆمت





لە دوو خاڵدا بۆ کورت دەکەمەوە، تا ببنە توێشووی ڕێگەی ژیانت: یەکەمیان، ئەوەیە تۆ بە پایەیەک گەیشتوویت لە ناوبانگدا، کە لەوانەیە میران و فەرمانڕەوایانی دەڤەرە جیاوازەکان بەدواتدا بنێرن. بەڵام ئەوە بزانە، کە ڕێزلینانی ئەوانە بۆ دانایەکی تازەهەڵکەوتوو، لەبەر خاتری خوا و خۆشەویستیی زانست نییە، بەڵکوو دەیانەوێ وەکوو ڕکابەرێک بەکاری بێنن، تا دەسەڵات و شکۆی ئەو زاناو فەقیهە ناودارانەی پێ کەم بکەنەوە، کە گەیشتوونەتە پلەیەکی باڵا لە ناوبانگدا و لەبەر ئەوەی لەناو خەڵکدا پێگەیەکی گەورەیان هەیە، خۆیان بە هاوشانی میر و فەرمانڕەواکان و بگرە بە بەرزتریش دەزانن.

"هەربۆیە وریا بە، ئەوانە ئەگەر ویستیان ڕێزت لێ بنێن، لەبەر زانستەکەت نییە. ئەوەشت لەبیر نەچێت، کە زانایانی دین، تا ئەو کاتە لایەنگری دین و برەوپێدەرین، کە پێگەی خۆیان پارێزراو بێت. بۆیە ئەگەر کەسێک بە دنیایەک زانست و زانینیشەوە بێتە مەیدان و زانا دینییەکان سوور بزانن موعجیزەشی پێیە و هەموو خەڵکی دنیا دەهێنێتە سەر ڕێی ئیمان، هەست بکەن زیان بە پێگە و پایەی ئەوان دەگەیەنێت، یەکسەر دەکەونە دژایەتی و پیلانگێڕان بەرامبەری. لەبەر ئەوە، تا دەتوانیت ئاگات لە خۆت بێت."

سوهرەوەردی کە سەری دانەواندبوو و بە دڵ گوێی بۆ قسەکانی ماردینی شل کرد بوو، سەری بەرز کردەوە و وتی، "بەسەر چاو، سەروەرم! ئەوپەڕی هەوڵ دەدەم. سبەینێش دەڕۆم و ئێرە جێ دەهێڵم. ماوەیەک دەبێت بڕیارم

داوە بچم بۆ دیمەشق. سبەینێ دەکەومە ڕێ. هیوادارم هەمیشە نزای خێرم بۆ بکەیت. منیش هەمیشە و تا لە ژیاندا بم، سوپاسگوزارتم."



# دەبێ بڕۆم

ئەبێ ئەمشەو بڕۆم
من کە لە وازترین پەنجەرەوە
لەگەڵ خەڵکی ئەم ناوچەیە دوام
قسەیەکم لە ڕەگەزی ڕۆژگارەوە نەبیست

لای عەسر، بۆ ماڵئاوایی چوو بۆ لای دۆستەکانی. کەلوپەل و نووسینەکانی کۆ کردەوە و خۆی بۆ سەفەر ئامادە کرد. هەمیشە وا بوو. دێیەدێ و شاربەشار دەڕۆیشت، پێویستی بەوە نەبوو لەگەڵ کاروانەکاندا ڕێ بکات. پارەوپوولێکی وای پێ نەبوو، لە چەتە و ڕێگر بترسێت و سیپاڵەکەی بەریشی، قرانێکی نەدەکرد.

نیازی شامی هەبوو، بەڵام بۆ بەیانی کە کەوتە ڕێ، هێشتا لە شار نەچووبووە دەرێ، کە لەپڕێکدا بڕیارەکەی گۆڕی و بەرەو وڵاتی ڕۆم ملی ڕێی گرتە بەر. ئەم جارەیان بۆ هەرکوێیەک دەچوو، هەستی دەکرد زاناکانی ئەو شوێنە بە ناوی ئاشنان. گەلێ لە میر و فەرمانڕەواکان بە هۆ و بێ هۆ ڕێز و خۆشەویستییان لە ئاستیدا پیشان دەدا. ئەو لەگەڵ هەندێ میر و شازادەی سەلجووقیی وەکوو مەلیک عیمادەدین و سلێمان پاشادا بە ڕادەیەک تێکەڵ بوو، کە چەند کتێبێکی تایبەتی بە ناوی ئەوانەوە نووسی، وەکوو کتێبی

*پرتە و نامە و الالواح العمادیة*. لەوانەیە وەکوو ئەفلاتوون لەبیری ئەوەدا بووبێت، بەجۆرێک لە جۆرەکان حیکمەت و حکوومەت پێکەوە گرێ بدات. بەڵام سەرەنجام، هیچکامیانی بە هەند وەر نەگرت و بەرەو دیاری شام گەڕایەوە.

ماوەیەک لە چەند شارێکی شامدا سەرگەردان بوو، بەڵام دواجار چووە دیمەشق. کەشوهەوای دیمەشقیش زۆر لەگەڵ ڕۆحییەتیدا نەگونجا، بۆیە دیسانەوە بە نیازی دیاربەکر و ڕۆمەوە، دیمەشقی جێ هێشتەوە. لەگەڵ ئەحمەد ئەسفەهانیی فەقێهدا، کە ماوەیەک بۆ خوێندن لە دیمەشق بوو، هەروەها چەند کەسێکی تردا، بەرەو حەڵەب کەوتنە ڕێ. لای دەروازەی دیمەشقەوە بە دێیەکدا تێپەڕین، کە ناوی *قانوون* بوو، ئەحمەد ئەسفەهانی ڕانەمەڕێکی پیشانی شەهابەدین دا و وتی، "تەماشا بکە ئەو مەڕانە چەند قەڵەون! پارەت پێیە؟"

"بۆ؟"

"ئەگەر پارەت پێیە، مەڕێک دەکڕین و عەسر سەری دەبڕین و گۆشتەکەی دەبرژێنین."

"من دە درهەمم پێیە، ئەگەر بەش دەکات، با بتدەمێ؟"

"بۆ دە درهەم؟ تۆیەک ئەو هەموو زانا و میرە موریدتن، دە درهەم لە گیرفانتدایە؟"

"هاوڕێ، گاڵتە مەکە. کام زانا و کام میر؟ خۆ ئەگەر هەموو دنیاش مورید و پەیڕەوکاری من بن، من ئەوەندەی پێم دەکرێ، هەوڵی خزمەت و پەروەردەکردنیان دەدەم، نەک بیاندۆشم."

"ئەمە چ قسەیەکە؟ تۆ هەقت بەسەریانەوە هەیە."





"ئەگەر کەسێک دەستی بە زانست و زانین ڕاگەیشتبێت، داوای هیچ شتێک ناکات لەم دنیایە و پێویستی بە هیچ نابێت. لە قورئانیشدا و لە زمانی پەیامبەرەکانەوە هاتووە کە، ئێمە بەرامبەر بە کاری خۆمان پاداشتمان ناوێ. ئەگەر زانایان پەیڕەوی لەم دەستوورە دەکەن، ئەوا دەبێ پەیامەکەیان وەکوو ئەرکی سەرشانیان بەجێ بهێنن. بەڵام ئەمە لەکوێ و پارەپەرستی و چاوچنۆکی لەکوێ؟ با واز لەمە بهێنین. ئێستا من هەر ئەوەندەم پێیە و وا بزانم دەتوانیت مەڕێکی پێ بکڕیت."

ئەحمەد دە درهەمەکەی لێ وەر گرت و چووە لای خاوەنی مەڕەکان و مەڕێکی کڕی. زۆر دوور نەکەوتبوونەوە، وەختێ کابرایەکی تورکمان هاتە لایان و وتی، "شەریکەکەم ئەم مەڕەی بە هەرزان داوە پێتان."

ئەحمەد و هاوەڵەکانی گوێیان بە قسەی ئەو کابرایە نەدا، لەبەر ئەوەی نە هیچ پارەیەکی تریان پێ بوو، نە ئامادە بوون مەڕەکەش بە دانەیەکی بچووکتر بگۆڕنەوە. بوو بە مشتومڕیان. سوهرەوەردی بە ئەحمەد و هاوەڵەکانی وت، "ئێوە بڕۆن و مەڕەکەش لەگەڵ خۆتاندا ببەن، من خۆم قەناعەتی پێ دەکەم."

کاتێ ئەحمەد و هاوەڵەکانی ڕۆیشتن، سوهرەوەردی لەگەڵ کابرادا زۆر خەریک بوو، بەڵام هەر نەیتوانی ڕازیی بکات، تا سەرەنجام پێی وت، "دە ئیتر منیش هەقم نییە بەسەرتەوە." پاشان پشتی تێ کرد و ڕۆیشت.

کابرای شوان کەوتە گومانەوە لەوەی کە شێخ بە ئەنقەست ئەمی ماتڵ کردبێت، تا هاوڕێکانی مەڕەکە ببەن،

بۆیە دوای سوهرەوەردی کەوت و پەلاماری قۆڵی چەپی دا و ڕای کێشا و وتی، "بۆ کوێ دەچیت؟"

بەڵام لەپڕێکدا سەیری کرد، قۆڵی سوهرەوەردی لە شانی بووەتەوە و خوێنی لەبەر دەڕوات. ئیتر کە ئەم دیمەنەی بینی، زەندەقی چوو و قۆڵەکەی فڕێ دایە سەر ئەرزەکە و ڕای کرد. سوهرەوەردی بەرەو لای قۆڵەکەی خۆی چوو، بە دەستی ڕاستی هەڵی گرتەوە. هاوەڵەکانی حەپەساوتر لە کابرای شوان، تەماشایان کرد، قۆڵی چووەتەوە شوێنی خۆی و مێزەرەکەشی بە بنهەگڵەوەیە.

سوهرەوەردی بە دەمارساردییەوە وتی، "وا بزانم قاییل بوو."

ئەحمەد وتی، "جا قایل نەبوایە، چیی دەکرد؟ هەموو ئەندامەکانی لەشتی لەبەریەک هەڵوەشاندایە، درهەمێکی دەست نەدەکەوت."

"مەڕەکە ببەمەوە و پارەکەی لێ وەر بگرمەوە یان بە دانەیەکی بچووکتر بیگۆڕمەوە؟"

"نەخێر، ئێمەش ئەقڵمان هەیە. کابرای شوان خۆی داوای ئەو نرخەی کرد، خۆ ئەگەر سەودا و مامەڵەم لەگەڵ بکردایە، بە کەمتریش دەیدایێ. بەڵام ئەمانە کاتێ ڕێبوارێکی سادەیان لێ هەڵدەکەوێ، ددانی چاوچنۆکییان تیژ دەبێتەوە و بەوان بێت، جلوبەرگەکەشی لەبەر داکەنن. بەڕاست پێم بڵێ، ئەو قۆڵدەرچوونەت* چی بوو؟"

"هیچ! ئەو قۆڵمی دەر هێنا و منیش خستمەوە جێی خۆی!

---

* لە گەلێ سەرچاوەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە، کە سوهرەوەردی توانایەکی پاراسایکۆلۆجیی سەیری هەبووە، کە ئەو دەمە بە "کەرامات" ناو براوە.





باش بوو قۆڵمی لەگەڵ خۆیدا نەبرد. ئەگینا کارەکەمان دەشێوا."

"سوهرەوەردی! تۆ بوونەوەرێکی سەیریت."

"هەموومان سەیرین. ئینسان خۆی بوونەوەرێکی سەیرە! ئەوەی کە بینیت، یارییەک بوو و هیچی تر."

***

عەسر مەڕەکەیان سەر بڕی و گۆشتەکەیان برژاند. ئەحمەد لە کاتێکدا دەستە برژاوەکەی مەڕەکەی بە هەردوو دەستی گرتبوو و دەیبرد بۆ دەمی، پرسیی، "ئەی سوهرەوەردی کوا؟"

ئەبولفەرەج، کە قوتابییەکی لاو بوو، وتی، "ڕۆیشت."

"بۆ کوێ؟"

"نازانم! کاتێ تۆ خەریک بوویت مەڕەکەت سەر دەبڕی، ئەو لەپڕێکدا هەستا و بە منی وت، "من دەڕۆم. دواتر سڵاو و خواحافیزیی منیان پێ بگەیەنە."

منیش لێم پرسی، "بۆ کوێ دەڕۆیت؟"

وتی، "خوا دەزانێت."

"ئەی شتێک بخۆ."

"نەخێر، تێرم. بە هیوای دیدار."

ئەمەی وت و ڕۆیشت. سەرەتا بەشێنەیی تا کەس سەرنجی ڕۆیشتنەکەی نەدات و پاشان پێی هەڵگرت و دەتوت ڕادەکات.

# دیسانەوە

وتم: لەسەر کام شۆری، وا لە وەهمی خەڵک دووری
تۆ نووری نووری نووری، یاخود هەتاوی تابان؟
وتی: دڵەکەم تەنگ بوو! جەستەشم سووکەڵە بوو!
تاوەکوو خۆم ڕزگار کەم، لە هەر چوارمێخی ئەرکان

بە بازاڕی بەعەلبەکدا تێدەپەڕی، کە لەناو دوکانێکەوە یەکێک بانگی کرد، "برا! ئا تا ئێرە وەرە."

"سڵاو."

"سڵاو لە خۆشت. فەرموو! کەمێک لێرە لامان دانیشە."

"بە چاوان! بەڵام من شێوەتان ناکەمەوە!"

"منیش ئێوە باش ناناسم، بەڵام دوێنێ لە مزگەوتی گەورەی شار بینمیت، لەگەڵ زاناکانی شاردا وتووێژت دەکرد، پێم خۆش بوو کە لە عۆدەیان دەهاتیت. بەڵام من پەلەم بوو و نەمتوانی تا کۆتایی بمێنمەوە. لەوە ناچێت عەرەب بیت؟"

"نەخێر. من خەڵکی سوهرەوەردم. شارێکە لە عەجەم، دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری هەمەدان و ڕەیەوە."

"ئەی کارت چییە؟"

"قەلەندەرێکی ئاوارەم، کە دەوراندەوری جیهان بەدوای گەوهەرێکی دەگمەندا دەگەڕێم."

"ئەی سوهرەوەردی دەناسیت؟ ئەبولفتوح، شەهابەدین؟"

"نەخێر!"

"چۆن؟ ئەی هاوشاری نیت؟"

"بەڵێ! بەڵام ئەو گەوهەرە دەگمەنەی لەپێناویدا ئاوارەی دیار و شارانم، هەر ئەو خۆناسینەیە."

"ئەی هاوار! تۆ خۆت سوهرەوەردیت!"

هەستا و باوەشی پیا کرد. زۆر خۆشحاڵ بوو و سوپاسی کرد. ئینجا لە شوێنێکی گونجاودا دای نیشاند و خۆیشی بە ڕێزەوە بەرامبەری وەستا و وتی، "من دوو ساڵە ناوتم بیستووە و دەتناسم و هەمیشە تامەزرۆی دیدارت بووم. دوو ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ موعینولدین موسڵیدا بووم، بەردەوام وەسفی ئێوەی دەکرد. نووسراوێکی ئێوەی پێ بوو، کە من بەشێکیم لێ نووسییەوە و لەماڵەوە پاراستوومە."

"کام نووسراوەم؟"

"حیکمەتولئیشراق. من خەڵکی مەعەڕەم، شارەکەی ئەبو عەلای مەعەڕی. ناوم بەدرەدین ئەبو نەجیبە. باپیرەی باوکم، کاتبی ئەبو عەلا بوو. ئەبو عەلا لە سەرەمەرگدا وەسیەتێکی باشی بۆ کردبوو. باوکم بازرگانیی دەکرد و ئەهلی زانستیش بوو. منیش بە هەمان شێوە. باری داراییمان خراپ نییە! ئەگەر لوتف بنوێنیت، پێم خۆشە ماوەیەک لە خزمەتدا بم و لە زانینەکانت بەهرەمەند ببم. پێکەوە دەچین بۆ مەعەڕە و چەند میوانداریتان بکەم، ئەوەندە زیاتر منەتبارتان دەبم."

"سوپاسی میهرەبانیتان دەکەم. ئەگەر بە زمانی بازرگانی قسەتان لەگەڵدا بکەم، ئەوا دەبێ بڵێم، کە ژیانی





من لەنێوان *حاڵ* و *قاڵ*دا دابەش بووە. ئەوەندەی پەیوەندیی بە *قاڵ*ەکەوە بێت، ئەوا دەتوانین تا بکرێ، ماوەیەک پێکەوە بین، بەڵام ئەوەندەی پەیوەندی بە *حاڵ*ەکەوە بێت، ناتوانم لەگەڵ کەسدا بەشی بکەم و نایەتە فرۆش. من ستاییشی دەست و دڵ کراوەیی و جوامێری و میوانداریی تۆ دەکەم، بەڵام من جگە لە خودا، پشتم بە کەس نەبەستووە. چەند کاژێرێک بەر لە نیوەڕوان و پاشنیوەڕوان پێکەوە دەبین. بەڵام کاتەکانی تر، دەبێ لەگەڵ خۆمدا بم."

تا مەعەڕە پێکەوە بوون و بەدرەدین هەوڵی دەدا ئەوەندەی لە توانایدایە، لە سوهرەوەردی فێر ببێت. هەموو شەوێک نووسراوێکی لێ دەسەند و لەبەری دەنووسییەوە و هەر کە دەرفەتێکیش دەرەخسا، سەبارەت بەو مەسەلانە وتووێژی لەگەڵ دەکرد. ڕۆژێکیان لە یەحیای پرسی، "ئەم ڕێسای ئیمکانی باڵاتر *ئیمکانی ئەشرەفە*[*] چییە؟"

"ئەم ڕێسایە تەنها لەسەر بنچینەی بنەماکانی ئیشراقییەکان ئەرزشی هەیە. لە سیستمی ئیشراقیدا، سەرانسەری بوون، هەقیقەتێکی پێکەوە گرێ دراوە، لە نوورولئەنوارەوە تا بەرزەخ. واتە نوورولئەنوار و ئەنوارەکانی دواتریش، هەموو سەر بە یەک جۆرن و لە یەک پۆلیشدا دادەنرێن."

"واتە، بۆ نموونە، نوورولئەنوار و بە قەولی ئێوە *نووری ئەقرەب*، کە یەکەمین دیاردەیە لە نوورولئەنوارەوە دەر

[*] چوار ئەرکان: ئاو و ئاگر و خاک و با.

[*] ئیمکانی ئەشرەف: چەمکێک و ڕێسایەکی فەلسەفییە و بەتایبەتییش لە ڕێبازی ئیشراقیدا بەکار براوە. بەپێی ئەم ڕێسایە، مادامەکی ئیمکانی بوونەوەری لاوازتر و خراپتر هەیە، کەواتە ئیمکانی بوونەوەری بەرزتر و باڵاتریش هەیە.

بچێت، هەردووکیان سەر بە یەک جۆر و یەک پۆلن؟"

"بەڵێ، نوورولئەنوار و هەموو نووره موجەڕەدەکان (ئەقڵەکان و دەروونەکان) یەک هەقیقەت و یەک پۆلن."

-ئەگەر پێویست (واتە واجب) لەناو ئەم پۆلەدا دابنرێ، ئیتر لەناو خۆیدا پێویست بە پێکهاتن ناکات؟ لەو ڕووەوە کە نوورولئەنوار و نوورەکانی تر، کاتێک دەبنە یەک هەقیقەت، بۆ جیاکاری و تایبەتمەندییان، دەبێ هەریەکەیان قابیلیەتی جیاوازیکردنی تیا بێت."

"نا، وا نییە! لەبەر ئەوەی لە ڕێبازی ئیشراقدا، گومانکردن و جیاوازیکردن لە گەوهەری بوونەوەرەکاندا قبوڵ کراوە. لەبەر ئەوە جیاکاری و تایبەتمەندییان لە ڕووی هێز و لاوازی و کەماڵ و کەموکورتییەوە، لە جیاوازیی گەوهەرییانەوە بەدەست دێت."

"ئەی تاریکی؟ واتە جیهانی تەنە ماددییەکان، کە تۆ ناوت لێ ناون تاریکی، بە نیشانە تاریکەکانیانەوە، ئەمانیش لەگەڵ ئەواندا لەناو یەک پۆلدان؟"

"نەخێر، تاریکی مەسەلەیەکی عەدەمییانە و سێبەرە، بەڵام هەر لەبەر ئەم سێبەربوونەی، بە کۆمەڵەی سیستمی بوونەوە دەبەسترێتەوە و لە *تەرتیبی صدوریدا* دادەنرێ. بە قبوڵکردنی ئەم بنەمایانە، بوونی هەر پلەیەک لە نزمی، بەڵگەی بوونێکی لەپێشینەی پلەیەکی باڵاترە، هەر ئەمەشە ڕێسای ئیمکانی باڵاتر. بەڵام ناسینی یەکێتی جیهان و پەیبردن بە پەیوەندیی وجودییانەی بوونەوەرەکانی جیهان بە یەکترەوە و هەروەها ناسینی ڕێسای ئیمکانی باڵا و بوونی جیهانی جۆراوجۆر لە قەڵەمڕەوی مەزنەدا، شتگەلێکن، کە





بە وتوویژ و مشتومڕ بەدەست نایەن، بەڵکوو پێویستییان بە زەوق و حاڵە. تا نەتوانیت خۆت لە کۆتی بەدەن ڕزگار بکەیت، پەیبردن بەم زانینانە، مەحاڵە. بەڵام کاتێ مەشقی ڕۆحیت کرد، کە بناغەکەی برسێتی و بێداری و تێڕامانی بەردەوامە و توانیت بەدەنی زەمینت وەکوو کراسێکی چڵکن لەبەری بوونی نوورانیی خۆت داماڵیت، ئەوکات ئەم شتانە دەبنە سەرەتاییترین بەڵگەنەویست لەلات."

بەدرەدین، کە هەستی بە سەفایەکی تایبەتی دەکرد لە ناخی خۆیدا، بە سوهرەوەردیی وت، "تۆ خۆت ئەمەت تاقی کردۆتەوە؟"

سوهرەوەردی، کە ناخی لە حاڵەتی شاگەشکەدا بوو، دەستی ئەوی گرت و ئاماژەی بۆ خاڵێک کرد و وتی، "تۆ توند باوەش بە مندا بکە، منیش لەو خاڵەوە قسەت لەگەڵ دەکەم."

بەدرەدین لەکاتێکدا بە هەموو هێزیەوە باوەشی بە سوهرەوەردیدا کردبوو و توند گرتبووی، کەچی سەیری کرد لەو خاڵەوەی ئاماژەی پێ دابوو، بە سەروسیمایەکی نوورانییەوە دەر کەوتبوو و دەیوت:

"من نووری نووری نوورم، یاخود هەتاوی تابان
تاوەکوو خۆم ڕزگار کرد، لە هەر چوارمێزی ئەرکان!"

# مژدەیەکی تر

بەسەر گاشەبەردەکەدا سەر کەوتم
هەر هەنگاوێک، دنیایەکی تەنیاتر، جوانتر
بانگێکم هاتە گوێ: سەرووتر، سەرووتر

لە سپێدەیەکی سازگاردا و لە کاتێکدا لەبەر خۆیەوە ورینگەی دەهات، بەرەو سارا ڕۆی، تا لە شوێنێکی گونجاوەوە لە هەڵاتنی خۆر بڕوانێ. سروەیەکی دەهات و بۆنی گوڵەباخەکانی باخچەکان هەوای ئەو ناوەیان عەتراوی کردبوو. بە قەراغی باخچەکاندا ڕۆیشت و خۆی گەیاندە سەر گردێک، کە بەسەر کێڵگەکانی گەنم و وێنجەزارەکاندا دەیڕوانی. بەرامبەر بە خۆرهەڵات دانیشت. هێشتا کەمێکی مابوو خۆر هەڵبێت. ئەو لە خۆر زیاتر شەیدای جمینی نووری ناوەوەی عەشق و میهرەبانی بوو، کە تاوێک بەر لە دەرکەوتنی خۆر، لەناو هەموو بوونەوەرەکاندا پەیدا دەبوو و ڕۆحی پێ دەبەخشین. هەموویانی دەهێنایە سەفا و جۆشوخرۆش.

چرکەساتەکان تێپەڕین و ئەویش لە چرکەساتی دەرکەوتنی خۆردا، بە ئاوازەوە ئەمەی دەچڕی:

"دروود لەو زیندووە ئاخێوەرە درەوشاوەیە. ئەی ڕووناکترین تەن و پرشنگدارترین ئەستێرە! سڵاو و

دروودی خوا لە تۆ! ئەی لە هەمووان ڕووناکتر و ئەی لە هەمووان پڕجوولەتر، کە گەڕیدەی دوای خولقێنەری خۆت و سەرگەردانی عەشقی یاریت! تۆ هورەخشیت، ئەو پڕ توانا و دەسەلاتە! ئەی بەزێنەری تاریکی! سەرکردەی جیهان، شای فریشتەکان، سەروەری ئاسمانیان! ئەی بەدیهێنەری ڕۆژی ڕووناک بە فەرمانی یەزدان، ئەی سەروەری جورمە نوورانییەکان، ئەی دانای فرەزان! ئەی جێگرەوەی نوورولئەنوار لە جیهانی تەنەکاندا، کە نوور و هێزت لەوەوەیە.

"تۆ جلیوەیەکیت لە کەماڵی ئەو و نموونەیەکیت لە شکۆ و بەڵگەی ئەویت بۆ بوونەوەران. ئەی باوکی پیرۆز، ئەی شکۆدار، ئەی بەدیهێنەری شەو و ڕۆژ و مانگ و ساڵ، خوازیارم لێت، داوا لەو بکەیت، لەو، کە ڕووناکیی بە تۆ و بە هەموو ڕووناکەکانی تر بەخشیوە، لە نوورولئەنوار، تا دڵم بە نووری پیرۆز و زانست و فەزیلەتی ئاسمان بڕازێنێتەوە و لە شەیدایانی ئەو مەعشوقی خولقێنەری ئەزەلە و لە فریو و ئافەتەکانی ئەم دەروون و بەدەنە زەمینییە بپارێزێت و لە هەردوو دنیا بەرز ڕام بگرێت."

هەنگینێ ئەستێرکێکی بینی، کە ئاوی کانیاوێکیان بۆ ئاودێری تیا کۆ دەکردەوە و قامیشەکانی دەوروبەریشی، وەختێ سروەی بایەکە لێی دەدان، دەشنانەوە. ئەم دیمەنە سەرنجی ڕاکێشا. ئەم ئەستێرکە، کاتێ تیشکی خۆرەکە لێی دەدا، بە چاوی عاشقێک دەچوو لەتاو جلیوەی مەعشوقەکەی بێقەرار بێت. پاشان نیگایەکی سەیری گژوگیا و گوڵەکانی دەوروبەری کرد. ئینجا ڕوانییە گوڵە نیلۆفەرەکان، کە هەموو





ڕێگەیەکیان بۆ هەڵکشان گرتبووە بەر، تا بە دیداری خۆر بگەن. تەزوویەکی بەتین گیانی تەنییەوە. هەست بە شکۆیەک، سەرتاپای بوونی لە خۆ گرت. پەپوولەیەکی جوانی بینی، لێی ورد بۆوە. دەتوت سیندوختە. هەستی کرد دنیا پڕ بووە لە پەپوولە و هەموو بەدەوری خۆردا دەسووڕێنەوە! خۆیشی بینی بە باڵەکانییەوە، کە لەباڵی پەپوولە دەچوون، لەگەڵ هەموو پەپوولەکانی تردا، بەدەوری خۆردا دەسووڕایەوە. ئەم فڕینە لوولپێچئاسایە بەرەو ژوور دەڕۆیی و هەموو پەپوولەیەک هەوڵی دەدا دوا نەکەوێت.

نزیک بۆوە و مەودایەکی زۆری بۆ گەیشتنە خۆر نەما، کە لەناکاودا باڵەکانی گڕیان گرت و کەوتە سەر زەوی! وەک ئەوەی لە خەونێک ڕاپەڕێت، هاتەوە سەرخۆی و قوڵپی گریان گەرووی گرت و بەرەو ساراکە چووەوە. کە بە کێڵگە و وێنجەزارەکاندا دەڕۆیی، ڕووی دەکردە گژوگیا و درەختەکان و پێی وتن، "ئەی عاشقانی ڕووناکی کە هەریەکەتان بەپێی توانا لە زەمینەوە مەوداتان گرتووە و ڕووتان لە ئاسمانە، گەرچی هەرگیز لە ڕووناکی بێبەش نین و هەمیشە دەستی نەوازشی خۆر بەسەر سەرتانەوەیە، بەڵام ئێوە چۆن بەرگەی ئەو مەودا و جوداییە دەگرن؟"

هێندە ڕۆیی، تا شەکەت بوو. لەپەنا گاشەبەردێکدا خۆی دا بەزەویدا. هەستی کرد خەریکە دەمرێت. خۆی لە دونیایەکی تردا بینییەوە. ناگەهان، شەپۆلێک ڕووناکی بەرامبەری پەیدا بوو. هەسارەی زوهرە بوو! سیندوختی بینی، کە بە هەمووی چەند هەنگاوێک لێیەوە دوور بوو.

سیندوخت دڵی دەدایەوە، "خۆراگر بە، وادەی دیدار نزیکە."

پاشان لە چاو ون بوو. وەختێ سیندوخت دیار نەما، هەموو دنیا لە بەرچاوی سوهرەوەردی تاریک بوو. بەڵام لەم تاریکییەدا هەستی دەکرد وا لە ناوجەرگەی ئۆقیانووسێکی بێکەناردا. دەتوت ئاوی ئۆقیانووسەکە، هەموو سەر زەویی گرتۆتەوە. هەستی بە تینوێتی کرد. دەمی بۆ ئاوەکە برد، بینی پێوە نا و ئەوەی سەیر بوو، هەموو ئاوەکەی خواردەوە. پاشان وەک ئەوەی بە تاقی تەنیا لە بیابانێکدا بێت. دەستێکی نادیار بەرۆکی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی. ئینجا خۆی لەلای قەڵایەکەوە بینییەوە، کە دوو فریشتە بەسەر ئاسمانی قەڵاکەوە باڵەفڕەیان بوو و کە باش ورد بۆوە، بۆی دەر کەوت ئەوە قەڵاکەی حەڵەبە و دوو فریشتەکەش، یەکێکیان سیندوختە و ئەوی تریشیان خۆیەتی. سیندوخت هانی دەدا، "بەرزتر، بەرزتر!"

ئەم جارەیان جۆشوخرۆشێکی تری هەبوو و لەبەر خۆیەوە دەیوت:

"ئەی دارزەیتوونەکانی خاکی فەلەستین
پیت و فەڕی سێبەری خۆتانم وێدەن
بەم موسافیرە تەنیایەی کە لە گەشتی
دەوروبەری شاخی *توور*ەوە دێت و
لەتاو گەرمای تەکلیم خرۆشاوە"



# سەفەر، دووبارە سەفەر

سەفەر من بەرەو کوێ ئەبا؟
لەکوێ ئاسەواری شوێنپێ بەناتەواوی ئەمێنێتەوە؟

شەهابەدین بڕیاری دا بچێت بۆ حەڵەب. بەدرەدین داوای لێ کرد، دوو ڕۆژێک سەفەرەکەی دوا بخات، تا پێکەوە بڕۆن، بەڵام ئەو وتی، "بەدرەدین! سوپاس بۆ هەموو ئەو میهرەبانییەی لەگەڵ مندا نواندت، بەڵام من حەز دەکەم بەتەنیا بڕۆم."

"بۆ؟"

"لەبەر دوو هۆ، یەکەمیان، لەبەر ئەوەی نامەوێ یەکێک ئەوەندە تێکەڵم بێت و هۆگرم بێت، ئەگەر من بە دەستی ناحەزانم شتێکم لێ هات، ئازار بەویش بگات. دووەمیشیان ئەوەیە، کە من خووم بە خەڵوەتی ساراوە گرتووە و نامەوێ ئەو تەنیایی و خەڵوەتەم لێ تێک بچێت."

"باشە، ئازادیت."

بۆ شەوێ، خواحافیزیی لە هەموو هاوڕێکانی و لە بەدرەدین و غوڵامەکەی کرد و بۆ بەیانی زوو کەوتە ڕێ، تا لە چرکەساتی خۆرکەوتندا، فریای نزاکەی بکەوێت.

***

دواجار گەیشتە حەڵەب، حەڵەبی *قەلای شەهبا*! شارێکی پڕ لە کێڵگە و باخ و مزگەوت و زانا و میری گەورە و بچووک. شارێکی بازرگانی. ئەم جارە کە چووە حەڵەب، هێندە ناوبانگی هەبوو، کە گەورەکانی شار دەیانناسی، هەم میرەکان و هەم زانا و شێخەکان، بەڵام بەپێی پێویست پێشوازیی لێ نەکرا. ڕێوڕەسمێکی وای بۆ ئەنجام نەدرا، کە وەک زانا و مامۆستایەکی هەڵکەوتوو، شایانی بێت. سوهرەوەردی بەو هەموو زانستەوەی، بنیادەمێکی نەفسنزم و ئاسایی نەبوو. هەم بیروباوەڕەکانی نائاسایی بوون و هەم ڕەفتاریشی. هەر بۆیە زانایان و میرانی شار نەیاندەویست شتێک بکەن، کە دواتر ببێتە مایەی دەردەسەری بۆیان.

***

بە هۆی فتوحاتەکانی میری بەناوبانگی کورد، سەلاحەدینی ئەیوبییەوە، کە لە هەندێ ناوچەی ئیسلامیدا خاچپەرستەکانی تێک شکاندبوو، چەند ساڵێک بوو شام ئارام بوو. شاری حەڵەبیش، کە زاهیرشای کوڕی سەلاحەدین فەرمانڕەوایی دەکرد، بە هەمان شێوە بێ گیروگرفت و هێمن بوو.

لە سەرەتاکانی سەدەی شەشەمدا، واتە نزیکەی نیوسەدە بەر لە چوونی سوهرەوەردی بۆ حەڵەب، بە فەرمانی قازیی ئەو سەردەمە، چوار کڵێسای گەورە کرابوون بە مزگەوت، کە گەورەترینیان مزگەوتێک بوو، بە ناوی *سیراجەدین*. ئەم مزگەوتە هەمان ئەو کڵێسا گەورە و کۆنەی ڕۆمانەکان بوو، کە بە گوێرەی گێڕانەوە ئایینییەکان، مەسیح و حەوارییەکان تیایدا نیشتەجێ بووبوون. لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمدا،





نوورەدین مەحمود زەنگی، کە بە *عادیل* ناسرابوو، چەند ژوور و هەیوانێکی خستە سەر و کردی بە قوتابخانە و بۆ پەیڕەویکارانی ئەبو حەنیفەی تەرخان کرد. وردەوردە ئەم قوتابخانەیە بوو بە یەکێک لە ناوەندە زانستییە گرنگەکانی حەنەفییەکان و بە ناوی قوتابخانەی *حەلاویە*وە ناسرا.

وەکوو وتمان، لەبەر هەندێ هۆ، کە پەیوەندییان بە بەرژەوەندبینییەوە هەبوو، بەپێی پێویست پێشوازی لە شێخ شەهابەدینی سوهرەوەردی نەکرا. سوهرەوەردی خۆیشی حەزی بەو ڕەسمییاتانە نەدەکرد. بەڵام لێرەدا شتێک هەیە، نابێ لەبیرمان بچێت، ئەویش ئەوەیە، کە هەرکام لە زانایانی شاریش دەیویست ئەو لاوە بەناوبانگە لای ئەو بێت. هەر بۆیە کاتێ چوو بۆ قوتابخانەی حەلاویە، بەگەرمی پێشوازییان کرد. ئەمیش ویستی ماوەیەک بەئارامی بیگوزەرێنێت، تا بتوانێ لە کەشوهەوایەکی گونجاوی وانەوتنەوەدا، مەسەلەکانی حیکمەتی ئیشراقی لەگەڵ کەسانی بەتوانادا بخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. سوهرەوەردی ژینگەی حەڵەبی لە ژینگەی هەموو ئەو شارانەی تر، کە بینیبوونی، بۆ بڵاوکردنەوەی زانست، بە گونجاوتر دەزانی. زانا و پەیڕەوکارانی مەزهەبە جیاوازەکانی ئەهلی سوننەت، بە سنگفراوانییەوە لەگەڵ یەکدا دەژیان و تا ڕادەیەک کەشوهەوای لێکۆڵینەوە و دەربڕینی بیروڕا، لە هەندێ شوێنی تر باشتر بوو، تەنانەت لە دیمەشق و لە وڵاتی ڕۆمیش. ڕەنگە ئەزموونی تێکشکانیان بەرامبەر بە مەسیحییەکان، بووبێتە مایەی کەمکردنەوەی سەختگیری و ناکۆکیی ناوخۆی ئەهلی سوننەت.

بەڵام بەرامبەر بە شیعە، هەر هەستیار بوون. لەبەر ئەوەی شکستی موسڵمانیان دەبەستەوە بە جیابوونەوەی فاتمییەکانەوە*، کە لە میسر دەسەڵاتیان گرتبووە دەست و لە هەندێ شوێنی تر بەهێز بوون و لە خیلافەتی بەغدادیش جیا بووبوونەوە. وەک چۆن سەرکەوتنەکەی سەلاحەدینی ئەیوبیشیان دەگەڕاندەوە بۆ یەکبوونی زانایانی مەزهەبەکانی ئەهلی سوونەت و فەتوای جیهای گشتی.

ئەم سیاسەتە، کاریگەریی لەسەر چارەنووسی سوهرەوەردییش هەبوو. حەڵەب دوامەنزڵی سەرگەردانییەکانی ئەم قەلەندەرە بوو و هەر لێرە بوو، کە سەرەنجام بووە *شوێنپێی ناتەواو.*

* فاتمییەکان: یەکێکە لە دەوڵەتەکانی خیلافەتی ئیسلامی ٩٠٩ – ١١٧١، کە مەزهەبی ڕەسمییان شیعەی ئیسماعیلی بوو. لە سەردەمی عەباسییەکاندا، کەوتنە جموجووڵ و سەرەتا لە مەغریب دەوڵەتی فاتمییان دامەزراند و دواتر پەلوپۆیان بۆ هەموو باکووری ئەفەریقا و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کێشا و زۆر ناوچەیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.



# ئەم پەرجووە

من پێم وتن:
هەتاوێ وا لە بەردەرگاتانا
گەر دەرگاکە بکەنەوە
ڕەفتارتان ڕووناک دەکاتەوە

شێخ شەریف ئیفتیخارەدین، ڕابەر و سەرۆکی قوتابخانەی حەلاویە بوو. سوهرەوەردی هەر لە سەرەتای چوونیەوە بۆ ئەم قوتابخانەیە و بە مەبەستی ڕێزگرتن لەم ڕابەرە گەورەیەی حەنەفییەکان، لە کۆڕی وانەوتنەوەکانیدا ئامادە دەبوو و لەگەڵ خۆی و قوتابییە دیارەکانیدا دەکەوتە وتووێژ و گفتوگۆ.

ڕۆژێکیان ئیفتتیخارەدین پەیامێکی پێ گەیشت، کە ئەمشەو دوای نوێژی شێوان و خەوتنان، نێردراوی شازاهیر دێت بۆ لای. هەر بۆیە ئەویش دوای نوێژی خەوتنان، بەپەلە گەڕایەوە بۆماڵەوە و چاوەڕێی نێردراوەکەی کرد. پاش ماوەیەکی کەم، ئەبو حەفسی حەمەوی، کە کاتبی تایبەتی و بەرپرسی کتێبخانەکەی شا بوو، هات بۆ ماڵیان.

شێخ وتی، "من لەخزمەتتدام. فەرمایش بە چییە؟"

"ڕاستییەکەی، مەبەست لەم زەحمەتدانەتان ئەوەیە، کە عەجەمێکی بێگانە ماوەیەکە هاتۆتە حەڵەب و دەڵێن گوایە

لە حەلاویە و لە حزووری جەنابتاندا خەریکی خوێندن و لێکۆڵینەوەیە. لە ناوشار کۆمەڵێک قسەی سەیر و سەمەرە دەربارەی دەکەن. بەم دواییە شا دەربارەی ئەو لەم و لەو دەپرسێت و هەریەکە شتێک دەڵێت: یەکێک دەڵێت عارفێکی کامڵە، یەکێکی تر دەڵێت، فەیلەسووفێکی باڵادەستە و حەریفی ئیبن سینا و فارابییە. یەکێکی تر دەڵێت کابرایەکی جادووگەر و فێڵبازە. هەروەها هەیە دەڵێت، بێباوەڕ و کافرە و هەشە دەڵێت وەلییە. شا دەیەوێ لەم بارەیەوە وەکوو مامۆستایەک بۆچوونی ئێوە بزانێت."

ئیفتخارەدین، کە نوقمی تێفکرین بووبوو و بە ڕێزەوە و بەوردی گوێی بۆ قسەکانی ئەبو حەفس شل کردبوو، بە کەمێک نیگەرانی و دوودڵییەوە وەڵامی دایەوە و وتی، "جگە لە خوا، کەس نازانێ ناخی ئادەمیزاد چیی تیایە، بەڵام من بەم جۆرە سوهرەوەردی دەناسم: پیاوێکە لە وڵاتی عەجەمەوە هاتووە، لە کوردستانەوە، لە شارێکەوە، کە ناوی سوهرەوەردە و هەر لە سەرەتای لاوییەوە، شارەکەی خۆی جێ هێشتووە و بەدوای زانستدا وێڵ بووە و بۆ ئەم مەبەستەش، بۆ گەلێ شوێن چووە، لە ئەسفەهان و مەراغەوە، بگرە تا وڵاتی ڕۆم و شام. بۆ هەرکوێیەکیش چوویێت، جگە لە زانایان و شێخەکان، تێکەڵ بە خەڵکی تر نەبووە. دەڵێن لە گەلێ شوێن بووەتە جێبایەخی فەرمانڕەوایان، بەڵام ئەم خۆی لەوان دوور خستۆتەوە. ئێستاش شەو و ڕۆژ خەریکی خوێندن و خوێندنەوە و توێژینەوەیە. هەندێ حاڵەت و دنیای تایبەت بە خۆیشی هەیە، کە بووەتە هۆی ئەوەی خورافە و ئەفسانەی بخەنە





پاڵ، من لەم بارەیەوە هیچ نازانم. هەروەها لەبارەی حیکمەتەوە، بیروبۆچوونی خۆی هەیە و لافی ئەوە لێدەدات، کە ئەو بیروبۆچوونانەی لە حیکمەتی ئیشراقەوە بەدەست هێناوە و بەسەر بیروباوەڕەکانی هەندێ حەکیمی گەورەی وەکوو ئیبن سینا و فارابیدا پەسەندی دەکات. من خۆم دەست لەو شتانەی وەر نادەم، منیش وەکوو خەڵکێک شتی ترم لەبارەیەوە بیستووە، بەڵام بە هەند وەرم نەگرتووە. ئەوەی بەلای منەوە گرنگە، بلیمەتی و هەڵکەوتوویی ئەم لاوەیە، کە بە ڕای من، دەبێ ئاگامان لێی بێت و نەفەوتێ و خوانەکردە نەکەوێتە ژێر کاریگەریی کەسانی ناشایستەوە. من لەمە زیاتر، هیچی دی نازانم. سڵاو و ڕێز و نزام بە جەنابی حەزرەتی زاهیرشا بگەیەنە. هەر زانیارییەکی تازەشم لەم بارەیەوە دەست کەوت، بێگومان دەگاتە خزمەتیان."

ئەبو حەفس، دوای تەوقە و عوزرخوایی، ماڵی ئیفتخارەدینی جێ هێشت.

ماوەیەک دوای ئەوە و لە یەکێک لە ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزاندا، ئەبو حەفس پەیامێکی لەلایەن سەرۆکی دیوانی زاهیرشاوە پێ گەیشت، کە پەیوەندی بکات بە ئیفتخارەدینەوە و داوای لێ بکات دوای نوێژی شێوان، لەگەڵ سوهرەوەردیدا بچن بۆ ئەوێ و لەوێ بەربانگ بکەن. ئیفتخارەدین هەواڵەکەی بە سوهرەوەردی گەیاند و داوای لێ کرد سبەینێ بچێت بۆ حەمام و بەر لە بانگی شێوان، بچێت بۆ ماڵی ئەوان، چونکە هەندێ قسەیان هەیە پێکەوە بیکەن، پاشان پێکەوە دەچن بۆ حەلاویە و لەوێشەوە بۆ دەربار.

سوهرەوەردی لە کاتی خۆیدا گەیشتە لای شێخ ئیفتخارەدین. شێخ پێی وت، "ئەمە دەرفەتێکی زۆر گرنگە بۆ تۆ و لەوانەیە شا بیەوێ لەناو کۆڕی ئامادەبووانیدا قسەت لەگەڵ بکات، بۆیە تۆش دەبێ زۆر ئاگات لە هەڵسوکەوت و قسەکانی خۆت بێت. دەزانیت دەربارەی تۆ شتی زۆر وتراون. زاهیرشا نەک هەر لە ڕێی زانایانی حەلەبەوە، بگرە لە وڵاتانی تریشەوە شتی سەبارەت بە تۆ بیستووە. لەبەر ئەوە، تا دەتوانیت ئاگات لە ڕەفتار و لە قسەکانت بێت. جگە لەوە، ئەم کۆڕە کۆڕی کەسانی تایبەتە. بەتەنها زانایانی گەورە و بەناوبانگی شار بۆ ئەم کۆڕە بانگهێشت کراون. بانگکردنی تۆش، واتە بەم تەمەنە کەمەوە، خراویتەتە ڕیزی زانایانی گەورەوە. بەڵام دەبێ تەواو خاکی بیت و لە سەروو زانایانی شارەوە دانەنیشیت و لە قسەکردندا بێباک نەبیت و لەخۆباییبوون پیشان نەدەیت و تا ڕووی پرسیارت لێ نەکەن، هەر لەخۆتەوە سەری قسە نەکەیتەوە و ڕێز لە شکۆی شا و زانایان بگریت. هەروەها من و تۆ لەشولارمان وەکوو یەکە و جلمان بۆ یەکتر دەبێت. من کەوا و مێزەری زیادەم هەیە. ئەم فەرەنجی و مێزەرەی سەرت بۆ بۆنەی ڕەسمی شاهانە و زانایانی بەناوبانگ گونجاو نییە. بڕۆ بۆ ئەو ژوورە، چەند جبە و مێزەرێکی لێیە. بە زەوقی خۆت یەکێکیان هەڵبژێرە و لەبەری بکە، تا بڕۆین."

سوهرەوەردی، کە بە دڵ و بە گیان گوێی بۆ قسەکانی ئیفتیخارەدین شل کردبوو، بە زەردەخەنەیەکەوە وتی، "مامۆستای گەورە! تکایە ڕێم بدەن خۆم بم، وەک ئەوەی کە هەم، بە بیرکردنەوە و بە جلوبەرگ و پۆشاکی خۆمەوە.





سەروەرم! نیگەران مەبە. من بە وڵاتانی تردا گەڕاوم و لە کۆڕ و کۆبوونەوەی میر و زانایاندا بەشدار بووم. ڕێوڕەسمی ئەو کۆڕانە دەزانم، گەرچی هەمیشە ئەو ڕێوڕەسمانەم بە بۆنەیەک بۆ خۆنواندن و بە بێمانا زانیوە. گەورەم! من لەبەر گەلێ هۆ حەز بەم جۆرە دیدارانە ناکەم و پێم خۆش نییە تێکەڵ بە میران و لێپرسراوان ببم. ئێستاش زیاتر لەبەر دڵی جەنابت، نەک شا، دێم بۆ ئەوێ، بەڵام بەم جلوبەرگەی خۆمەوە."

"شەهابەدین! من لەبەر تۆمە، ئەگینا بۆ من وەکوو یەک وایە. تۆ خۆت ئازادیت. هەر بەم جلانەی خۆتەوە وەرە. بەڵام دەبێ لە جێیەکدا دانیشیت، کە زۆر جێی سەرنج نەبێت."

"بەسەر چاو. من دەمەوێ بەم جۆرە دەرسێک بەو خافڵانەش بدەم، گەر بە قسەش نەبێت، بە ڕەفتار. سەروەرم، ئەوانە لە غەفڵەتی قووڵدان و بەتەنها دوای نەفس و چاوچنۆکیی خۆیان کەوتوون. بەڵام من، نە پلەوپایەم دەوێت و نە ماڵی دونیا. تاقە مەبەستی من ئەوەیە، کە پێیان بڵێم:

"هەتاوێ وا لە بەردەرگاتانا
"گەر دەرگاکە بکەنەوە
ڕەفتارتان ڕووناک دەکاتەوە!"

ئیفتیخارەدین، کە ئەنجامی گفتوگۆکەیانی زۆر بەدڵ نەبوو، وتی، "تۆ ئازادیت. با بڕۆین، درەنگە."

# ئایەتە دێرینەکان

کەسێ هات، کە نووری سپێدەی مەزەبەکان
لە ناوەڕاستی قۆپچەکانی کراسەکەیدا بوو.
لە وشکەگیای ئایەتە کۆنەکان
پەنجەرەی دەچنی

سوهرەوەردی بە فەرەنجییەکەی بەریەوە و بە قژی بژ و ئاڵۆسکاویەوە و بە فۆتەکەی سەریەوە و پێتاوی کۆن و پێی بێگۆڕەوییەوە، لەپشتی ئیفتخارەدین و لەگەڵ زانایانی شاردا، لە دەرگای سەرەکیی کۆشکەوە چوونە ژوورەوە. یەکێک لە پاسەوانەکانی دەربار، کە پێشوازیی لە میوانەکان دەکرد، بەپەلە بەرەو ڕووی سوهرەوەردی چوو و وتی، "کابرا! تۆ بۆ کوێ دەچیت؟"

بەر لەوەی سوهرەوەردی خۆی قسە بکات، ئیفتیخارەدین و هاوەڵەکانی تێیان گەیاند، کە ئەویش یەکێکە لە میوانە بانگهێشتکراوەکان. کاتێکیش چوونە ناو هۆڵی پێشوازیکردن لە میوانانەوە، یەکێک لە پیاوانی دەربار بە دەنگێکی نزم بە ئیفتیخارەدینی وت، "غوڵامەکان دەبێ لە دەرەوە بمێننەوە. جا بەڵکوو بفەرموون و بە غوڵامەکەتان بڵێن، با لە دەرەوە چاوەڕێ بکات."

ئیفتیخارەدین، کە تۆزێک نارەحەت بووبوو، وتی،

"بەهەڵەدا چوویت. ئەوە شەهابەدینی سوهرەوەردییە، میوانی شایە!"

"ئا... ببەخشن، نەمناسیەوە. بفەرموون."

میوانەکان، کە هەموو لە زانا گەورەکانی شار بوون، چوونە ژوورەوە و لەسەر سفرەی بەربانگ دانیشتن. پاش ئەوەی بەربانگ کرا، سەرکاری تایبەتی شا هات، هەموو لە ڕووی ڕێزەوە لەبەری هەڵسان. ئەویش پێیانی ڕاگەیاند، کە کەمێکی تر شا ئامادەی کۆڕەکە دەبێت.

سەرەنجام، کاتی هاتنی شا هات و زاهیرشا، کە لاوێکی شازدە-هەڤدە ساڵان بوو، بە جلوبەرگی فەرمی و خزمەتکار و ڕێوڕەسمی تایبەتەوە خۆی کرد بە ژووردا. بە سەنگینییەوە بەناو ڕیزی زاناکاندا ڕۆیشت و لە شوێنی تایبەت بە خۆی دانیشت. یاوەرەکانیشی، هەریەکەیان لە شوێنی خۆیان دانیشتن و هەروەها زاناکانیش.

سوهرەوەردی بە بێباکییەوە سەیری ئەم دیمەنی گاڵتەجاڕییەی دەکرد، بەڵام زۆر ئاگای لە هەڵسوکەوتی خۆی بوو. شەریف ئیفتیخارەدین، دوای ئەوەی مۆڵەتی لە شا خواست، هەستا و چووە شوێنی تایبەت بە وتارخوێندنەوە و وتارێکی پڕ لە سەنا و ستایشی سەلاحەدین و زاهیرشای کوڕی خوێندەوە.

دەربانی تایبەتی شا، دلۆڤانیی شای بۆ زانایان خستە ڕوو و شا بە ڕێوڕەسمێکی تایبەتی کۆڕەکەی جێ هێشت.

وەختێ زاناکان بۆ نوێژی شێوان و بەجێهێنانی ڕێوڕەسمی شەوانی ڕەمەزان و خوێندنی *تەراویح* هەستان تا ئەوێ جێ بهێڵن، ئەبو حەفسی حەمەوی، کە بەرپرسی





کتێبخانەی شا بوو، هاتە ژوورەوە و چووە لای سوهرەوەردی و شتێکی پێ وت. دواتر سوهرەوەردی خۆی گەیاندە شەریف ئیفتیخارەدین و بەسووکی پێی وت، "ئەبو حەفس دەڵێ تۆ بمێنەرەوە، کارم پێتە. لەبەر ئەوە، بە یارمەتیی جەنابت، من دەمێنمەوە."

ئیفتیخارەدین، کە تۆزێک نیگەران و ناڕازی هاتە بەرچاو، وتی، "باشە، بمێنەرەوە، بەڵام ئاگات لە خۆت بێت." هەموو ڕۆیشتن. ئەبو حەفس سوهرەوەردیی برد بۆ کتێبخانەکە و ژوورێکی تەنیشت کتێبخانەکەی پیشان دا، تا ئەو شەوە لەوێ بەسەر ببات و بۆ سبەی بەیانی بچێتە حزووری شا.

ئەو شەوە تا بەیانی حاڵەت و کەشێکی تایبەتیی هەبوو. دڵی پێی وتبوو، کە ڕۆژبەڕۆژ لە ئاکام و دوامەنزڵی نزیک و نزیکتر دەبێتەوە. لە دڵی خۆیدا وتی، "مەودای نێوان کۆشک و قەڵا زۆر نییە،" هەر وەکوو لە خەونیشدا بینیبووی، قەڵا ئەو جێیەیە، کە لێوەی دەفڕێت، لەوێوە لەگەڵ سیندوختدا دەفڕێت. بەڵام بەر لەوە، پەیامێکی هەیە، ئەویش ئەوەیە، کە دڵی مرۆڤەکان، ئیدی سەر بە هەر دین و میللەتێک بن، بە نوور و ڕووناکیی ئاشنا بکات. بەشێک لە ڕێنماییەکانی پیران و حەکیمەکانی دێرین زیندوو بکاتەوە و ڕۆچنەیەک لە زەوییەوە ڕووەو ئاسمان و لە دەرەوە بۆ ناوەوە و لە شێوەوە بۆ مانا بکاتەوە. پاشان، بەرەو جێگە شکۆدارەکەی خۆی بگەڕێتەوە، کە چەندین جار لە دیناو (موکاشەفە)ەکانیدا بینیویەتی. ئەو شەوەی بە خەمێکی قەشەنگەوە بەسەر برد. هێندەی هزر و خەیاڵی لای قەڵاکە بوو، لای کۆشکەکە نەبوو. بۆچی؟ خۆیشی نەیدەزانی بۆ.

لەبەر خۆیەوە هەندێ لەو شیعرانەی دەوتەوە، کە خۆی نووسیبوونی:

من نامە چەشەی کرمەکان
لەبەرئەوەی بەم دوو چاوەم
لەودیو ئەستێرەکانەوە
جێگە و ڕێگەی خۆم بینیوە.

***

لە چرکەساتی خۆرکەوتندا چووە هەیوانەکە، کە ڕووی لە خۆرهەڵات بوو و لە کاتێکدا چاوی بڕیبووە خۆر، لەسەر لای ڕاستی ڕاکشا و ئانیشکی خستە سەر زەوییەکە و سەری خستە سەر دەستی و نوقمی حاڵەتێکی بێئاگایی بوو.

ئینجا هرمسی بینی، کە لە پەرستگەی ڕووناکیدا، ڕووی کردۆتە خۆر و نزا دەکات. ئەمیش دەستی نزای بەرز کردەوە، "ئەی باوک! لە بەدی دوورم بخەرەوە!"

گوێی لە دەنگێک بوو وتی، "داوی ڕووناکی بگرە و بەرەو باڵا وەرە!"

ئیدی هێندە بەرەو باڵا ڕۆیشت، تا زەوی و ئاسمانی لەژێر پێی خۆیدا بینییەوە.

ئەبو حەفس بۆ سۆراخی سوهرەوەردی چوو و سەیری کرد لە کتێبخانەکە نییە.

خزمەتکارەکە پێی وت، "من کە هاتم، لە هەیوانەکە بوو و خەوێکی قووڵی لێ کەوتبوو."

ئەبو حەفس وتی، "برۆ خەبەری بکەرەوە! کارم پێیەتی."



## تۆ میریت، نەك من

چیت هەیە لەگەڵ خۆتا وا ڕوخسارت
وەکوو لووتکەی تەماوی مەحو و خەونینە
تۆ لە پەرستگەکانی خۆرهەڵات مەزنتری
هەنووکە شکۆی تۆ و سەرسامیی من، قابیلی بینینە

سوهرەوەردی گەڕایەوە بۆ کتێبخانەکە. ئەبو حەفس بە میهرەبانییەوە چووە لای و سەروڕیشی ماچ کرد و بردیە لاوە و پێی وت، "نانی بەیانیت خوارد؟ کتێبەکانت بینی؟"

"کتێبەکانم نەبینیوە. سندوقەکان داخرابوون و کەسیش هیچی پێ نەوتم. منیان بۆ ژوورێک برد و ئیتر هەر لەوێ مامەوە."

"گرنگ نییە. دواتر دەیانبینیت. ئێستا پێم وتوون دەرگاکان دابخەن و کەس بۆ ئێرە نەیەت. ئەمەوێ نهێنییەکت لا بدرکێنم و ئەویش ئەوەیە، کە جەنابی شا، دوای بەرچای، دەیەوێ بتبینێت. ئەو دەیەوێ بەتایبەتی بۆ ماوەی کاژێرێک لەگەڵتدا بێت و لە نزیکەوە بە بیروبۆچوونەکانت ئاشنا بێت. لەو بوخچەیەدا کە وا لەسەر ئەو سندوقە جلێکی کەشخە و گرانبەهای تیایە، کە شا خۆی بۆی ناردوویت. ئەو جلانە لەبەر بکە، تا دەچم هەواڵ بە شا دەدەم و لە کاتی گونجاودا دەتبەم بۆ لای. من زوو دەگەڕێمەوە بۆ ئێرە.

تۆ هەر لێرە چاوەڕێم بکە. بریا حەمامێکیشت دەکرد، بەڵام تازە درەنگە. وەلێ دەبێ جلەکان لەبەر بکەیت. تا دێمەوە، کەمێک سەروڕیشیشت شانە بکە."

هێشتا ئەبو حەفس چەند هەنگاوێکی نەنابوو، کە سەیری کرد ئەبولعەباسی خزمەتگوزار بەهەڵەداوان بەرەو ڕووی دێت، تا پێی بڵێت میر لە کۆشکەکەی ناوەڕاستدا چاوەڕێی خۆی و میوانەکەیەتی. ئەبو حەفس گەڕایەوە بۆ کتێبخانەکە. بە سوهرەوەردیی وت، "خێرا بکە، میر چاوەڕێمانە."

"من ئامادەم، با بڕۆین."

"ئەی جلەکان؟ جلەکانت بگۆڕە."

"دوایی، ئێستا با بڕۆین."

"ئاخر وا نابێت!"

"بۆچی نابێت؟ میر منی دەوێت، نەک جلەکانم. منیش ئەمەم کە هەم. بهێڵن با خۆم بم. هەرچۆنێک هەم. دەتانەوێ بمرازێننەوە؟"

"شەهابەدین، وەختی چەندوچۆن نییە. خێرا بکە و بڕۆ جلەکانت بگۆڕە."

"من هەر بەم جلانەی خۆمەوە دێم. ئەگەر نا، وازم لێ بێنن با بڕۆمەوە. هاوڕێکانم لە حەلاویە چاوەڕێمن."

سەرەنجام، هەر وا ڕۆیشتن. سوهرەوەردی لە حەوشەی کۆشکەکەی ناوەڕاستدا وەستا. ئەبو حەفس چوو بۆ لای میر، تا مۆڵەتی چوونەژوورەوەی لێ وەر گرێت. ڕەنگە سەبارەت بە جلوبەرگ و سەروسیما و حاڵی سوهرەوەردییش شتێکی پێ بڵێت. ئەوەندەی پێ نەچوو، گەڕایەوە و دەستی





سوهرەوەردیی گرت و بە نیگەرانییەوە پێی وت، "ئاگادار بە، با لە بەردەمی میردا بچووک نەنوێنیت. وەک ئەوەی جلەکانت نەگۆڕی، هیچ نەبێت، ئاگات لە هەڵسوکەوت و لە قسەکانت بێت!"

کاتێ چوونە ژوورەوە بۆ لای میر، شەهابەدین سەری دانەنەواند. هەر سڵاوێکی کرد و هیچی تر. میر کە جلەکانی وەکوو ئەوەی دوێنێ شەو فەرمی نەبوو، بە سەری وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە. سەرکاری تایبەتی میر لە دوورییەکی گونجاو لە میرەوە، جێیەکی بۆ سوهرەوەردی دیاری کرد و ئەویش چوو و بەبێ ئەوەی مۆڵەتی دانیشتن لە میر وەر بگرێت، لەوێ دانیشت.

میر بە سەرکاری وت، "ڕەمەزانە و پێویستمان بە هیچ نییە. دەتوانن بڕۆن!" ئەبو حەفس و سەرکارەکە، دوای نوشتانەوە، ڕۆیشتن.

ئەمیر ڕووی کردە سوهرەوەردی و وتی، "هیوادارم باش بیت و سەرگەرمی خوێندن و لێکۆڵینەوەکانی خۆت بیت. من ماوەیەکە لە زمانی کەسانی جیاوازەوە، هەندێ شتم سەبارەت بە تۆ بیستووە. حەزم کرد کەمێک پێکەوە قسە بکەین. فەرموو، دەتوانیت بێیتە نزیکترەوە. سوهرەوەردی هەستا و چووە نزیکترەوە." زاهیرشای لاو ئەم جارەیان بە زەردەخەنەوە و بە گەرموگوڕییەکی تایبەتییەوە و بە زمانێکی سادە، نەک فەرمی، دەستی بە قسە کرد، "من دەربارەی تۆ و بیروبۆچوون و ئەو زانستانەی لێیان بەئاگایت، شتێکی ئەوتۆ نازانم، بەڵام زۆرم پێ خۆشە کە بیزانم. ئەمڕۆ پێشوازی لە کەس ناکەم و تا ئەو کاتەی

حەز دەکەیت، پێکەوە دەبین. دەمەوێ دەرفەتەکە لەدەست نەدەیت. حەز دەکەم تۆ چەندت لە توانادایە، سەبارەت بەو زانست و زانینانە بۆم بدوێیت."

"من ئێستا هیچم بۆ وتن پێ نییە. ئەمە دەرفەتێکە، بۆ ئەوەی ئێمە ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ یەکتردا تاقی بکەینەوە، ئەگەر لەم تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتوو بووین، ئەوا هەندێ شت باس دەکەین، گەر نا، ئەوا گفتوگۆکانمان بێوەر دەبن."

"یانی چی؟"

"تەماشا بکە، میر! نەریتێکی خراپ لە مێژوو و کولتووری ئادەمیزاددا هەیە و سەرچاوەکەشی جەهل و چاوچنۆکییە. ئەم نەریتەش، بریتییە لە دابەشکردنی مرۆڤەکان بەسەر چینی نزم و چینی بەرز و خانەداندا. واتە ئەوەی کە ئەو دێهاتییە جووتیارە، کەسێکی نزم و بێنرخە و فلانە حاکم و لێپرسراو یان زانا، کەسێکی خانەدان و شکۆمەندە. لە کاتێکدا پەیامبەر خۆی وتوویەتی، کە مرۆڤەکان هەموو ڕۆڵەی ئادەمن و ئادەمیش لە خاکە و خەڵکی هەموو وەکوو ددانەکانی شانە، یەکسانن بەیەک."

"ئەی ئەو تایبەتمەندییەی تەقوا و زانستە، کە لە قورئاندا هاتووە، دەربارەی ئەوە دەڵێیت چی؟"

"ئەو تایبەتمەندییە پەیوەندیی بە کامڵبوونی تاکەکەس خۆیەوە و پلەی نزیکبوونەوەی بە خواوە هەیە و هیچ پەیوەندییەکی بە دابەشکردنی کۆمەڵگەوە نییە بۆ کەسانی نزم و خانەدان."

ئینجا زۆر لەسەرخۆ و بە ئارامییەوە وتی، "میر، دەمەوێ





چەند شتێک بڵێم و لە دەرفەتێکی تردا خواستەکەت بەجێ دەهێنم. یەکەم شت ئەوەیە، کە وەختێ کەسێک دەبێت بە میری وڵاتێک، کاتێک بە هەق پێی دەوترێ میر، کە سێ شت زۆر بەهەند وەر بگرێت:

"یەکەمیان، کەسێتی و پایە و ڕێزی مرۆڤەکانە. مرۆڤ خەلیفەی خوایە و باڵاترین خولقاوی ئەوە، سوجدەی فریشتەکانیش بۆ ئادەم، ڕەمزی ئەو ڕێزەیە. وەک چۆن دەرکردن و بەنەفرەتکردنی ئەبەدیی شەیتانیش نیشانەی پشتیوانیکردنی خوایە لە مرۆڤ و ڕێز و پێگەی. هەر بۆیە مرۆڤ شایانی ئەوەیە ژیانێکی سەربەرزانە بژی و جگە لە خوا، سەر بۆ کەس دانەنەوێنێت. لەبەر ئەوە، پێویستە وریا بیت و لەسەر ئەو نەریتە هەڵەیەی میرە دیکتاتۆرەکان نەڕۆیت، کە خۆیان بە خوا دەزانن و خەڵکیش بە کۆیلەی خۆیان و ناچاریان دەکەن ستاییشی بکەن. وا دەزانن بەوە گەورە دەبن. بەڵام نا، ئەوە هەرگیز نابێتە مایەی گەورەیی، چونکە هەموو کەسێکی ئاوەزمەند دەزانێ ئەو کەسەی کڕیاری ستاییش و مەراییییە، مرۆڤێکی خۆپەرستە و پڕە لە گرێی خۆبەکەمزانین. دەستماچکردن و کڕنووشی خەڵک بۆت، هیچ لە تۆ زیاد ناکات، بگرە ئەوە دەبێتە نیشانەیەک بۆ بچووکی و جەهلی تۆ، کە بە سووککردنی خەڵک، خۆت بە گەورە بزانیت.

"دووەم شت، ئەوەیە کە هەموو میر و زانایەک دەبێ بیر لە پاراستن و پشتیوانیکردن لە خەڵک بکاتەوە، نەک پاراستن و پشتیوانیکردن لە خوا! چونکە خوا پێویستیی بە پشتیوانیی کەس نییە و لە هیچی کەم نییە. بەڵکوو ئەوە خەڵک و

ئادەمیزادەکانن، کە پێویستییان بە میهرەبانی و پشتیوانییە. لەبەر ئەوە، نابێ بە بیانووی بەرگریکردن لە خوا و دینەوە، ستەم لە خەڵک بکەیت، یان بە بیانووی جیهاد و زەکاتەوە، دەست بەسەر ڕۆح و سەر وماڵی خەڵکیدا بگریت.

"سێیەم شت، ئەوەیە کە پێی دەوترێ بەیتولمال. عومەر ڕۆژێکیان لە سەلمانی پرسی، من خەلیفەیەکی ڕاستەقینەم یان نا؟ سەلمان لە وەڵامدا وتی، ئەگەر بە ناهەق درهەمێک لە خەڵک وەر نەگریت و بە ناهەقیش درهەمێک خەرج نەکەیت، ئەوا خەلیفەیەکی ڕاستەقینەیت، ئەگینا نەخێر."

سوهرەوەردی، کە قورگی پڕ بووبوو لە گریان، ئیدی هیچی تری پێ نەوترا. میر حەپەسابوو بەدیار سوهرەوەردییەوە و ئەو قسانەیەوە، کە لە دەمی کەسی تری نەبیستبوون. بۆیە توند باوەشی پیا کرد و وتی، "سوهرەوەردی! تۆ میریت، نەک من!"



# دڵ بە دونیا نادەم، دەنا...

سیپاڵم لە هەتاوە، لام گەوهەرە و لەعلی ئاڵ
سیپاڵی دیم بۆچییت، چ خووری بێت یاخود شاڵ؟

سوهرەوەردی، بۆ نوێژ و هەروەها بۆ بینینی ئیفتیخارەدین، بۆ مزگەوتەکە چووبوو. دوای نوێژ، ئیفتیخارەدین هەڵیکی قۆستەوە و پرسیاری ماجەرای دوێنێ شەوی لێ کرد، "بێگومان خۆش بوو! ئەبو حەفس پیاوێکی گەورەیە. کاری چیی پێت بوو؟"

"میر کاری پێم بوو."

"میر!"

"بەڵێ! بە فەرمانی ئەو، منیان هێشتبۆوە؛ بۆ بەیانییەکەی، کاژێرێک پێکەوە بووین، بەڵام هەڵبەتە حەز ناکات هەموو خەڵکیش بەمە بزانن."

"باشە، کەواتە لای کەس باسی مەکە."

"نەخێر، وا هەر لای ئێوە باسم کرد، لەبەر ئەوی مامۆستای منن و بە من بێگانە نین و چاکەی منتان دەوێت."

"ئەی میر چیی وت؟"

"هەندێ شتی لێ پرسیم، بەڵام ماوەکە کەم بوو. ڕەنگە جارێکی تر بانگم بکاتەوە."

"زۆر چاکە، عەسر لە حوجرەکە بە، کارم پێتە."

"بە چاوان، سەروەرم."

هەر وەکوو مامۆستا فەرمووی، سوهرەوەردی لە حوجرەکەیدا چاوەڕێی بوو، کاتێ کوڕەکەی مامۆستا خۆی کرد بە ژووردا و دوای سڵاو، بوخچەیەکی لای سوهرەوەردییەوە دانا. بوخچەکەی کردەوە و جلەکانی ناوی دەر هێنا و وتی، "جەنابی باوکم، کە ئێوەی زۆر خۆش دەوێت، پاش سڵاو، فەرمووی پێتان بڵێم ئێوە چیی دی ئەو سوهرەوەردییەی پێشوو نین، کە بە فەرەنجییەک و دارعەسایەکەوە بێن و بچن. ئێستا ئێوە زانایەکی ناسراو و کەسێتیەکن، جێبایەخی میر زاهیرشان و جەنابیشیان بە ڕادەیەک لای سەلاحەدینی باوکیان خۆشەویستن، کە ئەگەر ئەم بڵێ ماست ڕەشە، جەنابیشتان دەڵێن ڕەشە. هەر بۆیە بەم زووانە لە تەواوی شام و سەرانسەری مەملەکەتدا، ئێوە وەکوو سەروەرێک دەبن. لەبەر ئەوە، پێویستە سەروسیما و ڕواڵەتی خۆتان ڕەچاو بکەن. ئەم کراسە سوورە تۆخە و ئەم جلوبەرگانە و ئەم توورەکە پارەیەش بۆ ئێوە، کە بەپێی نەریتی باو، لەبەر ئەوەی جلی تازە لەبەر دەکەن، دەتوانن شیرینیی پێ بکڕن و بەسەر هاوڕێ و دۆستاندا بیبەخشنەوە."

سوهرەوەردی، بە سوپاسکردنەوە لە میهرەبانیی شەریف ئیفتیخارەدین، لە کوڕەکەی پرسی،

"بەتەنیا هاتوویت؟"

"نەخێر، خزمەتکارێکم لەگەڵدایە، لە دەرەوە وەستاوە."

شەهابەدین بە داوای لێبووردنەوە وتی، "زەحمەتێک دەخەمە بەرتان، ئەم گەوهەرە گرانبەهایەم پێیە، کە بۆ





نقێمی ئەنگوستیلەی گەورەپیاوان بەکار دێ. دەمەوێ بیفرۆشم. بەباشی نازانم خۆم بۆ بازاڕ بچم. داوات لێ دەکەم لەگەڵ ئەو خزمەتکارەدا بڕۆن بۆ بازاڕی زەڕەنگەرەکان، کە هەمووی چەند هەنگاوێک لە مزگەوتەکەوە دورە و نرخەکەیم بۆ وەربگرن و تا پێم نەڵێن باییی چەندە، نەیفرۆشن."

کوڕەکەی شەریف ئیفتیخارەدین لەگەڵ خزمەتکارەکەدا چوون بۆ بازاڕ. گەوهەرەکەیان پیشانی هەرکەسێک دەدا، بە شتێکی گرانبەهای دەزانی و نرخێکی زۆری لەسەر دادەنا، تا گەیشتنە زەڕەنگەرییەکەی ئەبو زەید، کە لە شاردا ناسراو بوو و هەر خۆیشی گەوهەری دانسقە و نایابی بۆ میری دەکڕی. گەوهەرەکەی بە دەستەوە گرت و وتی، "بە ڕێکەوت میر ڕای سپاردووم بۆ نقێمیکی تازە و بەدوای گەوهەرێکی گرانبەهادا دەگەڕێت. لێرە چاوەڕێ بن، تا دەچم ڕاوێژێک دەکەم."

زۆری پێ نەچوو، گەڕایەوە و وتی، "مژدەیەکی باشم پێیە بۆتان. جارێ پێم بڵێن، زەڕەنگەرەکانی تر چەندیان پێ داوە؟"

کوڕەکەی فەخرەدین بە خۆشحاڵییەوە وتی، "تا دە هەزار درهەمیان داوە. بەڵام ئەبو سەهل وتی پازدە هەزار درهەم زیاتر دەکات."

"زۆر باشە، من لەگەڵ خەزێنەداری شادا ڕاوێژم کرد، ئەو سی هەزار درهەمی پێ دەدات. ئەگەر پێتان باشە، من ئەم گەوهەرە بۆ میر دەکڕم."

"چاکە، بەڵام من دەبێ خاوەنەکەی لەو نرخە ئاگادار بکەمەوە."

بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە، گەڕایەوە بۆ لای سوهرەوەردی. کوڕەکەی فەخرەدین پاش کەمێک لە حوجرەکەی سوهرەوەردی هاتەوە دەرێ و ماجەراکەی گێڕایەوەو وتی، سوهرەوەردی گەوهەرەکەی بە دەستەوە گرت. لەسەر ئەرزەکە دای نا و بە بەردێکی گەورە وردوخاشی کرد، بە جۆرێک، کە ئیتر بەکەڵکی هیچ نەیەت و پاشان وتی، "دەستمان بە دونیا دەگات، بەڵام دڵ گەلێ لەوە گرانبەهاترە، کە بە دونیای بفرۆشین. ئێمە یوسف لەناو بیرەکە دەر دەهێنین، بەڵام بە نرخێکی هیچ نایفرۆشین. لەبری من، دەستی باوکت ماچ بکە، ئەم جلوبەرگەش لەگەڵ خۆت ببەرەوە و پێی بڵێ سوهرەوەردی دەڵێت، من دڵ بە دونیا نادەم، دەنا دەستی من لەسەر قۆڵی دونیادۆستان درێژترە. ئەگەر بەدوای پۆشتەنییەوە بووینایە، نەدەگەیشتینە ئێرە. جەستەی من لەو پۆشاکەی خۆم بەولاوە، پێویستی بە پۆشاکی زیاتر نییە، لەبەر ئەوەی، جەستەی خۆم پۆشاکێکی قورسە، کە ڕۆحم بەزۆر بەرگەی دەگرێت! بۆیە ئەم بارە قورسە، بە پۆشاکی گران قورستر ناکەم."



# ڕەندی دونیاسووتێن

ڕەندی دونیاسووتێن چ باکی بە بەرژەوەندییە؟
ئەوە کاری دەوڵەمەندارە، تەگبیری لێ ئەکا

ماردینی، کە لەگەڵ هەندێ زانا و گەورەپیاوی دیاربەکردا نیازی حەجیان هەبوو، گەیشتبوونە حەڵەب. بە مەبەستی حەوانەوە و بینینی زانایان، چەند ڕۆژێک لە حەڵەب مایەوە. زانایانی ئەوێ چوون بۆ لای، ئەویش سەردانی چەند زانایەکی گەورەی حەڵەبی کرد.

ئەو شەوەی بەتەما بوون بۆ بەیانییەکەی حەڵەب جێ بهێڵن، بەر لە نوێژی شێوان، بەدزییەوە چوو بۆ حوجرەکەی سوهرەوەردی. دەرگاکەیان لەسەر خۆیان داخست و هەرچەندە ماردینی پەلەی بوو هەرچی زووترە بگاتەوە مەنزڵگەکەی و بحەسێتەوە، بەڵام دەبووایە هەندێ قسەی لەگەڵ سوهرەوەردی بکردایە، لەبەر ئەوەی تەواو نیگەرانی بوو. هەر بۆیە زوو دەستی بە قسەکانی کرد، "شەهابەدین، ئەو قسانەمت لەبیرە، کە لە ماردین پێم وتیت؟ من ئەم دوو-سێ ڕۆژە، کە لە نزیکەوە لەگەڵ زانایانی شاردا کۆ بوومەتەوە، دەبینم کە پێشبینییەکەم ڕاست دەر چوو. هەست دەکەم تۆ لە دۆخێکی خەتەرناکدایت. زانایانی شار باش باست ناکەن. ئەو بایەخپێدانەی زاهیرشا بە تۆ،

بووەتە مایەی ئیرەیی و نیگەرانی لایان. من کاتی خۆی پێم وتیت، کە میرەکان بۆ ئەوە بایەخ بە زانا لاوەکان دەدەن، تا فیز و غروری زاناکانی تری پێ بشکێنن. سەلاحەدینی باوکی زاهیرشا لەو دەسەلاتەیدا کە ئێستا هەیەتی، خۆی بە قەرزاری زانا ئایینییەکان دەزانێت. لەبەر ئەوەی بە هۆی فەتوای جیهادی ئەو زانا ئایینیانەوە بوو، کە خەڵکی بەلێشاو ڕوویان دەکردە سەربازگەکانی لەشکرەکەی ئەو و دواجار توانییان شکست بە خاچپەرستەکان بێنن. لەبەر ئەوە، زانا ئایینییەکانی حەڵەب دەسەلاتێکی زۆریان هەیە و لای خودی سەلاحەدینیشەوە، بایەخێکی تایبەتیان پێ دەدرێ و نابێ سەنگەریان لێ بگرێت. لە سەرێکی ترەوە، ئەم کوڕە لاوە کەمتەمەنەی، کە لەڕادەبەدەر خۆشی دەوێیت، دەیەوێ هەموو چین و توێژەکانی شار، لەنێویشیاندا ئەم زانا پیرانە، وەکوو میرێکی بەدەسەلات لێی بڕوانن. دیارە ئەمەش هەر وا بەئاسانی نایەتە دی، بۆیە ئەو پێ بزانێت یان پێ نەزانێت، بۆ گەورەکردنەوەی خۆی، بە بچووککردنەوەی ئەو زانا ئایینییەوە دەستی پێ کردەوە. دڵنیاشم لەم ڕووەوە تۆی بەکار هێناوە. هەوڵ و تەقەللای ئەو بۆ دروستکردنی ئەو کۆبوونەوە و کۆڕی وانە و گفتوگۆ و لێکۆڵینەوانە، بەو مەبەستەیە. لە سەرێکی ترەوە، کەسێک، تەنانەت گەر دەریای زانست و زانینیش بێت، کاتێ پێگەی زانایان دەخاتە مەترسییەوە، ئەوا ئەو زانایانە دژی دەوەستنەوە و بە هەر بەهانەیەک بێت، دەیانەوێ سووکی بکەن و بگرە تەکفیریشی بکەن. سەبارەت بە بایەخدانی میر و چاودێریکردنی بۆت، گەرچی ئەم میرە وەکوو خۆت کوردە و حەز بە زانست و





زانین دەکات، بەڵام تۆ خۆشت دەزانیت و پێشتر بینیوتە، کە میران و فەرمانڕەوایان نە کاتی تەواویان هەیە بۆ زانست و زانین و نە زۆر گرنگیشە بەلایانەوە. ئەوانە بە ڕادەیەک لەناو گرفتەکانی سیاسەتدا نوقمن و گرنگی بە مەسەلە دنیایی و تیپەڕەکان دەدەن، کە دەرفەتیان بۆ شتی تر نامێنێتەوە. خەڵک لەسەر کار لابردن و دامەزراندنیان و خۆنواندن و حەز و شەهوەت تێرکردن و لە هەمووشیان خراپتر، لەبەر ئەوەی دەسەلاتیان لە دەستدایە و لەزەت لە بەکارهێنانی وەر دەگرن، خۆیان لە هەموو کەسێک بە گەورەتر دەزانن و خۆیان بە خوای خەڵک دەزانن. کاتێکیش بایەخ بە زانایان دەدەن، ئەوە تەنها بۆ خۆنواندنە یان کارێکیان پێیانە. سوهرەوەردی! من کاتێ بیستم تۆمەتی ئەوەیان خستۆتە پاڵت، کە لافی پێغەمبەرایەتی لێدەدەیت، تەواو ترسم لێ نیشت."

سوهرەوەردی، کە زۆر بەوردی و بە ڕێزەوە گوێی بۆ قسەکانی ماردینی شل کردبوو، سەری بەرز کردەوە و وتی، "باشە، ئەی چار چییە؟ گوناهی من لەمەدا چییە؟"

"شەهابەدین! تۆ لە ڕەچاوکردنی هەلومەرجەکاندا درێخیت کردووە. من چەند ساڵێک لەمەوبەر بەڕاشکاوی لەوە ئاگادارم کردیتەوە. بەڵام دیارە تۆ ڕەچاوی شتەکانت نەکردووە."

"سەروەری من! بڕوا بکە من هیچ گوستاخییەکم نەکردووە. من هەرچییەکم کردبێت، لە ڕووی ئەنجامدانی ئەرک و بەجێهێنانی پەیامەوە بووە. واتە لەو ڕووەوە کە هەرکەسێک زانستێکی بەدەست هێنا، دەبێ بە کەسانی تری ببەخشێت و ئەگەر کەسێکی گومڕای بینی، دەبێ هەوڵ بدات

ڕێنمایی بکات. یاخود ئەو شتەی کردوومە پێویست و ناچاری بووە. بە بۆچوونی خۆم، کاروبارەکان باش بەرەوپێش دەچن و پەشیمان نیم. سەروەرم! من دەرک بە هەستی تۆ دەکەم. بەڵام هەقیقەت ناکەم بە قوربانی بەرژەوەندی. نەک هەر من، هەرکەسێک بە بادەی زانین مەست بووبێت و لەسەر ئاوازی ڕۆح سەمای کردبێت، ئەو ئاوازەی کە زەوی و ئاسمانیش لەگەڵیدا سەما دەکەن؛ هەرکەسێک نەبووبێت بە کۆیلەی حەزەکانی، ئەو ڕەندە دنیاسووتێنەیە، کە بەرژەوەندی ناکات بە سەنگی مەحەک بۆ ژیان. تۆ خۆشت باش دەزانیت، کە من کابرایەک نیم دوای بەرژەوەندی بکەوم. ئیتر هەڵوێستی ئەو زانایانە بەرامبەر بە من چۆنە، یان ڕق و کینە و ئیرەییان، پەیوەندیی بە خۆیانەوە هەیە. من ئومێدم بە زاهیرشاش نەبەستووە، بەڵام تا ئەو سنوورەی هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەم، تەقەللای خۆم دەدەم. هەڵبەتە ئەو بیروبۆچوونەکانی منیشی لا پەسەندترە وەک لە هیی ئەو زانایانە! خۆ ئەگەر مەبەستێکیشی هەبێت، من لەو مەبەستەی ناگەم. بەڵام ئەوەندە دەزانم، کە ئەویش زۆر لێیان پەستە."

لە کۆتاییدا، ماردینی وای بە باش زانی، خۆی چاوی بە زاهیرشا بکەوێت و سەبارەت بە حاڵی سوهرەوەردی ڕاوێژێکی پێ بکات. لە کاتی خواحافیزیدا، بە سوهرەوەردیی وت، "من سەبەینێش دەمێنمەوە. بەڵکوو بتوانم لەم بارەیەوە قسەیەک لەگەڵ میردا بکەم. بەڵێ، سبەینێش دەمێنمەوە."



# چی بکرێ باشە؟

دێوانە بە، تا خەمت

ئەوانی دی بیخۆن

ماردینی وای بە چاک زانی، ڕۆژێک سەفەرەکەی دوا بخات. بەیانی زوو چوو بۆ لای ئەبو حەفسی کاتب، کە لەمێژ بوو دەیناسی. داوای لێ کرد یارمەتیی بدات، تا سەردانێکی تایبەتی زاهیرشا بکات. پاش کەمێک تێفکرین، ئەبو حەفس پێی باش بوو ماردینی داواکارییەک بنووسێت و تێیدا بڵێت، کە لەبەر ئەوەی لەسەر حەجکردنە، حەز دەکات میر ببینێت.

ماردینی نامەکەی نووسی و ئەبو حەفس و سەرکاری تایبەتیی شا کارەکەیان بۆ مەیسەر کرد و قەرار بوو عەسری هەمان ڕۆژ، ماردینی، شا ببینێت.

عەسر ماردینییان برد بۆ لای شا. پاش نواندنی ڕێز، مۆڵەتی وەر گرت لە نزیک شاوە دابنیشێت. ئەو داواکارییەی کە تیایدا نووسیبوو دەیەوێ شا ببینێت تا سەبارەت بە سوهرەوەردی قسەی لەگەڵدا بکات، بە ڕێزەوە ڕادەستی شای کرد. لەبەر ئەوەی مەسەلەکەی سوهرەوەردییش مەسەلەیەکی هەستیار بوو، شا بە سەرکاری وت، کە بەتەنیا جێیان بهێڵن.

کە بەتەنیا مانەوە، ماردینی بەوپەڕی ڕێزەوە وتی، "سەروەرم، ناوبانگی گەورەیی و بەخشندەیی و دانایی ئێوە،

لە هەموو جیهاندا بڵاو بۆتەوە و گەرچی لاون، بەڵام لە هەموو شوێنێک باس باسی دادپەروەری و ڕەعیەتپەروەریی ئێوەیە. باوکتان سەری هەموومانی بەرز کردۆتەوە و تۆش بەڕاستی نەوەی ئەو قارەمانە بەشکۆیەیت و وەکوو دەشبینین، کارە باشەکانی ئێوە لە هەموو وڵاتانی دونیادا دەنگی داوەتەوە و مایەی سەربەرزیی زیاتری ئەم بنەماڵەیەیت. بە بڕوای ئێمە، لەم ماوەیەدا کە جڵەوی فەرمانڕەوایی لە دەست ئێوەدا بووە، دۆخی زانایان تەواو گۆڕاوە و زانست و دین برەوێکی زۆریان پەیدا کردووە. ئێمە سوپاسی خوا دەکەین بۆ ئەمە و داواکارین لێی، دەوام بەم بنەماڵەیە بدات. مەبەست لە هاتنمان و زەحمەتدانی ئێوە ئەمەیە: شەهابەدین یەحیا سوهرەوەردی، کە لە چاودێریی ئێوە بەهرەمەندە، ئێستا تووشی دۆخێکی نەگونجاو بووە. زانا گەورەکانی شار دووچاری بەدحاڵیبوونێک بوون سەبارەت بەو و ئەگەر بیر لە چارەسەرێکی خێرا نەکەینەوە، دۆخەکە خراپتر دەبێت. چارەسەر و تەگبیری شایستەش، پێویستی بە ڕا و بۆچوونی ئێوەیە."

زاهیر شا، کە حاڵەتی فەرمیی خۆی پاراستبوو و گوێی بۆ قسەکانی ماردینی شل کردبوو، ڕووی تێ کرد و لە کاتێکدا چاوی بڕیبووە چاوی ماردینی، پێی وت، "ئێوە ئەو دەناسن؟"

"بەڵێ، سەروەرم."

"لە کەییەوە؟"

"دە-دوازدە ساڵ دەبێت. ئەو لە هانی بوو و منیش زۆرم خۆش دەویست. چەندین کاژێر پێکەوە دادەنیشتین و گفتوگۆمان دەکرد. بەڕاستی هەڵکەوتوو بوو، پیاوێکی بلیمەتە. بەڵام من هەر لەو کاتەوە نیگەرانی بووم. کابرایەکی بێباکە، زۆر بێباکە.





چەندین جار لەوە ئاگادارم کردۆتەوە و لە ئاکامەکانی ئەو بێباکییەی وریام کردۆتەوە. بەڵام ئەو هەمیشە وەڵامەکەی ئەوە بووە، کە نابێ هەقیقەت بەقوربانی بەرژەوەندی بکەین. من هەمیشە نیگەرانی بووم و ئێستاش کە هاتووم بۆ حەڵەب و لێرە زانیم هەڵوێستی زاناکان بەرامبەری چۆنە، زیاتر نیگەرانی بووم."

"بە بۆچوونی ئێوە، چی بکرێ باشە؟"

"بۆچوون، بۆچوونی بەجێی جەنابتانە. تا تەگبیری ئێوە وەستابێت، ئێمە بۆچوونمان نابێت. هەر لەبەر ئەمەش، هاتووم و کاتتانم گرتووە، چونکە من و ئەوانەی وەک منن، لەم ڕووەوە هیچیان پێ ناکرێ."

"من دەمەوێ سەرەتا بۆچوونی ئێوە بزانم، پاشان منیش دەڵێم کە چی بکەین باشە."

"بەچاوان، قوربان. من دوێنێ شەو لەگەڵ ئەودا بووم و وەک هەمیشە سەرقاڵی گفتوگۆ بووین. من هیچم بەو نەوت، بەڵام من وای بە باش دەزانم، کە ئێوە مۆڵەت بفەرموون، سوهرەوەردی ئەم وڵاتە جێ بهێڵێت، بڕوات بۆ ڕەی، ئەسفەهان، دیاربەکر، وڵاتی ڕۆم و هەرکوێیەکی پێ خۆش بێت. با لەم ڕووبەڕووبوونەوانەی ئێرە ڕزگاری ببێت. دوای ئەوە، خوا کەریمە! دواتر بە حوکمی تەمەن و ئەزموون، فێر دەبێت چۆن ئاگای لە قسەکانی خۆی بێت."

زاهیرشا، کە لاپرەسەن بووبوو، پرسیی، "ئەمە پێشنیاری تۆیە یان سوهرەوەردی؟"

"قوربان، ئەمە پێشنیاری بەندەیە. هێشتا لەگەڵ ئەودا هیچم لەم بارەیەوە نەوتووە. بە قسەکردنەکەی دوێنێماندا، دیار بوو

کە ئەو خۆیشی نیگەران نییە. ئەو تەواو ئارام و ئاسایی دیتە بەرچاو و باکی لە هیچ شتێک و لە هیچکەس نییە."

شا، کە پێدەچوو لەم وەڵامە ڕازی بێت، بە لەخۆبایبوونێکەوە وتی، "ڕۆیشتنی ئەو لە حەڵەب، هیچ مانایەکی نییە. ئەو نابێ هەڵێت و پیاوی هەڵاتنیش نییە. ئێستاش مادامەکی ئەم خۆی نیگەران نییە، پێویست ناکات تۆش نیگەران بیت. من خۆم ئاگام لێی دەبێت و لەم و لەو دەیپارێزم. لەوانەیە ئەو خۆیشی بە تۆی وتبێت، کە من تەنها بۆ ئەوەی پێگە و پایەی ئەو بەرز ڕابگرم، لە کتێبخانەی کۆشکدا شوێنێکم بۆ تەرخان کردووە، کە وانەی تیا بڵێتەوە. گەلێ زانا و قوتابیی شار ئامادەی وانەکەی دەبن. من خۆیشم، هەرکاتێ دەرفەتم هەبێت، لە وانەکەیدا ئامادە دەبم، کە پێشتر هەرگیز بۆ وانەی کەسی تر نەچووم. هەرچەندە لەم دواییەدا بە هۆی ڕۆیشتنی مامەوە ئەرکەکانم زۆرتر بوون و ناتوانم ئامادەی وانەکەی ببم، بەڵام بەردەوام کۆڕی گفتوگۆی لەگەڵ زانایاندا بۆ ساز دەکەم و چاودێریی دەکەم. دڵنیام لەوەی لەو مەیدانەدا تاقانەیە و کەسیان لە عۆدەی نایەن. لەبەر ئەوە، تۆ خاترجەم بە. بڕۆ و سەفەری خۆت بکە و نزامان بۆ بکە."

ئینجا سەرکارەکەی بانگ کرد، ئەمەش نیشانەی کۆتاییی دانیشتنەکەیان بوو.

ماردینی هەستا و لە ڕووی ڕێزەوە بۆی نوشتایەوە و مۆڵەتی ڕۆیشتنی لێ وەر گرت. میر ئاماژەی بۆ کرد، نزیکتر ببێتەوە لێی. وەختێ دەستی میری ماچ کرد، بە سەرکاری وت، پریاسکەیەک زێڕ بە ماردینی بدات. سەرکار پریاسکەکەی دایێ و ماردینی ماچی کرد و خستیە سەر چاوی و بە ڕێزەوە پشتاوپشت گەڕایەوە، تا لە هۆڵەکە چووە دەرێ.



# ئارامیی پێش تۆفانەکە

وەک نەسیمێ، بەسەر ڕووی خۆما هەڵئەکەم
دەرگاکان واڵا ئەکەم.

چەند مانگێک بوو بەئارامی دەیگوزەراند. لەم ماوەیەدا زانا ئاینییەکان بە مەبەستی حەج لە مەککە و مەدینە بوون. زاهیرشایش لەگەڵ باوکیدا چووبوو بۆ جەنگی هێزە خاچپەرستەکان و یاخییەکانی ناوخۆ لە میسر و فەلەستین.

لەم ماوەیەدا، سوهرەوەردی تا ڕادەیەک بێ دەردەسەری بوو، دەستی لە هەموو وانەوتنەوە و گفتوگۆیەکیش هەڵگرتبوو و خەریکی نووسینی کتێبەکانی بوو. دۆستەکانی لە نووسینەوە و کارەکانیدا یارمەتییان دەدا. ئەو دەیزانی نووسینەکانی تەنها لە ڕێی لەبەرنووسینەوەوە قابیلی ئەوەن بمێننەوە و نەفەوتێن. هەروەها ئەم ماوەیە دەرفەتێکی باش بوو بۆ خەڵوەتی شەوانە و نەشئەی چرکەساتی خۆرکەوتن و لە جەستەداماڵران و دوورکەوتنەوە لە جیهانی ماددی و پەنابردنە بەر دونیای ئاوەز. مەودای نێوان خۆی و سیندوختیشی وەها کەم کردبۆوە، کە دەتگوت وا لە پەنایەوەیەتی، نەک لە ئاسۆیەکی دووردا. لە دواهەینیی مانگی زولحیجەدا، لەو ساتەدا کە خۆر هەڵدەهات، لە نەشئەیەکدا، کە وەسف ناکرێ و لەگەڵ نەشئەکانی پێشوودا، تەواو

جیاواز بوو، سیندوختی بینی لەگەڵ *ئۆردووی سوورئاناهید*، کە چوار ئەسپی سپی گالیسکەکەیان ڕادەکێشا، بە تاجی ئاڵتوونی و سەد ئەستێرە و هەشت تیشکەوە. پێکەوە بە عیشوە و کرێشمەوە بە یەحیایان دەوت، "وادەی دیدار نزیکە. ئێمە دەگەینە فریات. لە تاریکترین چاڵی زەوییەوە هەڵت دەگرین و دەفڕین و دەتبەین بۆ ڕووناکترین فەزای ئاسمان." ناهید جامێکی بەدەستەوە بوو دای بە سیندوخت، تا بیدات بە یەحیا و بیخواتەوە. سیندوخت جامەکەی برد بۆ لێوی یەحیا و کاتێ خواردییەوە، نەشئەیەکی پێ دا، کە زانست و ئاوەزی لە پەلوپۆ خست.

تا ماوەیەکی زۆر، بەم جامە سەرمەست بوو و هەموو گیانی کەوتە سەما:

چەشنێ مەستم، چەشنێ مەستم من ئەمڕۆ
کە لە چەمبەر هاتمە دەر من ئەمڕۆ
چەشنێ مەستم، نایەت بە خەیاڵی کەسا
من بەم چەشنەم، من بەم چەشنەم، من ئەمڕۆ
بە ڕۆح بۆ ئاسمانی عەشق چووم
بە ڕووکەش گەر ئا لەم خوارەم من ئەمڕۆ
گوێی ئاوەزم گرت و پێم وت: ئەی ئاوەز،
برۆ، لە تۆ ڕزگارم بوو من ئەمڕۆ
ئەگەرچی نایشزانم لەکوێم، وەلێ
دەنێو پێگەی پیرۆزێکدام من ئەمڕۆ

گەڕانەوەی زانایان لە سەفەری حەج، وردەوردە بازاڕی





وانە و توێژینەوە و گفتوگۆی گەرم کردەوە. دوو مانگێک دوای ئەوەش، زاهیرشا گەڕایەوە بۆ حەڵەب و پێشوازییەکی گەرموگوڕ و پرشکۆی لێ کرا. هێشتا دوو فرسەخی مابوو بگاتە شار، قوربانی و عەترپڕژێنی و سەما و شادی و دروشم و سەناخوانی دەستی پێ کردبوو. کاتێکیش کەژاوەی شاهانەی بە دەروازەی شاردا تێپەڕی، میران و پیاوە ناسراوەکانی شار و بازرگانانی ناوچەکە کەوتنە بەخشیش، بەتایبەتیش لەبەر ئەوەی میرە لاوەکەیان لەگەڵ کچە ئامۆزاکەی خۆیدا لە دیمەشق هاوسەرگیرییان کردبوو و نۆبووکەکەی لەگەڵ خۆیدا هێنابووەوە و حەڵەبیان ڕازاندبووە. کەژاوەی نۆبووکەکە، کە بە کەنیزەک و سترانبێژ دەورە درابوو، لەدوای کەژاوەی میرەوە دەڕۆیی. کاتێ کەژاوەی بووکێ تێپەڕی، کاربەدەستانی میر پیاوەکانیان دوور دەخستەوە، تا ژنان بۆ پێشوازیی بووکێ بچنە پێشێ. ژنان و پیاوان و خانەدانان، هەموو سەرگەرمی سەما و هەڵپەرکێ بوون. ڕێوڕەسمەکە ماوەی مانگێک درێژەی کێشا.

میرەی لاو، دوای ئەوەی حەسایەوە و کەمێک ئارام بۆوە و ڕێوڕەسم و سەردانەکان تەواو بوون، ڕۆژێکیان داوای سوهرەوەردیی کرد. کاتێ سوهرەوەردی هات بۆ لای، لەبەری هەڵسا و لە نزیک خۆیەوە و لە سەرەوە دای نیشاند و بە میهرەبانییەوە لە حاڵ و ئەحواڵی پرسی و وتی، "لەم ماوەیەدا، چەند جارێک هاتوویتەوە یادم و دوو-سێ جاریش بەرگریم لێ کردوویت. لەوانە، ڕۆژێکیان لە خزمەت باوکمدا بووین، کە ژمارەیەک زانای ئایینی دیمەشق هاتن بۆ سەردانمان. ئەوانیش گومانی خراپیان بەرامبەر بە

تۆ هەبوو و منیش دڵنیام کردنەوە، کە بە هەڵەدا چوون. باوکیشم فەرمووی، کە دەبێ بە وریاییەوە هەڵسوکەوتت لەگەڵدا بکەم، منیش پێم وت خاترجەم بە، چونکە من سوهرەوەردی باش دەناسم. بەڵام زانا ئایینییەکانی حەڵەب واز ناهێنن. دیسانەوە نامەیان بۆ نووسیوین، کە تۆ لە حەڵەب دەر بکەین. منیش پێم وتوون ئێمە ئەومان نەهێناوە، تا لێرە دەری بکەین. ئەو بەندەی خودایە و لەم سەرزەمینە بەرینەدا، مافی گەڕان و ژیانی هەیە. بەڵام ئەوان واز ناهێنن. من لەم بارەیەوە زۆر بیرم کردەوە. دواجار چارەسەرم لەوەدا بینییەوە، کە گفتوگۆیەکی ڕووبەڕوویان لەگەڵدا بکەیت. هەر بۆیە خۆت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی گەورە ئامادە بکە. گەرچی پێشتر چەند جارێک ڕووبەڕوویان بوویتەتەوە و لە عۆدەیان هاتوویت. بەڵام ئەوانە هەمووی گفتوگۆی قوتابێتی بوون. دەبێ ئەوەت لا ڕوون بێت، کە ئەم جارەیان ئەم ڕووبەڕووبوونەوانەت لەگەڵ زانایانی ئاییندا، حاڵەتی دادگایی بە خۆیەوە دەگرێت. ئەوان هەندێ شتیان هەیە، کە وەکوو دەعوا و تۆمەت دژ بە تۆ دەیخەنە ڕوو و تۆش دەبێ بتوانیت بەرگری لە خۆت بکەیت. دەبێ زۆر وریا بیت لەگەڵیاندا، چونکە تا بڵێی، لەبلەبانن و بوارت نادەن. خۆ ئەگەر ناشتەوێ ڕووبەڕوویان ببیتەوە، ئەوا من نابمە کۆسپ لەبەر ڕێتدا و بۆ کوێ دەڕۆیت، بڕۆ."

میر چاوەڕێی وەڵام بوو و سوهرەوەردییش بە هێمنی و بێباکییەوە وتی، "سەروەرم. فەرمانی ئێوە لەسەر چاو و بۆچوونیشتان بەجێیە. منیش ئامادەی ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیەم. من لەبەر دوو هۆ ڕاناکەم؛ یەکەمیان،





لەبەر ئەوەی خستنەڕووی هەق و زانین و بەجێگەیاندنی پەیام، ئەرک و بەرپرسیارێتییە، تەنانەت گەر نرخەکەی ڕاوەدوونان و ئەشکەنجەدان و تەنانەت تەکفیر و لەسێدارەدانیش بێت، وەکوو چارەنووسەکەی سوکرات. دووەمیان، لەبەر ئەوەی بۆ هەرکوێیەک بچم، ئەم دوژمن و نەیارانە هەن. بەڵام لە شوێنی تر، میرێکی میهرەبانی وەکوو ئێوە نابینمەوە، کە بەرگری لە دانایی بکات. من دەمێنمەوە، چونکە باوەڕم بەوە هەیە، کە دواجار هەر دەبێ هەق سەر بکەوێت، گەرچی خەڵکێکی زۆر لەو پێناوەدا شەهید بوون و دەبن."

سەرکار، کە لە سووچێکی خوارەوەی هۆڵەکەدا بە شێوەیەکی ڕەسمی ڕاوەستابوو، کاتێ شا ئاماژەی بۆ کرد، چوو بۆ لای. ئینجا بە یەحیای وت، کە دەتوانێ بڕوات. بە سەرکارەکەشی وت، کە سبەینێ لە دەرفەتێکدا ئەبو حەفسی کاتب بهێنێت بۆ لای.

# له قوتابخانەوە تا قەڵا

هەزار دوژمن، کوشتنی من بێ مەبەستیان
تۆ یارم بیت، باکم نییە لە هیچیان

وتوویژ و ڕاوێژی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی میر لەگەڵ زانایانی شاردا، دوو-سێ مانگی خایاند. ژمارەیەک لە زاناکان بە ڕەچاوکردنی مەیلی میر، وایان پێ باش بوو لەگەڵ ئەو قەڵەندەرەدا دەرگیر نەبن و لافلێدان و شەتەحاتەکانی و هەروەها هەموو ئەو دەنگۆ ڕاست یان درۆیانە پشتگوێ بخەن، کە دەرهەق بە کەسێتی و بیروباوەڕ و نووسراوەکانی ئەو دەوترێن و بەپێی ئەو پرنسیپە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، کە لەو ڕۆژگارەدا بەرامبەر بە عارفان و شێخان دەکرا: "نە نکووڵیکردن! نە پەیڕەویکردن!"

هەندێکی تر بە هیچ کلۆجێک ئامادە نەبوون لە کۆڕێکدا لەگەڵ سوهرەوەردیدا دابنیشن و گفتوگۆ و وتوویژی لەگەڵ بکەن، چونکە ئەویان نەک هەر بە زانایەکی ئایینی لەقەڵەم نەدەدا، بگرە بە پیاوێکی خراپەکار و فێڵبازیان دەزانی، کە سەرچاوەی مەترسییە بۆ سەر ئایین و بیروباوەڕی خەڵک و پێویستە بە زووترین کات لەناو ببرێ.

هەندێکی تریش وایان پێ باش بوو، لە کۆڕ و گفتوگۆدا، جارێکی دی بیخەنەوە بەر پرسیار و بە شێوەیەکی زارەکی

سەبارەت بە هەموو ئەو بابەتانەی لە نووسراوەکانیدا جێی گومانن، داوای ڕوونکردنەوەی لیٚ بکەن و پاش گوێگرتن لە بیروبۆچوون و ڕوونکردنەوەکانی، بە شێوەیەکی دەستەجەمعی داوەریی دەربارە بکەن و ئەنجامەکەشی لە ڕێی میرەوە بەجیٚ بگەیەنن. ئیتر ئەنجامەکەشی گرنگ نییە، سوهرەوەردی چ بێتاوان دەر بچێت یان لەسێدارە بدریٚ.

دیارە هەر گروپەش هەڵوێستەکەی خۆی بە تاقە هەڵوێستی ڕاست دەزانی. لەبەر ئەوە، تەنانەت گەر میریش داوای لیٚ بکردنایە، ئامادە نەبوون هەڵوێستی خۆیان بگۆڕن.

گروپی یەکەم حوکمی شەرعیان لەوەدا دەبینی، کە واز لە سوهرەوەردی بهێنن و هیچ حوکمێک سەبارەت بە پشتیوانیکردن یان دژایەتیکردنی ئەو دەر نەکەن و دەیانوت ئەو خۆی و خوای خۆی دەزانێت و تا بەڵگەی سەلمێنەرمان لا نەبێت بۆ کفرکردنی، هیچ شتێک لە ئەستۆی ئێمەدا نابێت. بەڵام گروپی دووەم، کە بەزۆری لە زانایانی پلەیەکی شار پێک هاتبوون، لە ڕێی ئەو ڕاپۆرتە جیاوازانەوە کە لەلایەن دیندارانی دەمارگیر و نەخوێندەوارەوە پێیان گەیشتبوو، سوهرەوەردییان بە موسوڵمانێکی ئاسایی نەدەزانی، بەڵکوو مەترسیی دامەزراندنی ڕێبازی تایبەت بە خۆی و بیدعەبازی، بەلایانەوە وەکوو ڕۆژی ڕووناک وا بوو. بۆیە هەرجۆرە سازشێک لەگەڵیدا، بە زیانیان لە قەڵەمدەدا بۆ موسوڵمانان. لەم نێوەدا، گروپی سێیەم، گەرچی لە ڕووی پێگەی کۆمەڵایەتییەوە هێندەی گروپی دووەم بەهێز نەبوون، بەڵام پێشنیارەکەیان بەلای میرەوە بەجێتر و مەنتیقیتر بوو.

لە کاتێکدا بە دەستێوەردانی ناڕاستەوخۆی میر، هەوڵێک





هەبوو بۆ هاوئاهەنگی لەنێوان گروپی دووەم و سێیەمدا، مەسەلەیەکی خەتەرناکی تر ورووژێنرا، بە گوێرەی ئەو مەسەلە تازەیەش، سوهرەوەردی هەر بە دژایەتیکردنی شەرعیەتی ئیسلام تاوانبار نەدەکرا و بەس، بەڵکوو ڕەهەندێکی سیاسییش بە بیروبۆچوونەکانی دەدرا و وەکوو نەیارێکی سیاسی دەخرایە ڕوو، کە لە ئایینەدا مەترسی بۆ سەر خیلافەتی ئیسلامیی بەغداد و میرەکانی سەر بەو خیلافەتە دروست دەکات، ئەو خیلافەتەی سەلاحەدینی ئەییوبییش یەکێک بوو لە بەناوبانگترین میرەکانی.

ژمارەیەک زانای ئایینیی لاو لافی ئەوەیان لێدەدا، کە سوهرەوەردی تەماحی فەرمانڕەواییی موسڵمانانی هەیە. ئەو خەلیفە و میرەکان بە شایستەی ئەو پلەوپایەیەیان نازانێت. ئەو زانا لاوانە دەیانوت، کە سوهرەوەردی باوەڕی بەوەیە، کە پێشەوای موسڵمانان دەبیٚ کەسێک بێت، ئیلهامی پیٚ بدریٚ. ئەمەش هەمان بیروباوەڕی فاتمییەکانە، کە لە میسر دژ بە خەلیفە یاخی بوون. جەنابی باوکی میر تووشی چ ئازار و ڕەنجێک بوو، تا ئاگری ئەو فیتنەیەی کپ کردەوە. ئەمانە دەڵێن ئەگەر دادگاییەک بۆ سوهرەوەردی ڕێک بخریٚ، ئامادەن بە بەڵگەی ناو نووسراو و بیروبۆچوونەکانی خۆی، ئەوە بسەلمێنن. ئەم لافلێدان و دەنگۆ تازەیە، هێندەی تر کێشەکەی سوهرەوەردیی گەورە کردەوە. گەرچی زاهیرشا ئەم مەسەلەیەی بەجیددی وەر نەدەگرت، بەڵام ئەمە بەهانەیەکی گرنگ و هەستیار بوو بۆ جووڵاندن و ورووژاندنی سەلاحەدین. ئەم دەنگۆیە گەرچی لەگەڵ هەڵوێستی گروپی دووەمدا دەگونجا، بەڵام پێشنیارەکەی

گرووپی سێیەمی بەهێزتر دەکرد. لەبەر ئەوەی گرووپی سێیەم بە پشتبەستن بەم دەنگۆ و تۆمەتە تازەیە، تاوانبار بوون و سزادانی سوهرەوەردییان بە شتێکی حەتمی دەزانی و بەرپرسیارێتیی کوشتنی ئەو، لەبری ئەوەی بیخەنە ئەستۆی ژمارەیەک زانای دەمارگیر و توندڕەو، دەیانخستە ناو چوارچێوەی کۆدەنگیی سەرجەم زانایانی ئایینیی شارەوە. بەر لە ڕێککەوتنی دووقۆڵیی ئەم دوو گرووپە و بە هاندانی گرووپی دووەم، واتە ئەو گرووپە توندڕەوەی ئامادەی گفتوگۆ و وتووێژ نەبوون لەگەڵ سوهرەوەردیدا، بەشێک لە خەڵکە توندڕەوەکانی شار بەرامبەر بە سوهرەوەردی پڕ لە ڕق و تووڕەیی بوون. هەر بۆیە لە هەموو شوێنێک کەوتنە تانەوتەشەرلێدانی و سووکایەتیپێکردنی، تەنانەت هەڕەشەی مەرگیشیان لێ دەکرد.

ئەم هەڕەشانە گەیشتنە ئاستێک، کە چیی تر سوهرەوەردی نەیدەتوانی ژیانی ئاساییی خۆی لەناو شاردا بباتە سەر. زاهیرشا، لە سەرێکەوە بە مەبەستی پاراستنی گیانی ئەم دانا بێپەنایە و لە سەرێکی تریشەوە بۆ دامرکاندنەوەی تووڕەیی و کینەی دەمارگیرەکان، فەرمانی دا سوهرەوەردی ببرێ بۆ قەڵاکە. دوای ئەوە، زۆری پێ نەچوو کە هەواڵی ئەوە بەناو شاری حەڵەبدا بڵاو بۆوە، کە سوهرەوەردی لە قەڵاکە زیندانی کراوە.



## ڕووناکی لە تاریکیدا

من شەوکوێر نیم، لێ چرایێ لە دڵم پێ ئەکەم بە عەشق
گریمان لێرە ماڵ تاریک و ئاسۆ و شەویش تاریکە
دارێکی تر ئەخەمە ناو ئاگرەکەتەوە ئەی عەشق
تا ببینم فەڕ و ڕووناکیت هەر لە زیادبوونە، ئەی عەشق

لە ڕاستیدا سوهرەوەردی و ناردنی بۆ قەڵا، نیشانەی شکستی زاهیرشا بوو بەرامبەر بە زانا ئایینییەکان. زاهیرشا، کە لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا پایەی سوهرەوەردیی لە هەموو زاناکانی تر بەرزتر ڕادەگرت، وەختێ دەسەڵاتی دینی بەسەر دەسەڵاتی سیاسیی ئەودا سەر کەوت، ناچار بوو ئەم لاوە غەریبەی هەر خۆی بەرەو بەرزایی بردی، ئەم جارە بۆ ناو چاڵەکەی قەڵای بنێرێت. دەمەوخۆرنشین شا یەکێک لە یاوەرەکانی خۆی بەدزییەوە نارد بۆ لای سوهرەوەردی و فەرمانی دا سوهرەوەردی بخەنە یەکێک لە ژوورەکانی تەنیشت مزگەوتەکەی قەڵاوە. پەیامێکی بۆ سوهرەوەردییش نارد، کە "نیگەران مەبە، ئێمە ئەو کۆڕی گفتوگۆیە ڕێک دەخەین و بە پشتیوانیی خودا، سەرکەوتنی تۆ بەسەر زانایانی شاردا دەبینین."

سوهرەوەردی وەختێ لە حەڵەب بوو، چەند جارێک هاتبوو سەیری قەڵاکەی کردبوو و بەدەوریدا سووڕابۆوە.

بەڵام لەو ڕۆژەوەی لە نەشئەیەکدا فڕینی خۆی بە سەروو قەڵاکەوە بینی، بەردەوام بۆ سەیرکردنی قەڵاکە دەچوو. لای خەندەکەکەوە دادەنیشت و تەماشای قوڵلەی قەڵاکەی دەکرد و بە خەیاڵی خەونئاسای چرکەساتی فڕینەوە، سەرمەست دەبوو. لە مێژوودا وا باس دەکرێ، کە وەختێ ئیبن سینا دەچێتە زیندان، نیگەرانی ئازادی و دەرچوونی دەبێت و لەبەر خۆیەوە دەڵێت، "هاتنم بۆ زیندان، بووە بە یەقین، بەڵام دەرچوونم لێی، جگە لە ئەگەرێک، هیچی دی نییە."

بەڵام سوهرەوەردی بە پێچەوانەی ئیبن سیناوە، وەها چوو بۆ ناو قەڵاکە، کە دەتوت ئارەزوویەکی لەمێژینەی هاتۆتە دی. بەئارامی لە هەموو شوێنێکی ورد دەبۆوە. بە جۆرێک بە داڵانە سەیر و سەرسووڕهێنەکەدا گوزەری دەکرد، دەتوت تەماشای وێرانەیەکی دێرین دەکات. ئەو دەیزانی نەک تەنها قەڵاکە، بەڵکوو سەرانسەری دونیا، جێی ئەو ڕۆحە نائارامەی ئەمی تیا نابێتەوە. گەلێ جار ئەوەی تاقی کردبۆوە، کە ڕۆحی نوورانیی ئەو، لە توانایدا نییە ببێتە یەخسیری ئەم دونیا مادییە. ئەم قەڵایەش بەتەنها جەستەی دەبات. بەوە دڵخۆش بوو، کە ئێرە دەبێتە ئەو شوێنەی لێیەوە بەرەو جیهانی مەلەکوت دەفڕێت. شاد بوو بەوەی لە سپێدەی هەقیقەت نزیک بۆتەوە و زۆری نەماوە بۆ فڕین.

لە نزیک مزگەوتی قەڵا، لە ژوورێکی بچووکدا دایان نا و پێیان وت، "دەرگای مزگەوتەکە و شوێنی دەسنوێژگرتنەکە هەمیشە کراوەیە. دەتوانیت شەوانە، تا ئەو کاتەی خەوت دەتەوێ، لە مزگەوتەکە یان لە پەرستگەی ئیبراهیم بمێنیتەوە."

سوهرەوەردی ڕووی کردە نێردراوەکەی شا و بە زمانێکی





گاڵتەئامێزانەوە وتی، "نیگەران مەبن، من پیاوی هەڵاتن نیم."

"نا، نیگەران نین، چونکە قەڵاکە بە شوورا دەورە دراوە و بواری هەڵاتن نییە و پاسەوانەکانیش لای ڕاڕەوەکانەوە وەستاون. پاسەوانەکان گەر نیگەران بن، دەتوانن پردی پەرینەوەکە لە ڕاڕەوی قەڵادا هەڵگرن."

"من خۆم پردەکان لەدوای خۆمەوە تێک دەدەم و هەرگیز لەو ڕێیەی لە بەردەممدایە، پاشەکشە ناکەم. چونکە کەس نییە لە بەرکەماڵییەوە بگەڕێتەوە بۆ نوقسانی و لە ڕووناکییەوە بگەڕێتەوە بۆ تاریکی. هیچ ترێیەک حەز ناکات ببێتەوە بە بەرسیلە."

سوهرەوەردی لە قەڵاکەدا شاد بوو. ناوبەناو لەبەر خۆیەوە هەندێ لەو بەیتە شیعرانەی دەوتەوە، کە خۆی نووسیبوونی:

"من پەیم بە نهێنییەکی گەورە بردووە
ئەوانەی باوەڕ ناکەن، با سەریان لە دیوار بدەن!
من لەسەر ئەم زەوییە تاریکە، بە ڕووناکییەکی گەورە گەیشتووم
کە لە خۆشیاندا ڕاست و چەپی خۆم لێک جیا ناکەمەوە!"

شەوانە لە مزگەوتەکەی قەڵادا یان لە پەرستگەکەی ئیبراهیمدا شەونخوونیی دەکرد. کاتێک خواردنیان بۆ دەهێنا، دەمی لێ نەدەدا و هەستی دەکرد ڕۆژبەڕۆژ پەیوەندیی لەگەڵ سیندوختدا بەهێزتر دەبێت. ئەوی دەبینی، لە ئاسۆدا، بەسەر شوورای قەڵاکەوە، لە هەموو لایەکەوە.

دواجار زانایانی ئایینیی شار قایل بوون بەوەی بۆ گفتوگۆ

لەگەڵ سوهرەوەردیدا دابنیشن. بەڵکوو بتوانن بیبەنەوە سەر ڕێگەی خۆیان، یاخود لەوە نائومێد بوون، فەتوای کوشتنی بدەن. وا پێشنیار کرا، کە چەند کەسێک بە نوێنەرایەتیی زانایان بچن بۆ قەڵا و لە مزگەوتی قەڵا لەگەڵ سوهرەوەردیدا گفتوگۆ ئەنجام بدەن. هەڵبژاردنی مزگەوتەکەش لەوەوە هات، کە هەم سوهرەوەردی وەکوو دەسبەسەرێک لەوێ بمێنێتەوە و هەم لە هەراوزەنای دەمارگیران بەدوور بێت.

سوهرەوەردی ئەم پێشنیارەی پەسەند کرد، بەڵام دوو برای فەقیهـ هەبوون، کە هەر لە سەرەتاوە ئاڵای شەڕیان بەرز کردبۆوە، ئەم دووانە لەگەڵ ئەم پێشنیارەدا نەبوون. یەکێکیان شێخ تاهیر بن نەسر و ئەوی تریان شێخ زەینەدین عەبدولمەلیک بن نەسر بوو. شێخ زەینەدین دەسەڵات و پێگەیەکی باڵاتری هەبوو. ئەو کە ئەو دەمە تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵێک دەبوو، یەکەمین کەس بوو، کە لە قودسی پیرۆز، لە قوتابخانەی سەلاحیە وانەی وتبۆوە و کتێبێکی لەسەر فەزیلەتی جیهاد نووسیبوو. ئەم پیاوە دەمارگیرە لە قوتابخانەی نوورییەی حەڵەبیش وانەی دینیی دەوتەوە. ئەم دوو برایە بە چاکیان نەزانی زاناکان بچن بۆ قەڵا و وتیان پێویستە سوهرەوەردی لە مزگەوتی گەورە ئامادە بێت، فەقیهـ و زاناکانیش هەموو لەوێ بن و گوێیان لە وتووێژەکە بێت. ئیدی بەم جۆرە هەموو لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن، کە گفتوگۆکە هەفتەی دوو ڕۆژ بێت، دوای خۆرکەوتن تا بانگی نیوەڕۆ، ڕۆژانی یەکشەممە و سێشەممە لە مزگەوتی گەورەی حەلەب ئەنجام بدرێ. سوهرەوەردییش بە ڕوویەکی خۆشەوە ئەم پێشنیارەی قبوڵ کرد.





زاهیر شا وەڵامی بۆ سوهرەوەردی نارد، کە چەند لە توانایدایە، ئاگای لە قسەکانی بێت و پایە و پێگەی زانا ئایینییەکان لەبەرچاو بگرێت. وریا بێت، قسەی ناڕوون و دژ بە شەرع نەڵێت، ئەگینا شا لەو حاڵەتەدا ناتوانێ بەرگریی لێ بکات. هەر زوو هەواڵی دادگایی و شوێنی کۆبوونەوە و گفتوگۆکە لەناو شاری حەلەبدا بڵاو بۆوە. یاران و نەیاران، هەموو بە شەوقەوە چاوەڕێی یەکەمین کۆڕی دادگاییکردنی سوهرەوەردی بوون.

# چارەنووسی شۆکەران*

"لە سوکرات گەڕێ و ئەمڕۆ دەگەڵ ئێمە بە
ئێمە میراتگری چارەنووسی شۆکەرانین"

لە یەکەم چرکەساتی خۆرکەوتنەوە، زانایان و قوتابیان، بۆ ئەوەی بتوانن جێیەکی گونجاویان دەست بکەوێ و بەباشی گوێیان لە قسەکانی هەردوو لا بێت، ڕوویان کردبووە مزگەوتی گەورە. خەڵکێکی ئاساییش بۆ ئەوێ چووبوون، بەڵام ڕێگەیان پێ نەدرابوو بچنە ناو مزگەوتەکەوە. خۆر هەڵاتبوو و خەریک بوو هەواکە گەرم دەبوو. ئەوانەی لە حەوشەی مزگەوتەکەدا کۆ بووبوونەوە، چاوەڕێی هاتنی سوهرەوەردییان دەکرد. زانا گەورەکانی شار لەگەڵ لایەنگرەکانیاندا دەچوونە ژوورەوە و خەڵکەکە ڕێیان بۆ دەکردنەوە. لە هەموو لایەکەوە، دەنگی سڵاو بەرز بووبۆوە. زاناکان تەماشای ئەملاولایان نەدەکرد، ئەوان عادەتەن سەریان دانەواندبوو و سەیری بەرپێی خۆیان دەکرد. لەبەر خۆیانەوە تەزبیحاتیان دەکرد و جارجارەش وەڵامی سڵاوی ئەم و ئەویان دەدایەوە، بەتایبەتی گەر کەسێکی ئاشنایان تیا بووایە. جلەکانی بەریان سپی و پاک و تازە و کەشخە بوو.

---

* شۆکەران: ئەو ژەهرەی دەرخواردی سوکرات درا.

لەناکاودا دەروێشێکی سپیاڵپۆش لەگەڵ چەند مەئمووورێکدا و لەناو هەندێ لاوی قوتابی و لایەنگری خۆیدا دەر کەوت. بەو گەرمای هاوینە، فەرەنجییەکی لەبەردا بوو، دەرپێیەک تا سەر ئەژنۆ و قاچەکانی ڕووت بوون. وەکوو نەریتێکی کوردانە، کڵاوێکی سووریشی کردبووە سەر. سڵاوی لە هەمووان دەکرد و زەردەخەنەیەک لەسەر لێوی بوو. ئارام و هێور دەهاتە پێشچاو. دەتوت بۆ میوانی دەچێت و خەڵکی پێشوازیی لێ دەکەن. نەیانهێشت یاوەرەکانی لەگەڵیدا بچنە ناو مزگەوتەکەوە.

لە کاتێکدا هەندێ لە زاناکان بەبێبایەخی و بە ڕقەوە لێیان دەڕوانی، هاتە مزگەوتەکەوە و بەبێ ئەوەی چاوەڕێی فەرموولێکردنێکی کەسێک بێت، لە شوێنێکی گونجاودا دانیشت. زانا ئایینییە گەورەکان لە نزیک میحرابەکەوە، هەموو لەپەنا یەکدا و لە شێوەی لاکێشەیەکدا دانیشتبوون. دەوروبەریشیان هەر زانا و قوتابی بوو.

یەکێک لە زاناکان، کە پشتی لە میحرابەکە بوو و لە شوێنێکی بەرزتر لەوانی دی دانیشتبوو، ڕووی کردە شێخ مەجدەدین و وتی، "چاوەڕێی چی دەکەن؟ بۆ دەست پێ نەکەین؟"

شێخ مەجدەدین کە ئەمەی بیست، لە جێی خۆی هەستا و وتی، "بە ناوی خوا و سڵاو لە گیانی محەمەد و ئالی محەمەد و ئەسحابەکانی و بە ئیجازەی زانایانی پایەدار، کە ئامادەی ئەم کۆڕە بوون، ئەو زانایانەی واریسی پەیامبەرەکان و پارێزەری شەرعی پێغەمبەرن، دروودی خوای لێ بێت.

"زانایان و مامۆستایانی گەورەی شار، هەر وەکوو





دەزانن ئێمە لەم ڕۆژانەدا ڕووبەڕووی فیتنەیەک بووینەتەوە، کە ڕۆژبەڕۆژ مەترسیی گەورەتر و بازنەی ئاگری فراوانتر دەبێت. هۆکار و سەرچاوەی سەرەکیی ئەم فیتنەیەش، کەس نییە، جگە لەم پیاوە غەریب و نەناسەی نە دەزانین نەژاد و بنەچەی چییە و نە نیاز و ئامانجی، ئێستاش، من بە ئیجازەی ئێوەی بەڕێز، داوای لێ دەکەم خۆی بە ئامادەبووان بناسێنێت، تا زیاتر پێی ئاشنا ببن و گفتوگۆکەمان دەست پێ بکەین."

سوهرەوەردی هەستا و لە کاتێکدا بە ئارامی و متمانەوە سەیری ئامادەبووانی دەکرد، وتی، "بە ناوی خوا و درووود لە ڕۆحی پاکی ئەو خواجەیەی پرشنگی تیشکی پەیامبەریی، پەردەی تاریکی کفری لەسەر ڕووی جیهان هەڵماڵی. درووود لە یار و یاوەرانی.

"سەروەرانی هێژا و برایانی دینی! من ناوم یەحیایە و لە سوهرەوەرد هاتوومەتە دنیاوە. جگە لە زانستخوازی و عەودالبوونی زانین، هیچ کارێکی ترم نییە. لەو کاتەوەی هۆش و گۆشم کردۆتەوە، تەنانەت بەر لەوەی باڵقیش ببم، زێد و باوەشی گەرمی دایک و باوکمم لەپێناوی خوێندن و زانستدا بەجێ هێشتووە و شارەوشارم کردووە بەدوای هەرکەسێکدا، کە شتێکم فێر بکات یان لە خەفڵەتێک بێدارم بکاتەوە. باوەڕم بە هەرشتێک هەبووبێت، لەسەر بنەمای هەقبوونی ئەو شتە بووە، نەک لەسەر بنەمای دەمارگیری و مەبەست یان هەر دەردێکی تر. هەر گفتوگۆیەکیشم کردبێت، یا قسەیەکم لە قسەی زانایەک یان کەسێکی پایەداردا کردبێت، تەنها لەبەر ئەوە بووە، کە پەردە لە ڕووی هەقیقەتێک هەڵبماڵم یا شتێکی نەزانراو کەشف بکەم. ئێستا کە تەمەنم نزیکەی سیوهەشت

سالێک دەبێت، سی سالیم لەم پێناوەدا بردۆتە سەر و ساتێک چییە، لەم ئامانجە بەرزە خافڵ نەبووم. بەدرێژاییی ئەم سی ساڵە، بە پێی پەتی و بێ نان و زاد و توێشوو، لە هەرکوێیەک تروسکاییەکی زانست و زانینم شک بردبێت، بۆی چووم. بەڵام مەخابن، ئەوەی من عەودالی بووم، لە کەسم دەست نەکەوت. بۆ هەرکوێیەک دەچووم، جگە لە مشتێک زانیاریی نەقلی یا ئەقڵیی دەستەبەندیکراو و جێگیر و هاوچەشن، هیچی ترم دەست نەکەوت.
"ئازیزان، بە هەمان ئومێد و ئارەزووشەوە ڕووم کردە شارەکەی ئێوە. لە حزووری گەورەکانی شاردا کەوتمە سەر ئەژنۆ و بوومە قوتابییان. بەڵام زێدەڕۆیی نییە گەر بڵێم، هیچ شتێکی تازەیان لێوە فێر نەبووم. سەرەنجام، سەیرم کرد کەسانێک دوژمنایەتم دەکەن و بە هەموو شێوەیەک دەیانەوێ سووکایەتیم پێ بکەن و هێرش بکەنە سەر کەسێتیم و ئازارم بدەن. ئێستاش ئەگەر نیازمان ڕوونکردنەوەی هەقیقەتە، هیوادارم بە دڵێکی پاک و بە میهرەبانییەوە پرسیارم لێ بکەن و واقیعبینانە و بە ویژدانەوە گوێ بۆ وەڵامەکانم شل بکەن. ئینجا عادیلانە و لە ڕووی ئەقڵەوە داوەری بکەن. دیسانەوە دەمەوێ ئەوەتان پێ بڵێم، کە مەبەستی من لە ئامادەبوونم لە کۆبوونەوەیەکی لەم جۆرەدا، جگە لە ڕوونکردنەوەی هەقیقەت، هیچی تر نییە. من کابرایەکم، نە دوای پلەوپایە کەوتووم و نە دوای ماڵی دنیا. قەلەندەرێکم، بە ڕۆژ بەدەوری جیهاندا دەسووڕێمەوە و بە شەویش بەردێک دەکەم بە سەرین.

"گەرچی تۆزی هەژاری لە دامێنم نیشتووە، لە هیممەتم شەرم ئەکەم





"گەر بمەوێ بە ئاوی کانیاوی خۆر، دامێنم تەڕ بکەم
"من کە لەم دونیای گەداییەدا، گەنجی شاهانەم وا لە دەست
"چاوەڕێی چ شتێ لە چەرخی گەردوونی دوونپەروەر ئەکەم

"من ڕێبوارێکی بچووکم و ڕابەرێکم هەیە، ڕووناکبینتر لە چاوی خۆر و خەیاڵئەنگێزتر لە ڕوخساری مانگ و هەر لە سای عەشقی ئەوەوەیە، کە زیندووم.

"گەر ئاگر بە عاشقان ڕەوا ئەبینن، میهری یارانە
"هەنگینێ گەر چاو ببڕمە کەوسەر، بەرچاو تەنگم

"دواجار، چاوەڕێی ئەوەم لێتان هەیە، کە لەبری دەنگەدەنگ و غەڵبەغەڵب، هەرجارە یەکێک گفتوگۆم لەگەڵدا بکات. تەنها لەگەڵ یەکێکدا قسە بکەم و ئامادەبووان گوێمان لێ بگرن. هەروەها ئەو باسوخواسانە دووبارە نەکەینەوە، کە بە ئامادەبوونی شا خۆیشی لە کاتی وانەکاندا گفتوگۆمان لەسەر کردوون. تەنها ئەو مەسەلانە باس بکرێن، کە بوونەتە جێی گومان. هەر ڕاوبۆچوونێکی تریشتان هەیە، دەتوانن بیخەنە ڕوو و گەر پرسیارێکیش هەیە، ئامادەم وەڵامی بدەمەوە."
شێخ مەجدەدین هەستایە سەر پێ و وتی، "لەسەر پێشنیاری زانا بەڕێزەکان، دوێنێ شەو لە ماڵی سەروەرمان، جەنابی شەریف ئیفتیخارەدین، بە ئامادەبوونی هەشت کەس،کۆبوونەوەیەک ڕێک خرا. لەم کۆبوونەوەیەدا ئەو بابەت و مەسەلانە پۆلێن کران، کە مایەی فیتنەن. یەکەیەکە

ئەو مەسەلانەت لەگەڵ باس دەکەین. هەروەها لە هەمان کۆبوونەوەدا، بڕیار درا قازی ڕوکنەدین بەرامبەرتان دابنیشێت و لە کۆبوونەوەکاندا هەندێ مەسەلە بخاتە ڕوو. بۆ ڕێگرتن لە جیاوازیی بیروڕا و هەروەها لە بەکارهێنانی هەرجۆرە مەیل و کینەیەکی تایبەتی، دە زانای ناوداری شار دیاری کراون، کە زۆر بەوردی گوێ بۆ گفتوگۆکان ڕادێرن و دوابۆچوونی خۆیان تۆمار بکەن. دوای کۆتاییهاتنی وتووێژەکان، لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتدا، ئەو بڕیارە بە زانایان و باوەڕداران ڕادەگەیەنن، کە زۆرینە دەنگی لەسەر دەدەن و پاشان بۆ فەرمانی جێبەجێکردنەکەی ڕادەستی جەنابی زاهیرشای دەکەن، خوا پایەداری بکات. ئێستاش داوا لە قازی ڕوکنەدین دەکەین، کە بفەرموون بۆ ئەو شوێنەی لە ناوەڕاستدا بۆی دیاری کراوە. داوا لە سوهرەوەردییش دەکەین، کە ڕووبەڕووی دابنیشێت."

قازی ڕوکنەدین دوای حەمد و سەنا، داوای لە خەڵکەکە کرد بێدەنگی بپارێزن و ڕێوڕەسمی کۆبوونەوەکە لەبەرچاو بگرن. ئینجا ڕووی کردە سوهرەوەردی و وتی، "تۆ باوەڕت بەوە هەیە، کە ئایینی ئیسلام ناسیخی هەموو ئایینەکانی ترە؟"

"بەڵێ!"

"ئەی کەواتە بۆچی لە کتێبەکانتدا ئەوەندە باسی ئایینی زەردەشت دەکەیت و بانگەشە بۆ زیندووکردنەوەی ئایینێک دەکەیت، کە تەنانەت گومان هەیە لەوەی ئایینێکی ئاسمانییش بێت؟ زیندووکردنەوەی فرەخودایی و دووانەپەرستیی مەجووس لە کۆمەڵگەیەکی یەکتاپەرستدا، چ مانایەکی هەیە





و بە چ مەبەست و ئامانجێکە؟ هەرکەسێک بە نووسینەکانت ئاشنا بێت، یان ماوەیەک لەگەڵتدا هەڵسوکەوتی کردبێت، دەزانێ تۆ چەند شەیدای ئەو ئایینە مەنسوخ و نادروستەیت. تەنانەت لە هەندێ نووسینتدا، دەسکاریی ئایەتی قورئانت کردووە، بە جۆرێک، کە لە خزمەتی پایەمبەرێتیی زەردەشتدا بێت. ئێستا لە ژووری ئەم گەورەپیاوانەدا، کە زۆربەیان بە نووسین و لێدوانەکانی تۆ ئاشنان، چ وەڵامێکت هەیە؟ چاوەڕێی ڕوونکردنەوەکانتین."

سوهرەوەردی بەهێمنی و بە ڕێزەوە وتی، "من لە حزووری هەموو ئەم بەڕێزانەدا دان بەوەدا دەنێم، کە حەزرەتی موحەمەد، دروودی خوای لێ بێت، دوایین پێغەمبەرە و بە دینەکەی ئەو، دینەکانی تر مەنسوخ بوون. بەڵام ئەوەی لە کتێبەکانمدا باسم لە زەردەشت و دانایانی تر کردووە، من لە هەموو شوێنێک بەئاشکرا وتوومە کە ئەوەی بەلای منەوە گرنگە، حیکمەتی ئەو دانایانەیە، نەک ئەو دووانەپەرسیتییەی دەستەیەک لە مەجووس ئاخنیویانەتە ناو ئایینی زەردەشتەوە. ئەگینا خودی زەردەشت خۆی، یەکتاپەرست بووە. سەبارەت بەوەش کە من دەسکاریی ئایەتی قورئانم کردووە، ئەمە تۆمەتێکی ناڕەوایە. ئەوەی هەیە ئەوەیە، کە من دێڕێکم هەیە بەڕێکەوت هەندێ وشەی تیایە، لە قسەکانی قورئان دەچن. من لە شوێنێکدا وتوومە، ‹لە ئێران کۆمەڵێک هەن، کە خەڵکی بۆ هەق ڕێنمایی دەکەن و بە هەق داوەری دەکەن.› ئەم دەستەواژەیەی من بەم ئایەتەی قورئان دەشوبهێنن، کە دەفەرموویت، ‹کۆمەڵێک لە خولقێنراوانی ئێمە هەن، کە خەڵکی خوا ڕێنمایی دەکەن و بە

هەق داوەری دەکەن.› ئەگەر مەبەستمان بێت ڕەخنە بگرین و بەدوای بیانوودا بگەڕێین، لە نووسینەکانی هەرکەسێکدا، دەتوانین ئەم جۆرە شتانە بدۆزینەوە. بەلای منەوە، هیچ جیاوازییەک لەنێوان حەکیمانی ئێران و یۆناندا نییە. ئەوەی گرنگە، خودی حیکمەتەکەیە. من لە حیکمەتولئیشراقدا هەوڵم داوە حیکمەتی حەکیمانی کۆنی ئێران زیندوو بکەمەوە، نەک شتێکی تر! ئەفلاتوون و حەکیمانی بەر لەویش، جەختیان لەسەر ئەم حیکمەتە کردۆتەوە. ئایینی ئیسلامیش ڕێگەی داوە، حیکمەت لە هەرکوێیەک بێت، سوودی لێ وەر بگرین. سەبارەت بەوەی دەشوترێ کە من هەندێ حەکیم بە پەیامبەر دەزانم، دەمەوێ بڵێم، کە بە گوێرەی هەندێ ڕیوایەت، سەد و بیستوچوار هەزار نێردراوی خوا بۆ مرۆڤایەتی هەبووە، بەلام بەپێی دەقە بڕواپێکراوەکانی خۆمان، ناتوانین ناوی زیاتر لە بیست پێغەمبەر بزانین. چ بەڵگەیەک هەیە ڕێمان لێ بگرێ لەوەی، بۆ نموونە، ناوی کەسانێکی وەکوو زەردەشت و کیومەرسیش بخەینە ناو لیستی ئەو پەیامبەرانەوە؟ دەڵێن پادشایەک بە زانایەکی وت، ‹ئەگەر ناوی هەر سەد و بیستوچوار هەزار پێغەمبەرەکەم پێ بڵێیت، ئەوا بۆ هەریەکێکیان، درهەمێکت دەدەمێ.› ئەویش چەند کردی و کۆشا، ناوی هەڤدە-هەژدە پێغەمبەر زیاتری نەزانی. لەبەر ئەوەی دەیویست پارەکەشی لەدەست نەچێت، ناوی شەداد و نەمرودیشی خستە ڕیزی پێغەمبەرەکانەوە!"

غەڵبەغەڵبێک لەناو زاناکاندا پەیدا بوو، کە نیشانەی نارەزاییان بوو لە قسەکانی سوهرەوەردی و بەتایبەتییش بەم قسەیەی دوایی. سوهرەوەردی، کە زانیی بووە بە





غەڵبەغەڵب، ئیستێکی کرد و پاشان بەم جۆرە درێژەی بە قسەکانی دا، "من بەو جۆرەی زانایان باس لە خەتمی پەیامبەری دەکەن، قبوڵمە، بەلام باوەڕم وایە، کە هەندێ لە حەکیمان، چ لە ڕابردوو و چ لە ئاییندەدا، لە ئیلهامی ڕۆحی بەهرەمەند بوون و دەشبن. ئەم مەسەلەیەش پەیوەندیی بە خەتمی پەیامبەرییەوە نییە. حەکیمە گەورەکانی هەموو سەردەمێک، هەر لە ڕێی ئیلهام و بەخششی هەقەوەیە، کە دەستیان بە زانست و زانینە بالاکان دەگات. تا مرۆڤ هەبێت و تا مرۆڤ جێگرەوەی خودا بێت لەسەر زەوی، ئەم جۆرە پەیوەندی و ئیلهامە هەر لەئارادا دەبێت. ئاگری عەشق شتێک نییە سارد بێتەوە و گڕی عەشق خامۆش نابێت. لە سای ساقییەوە، گوڵڕوخسارانی بەزمی پیرۆز و مانا، هەرگیز لە کار ناکەون. ئێوەش، لەبری ئەوەی نکووڵی لە زەوق و مەستیی کەسانی دی بکەن، خۆتان هەنگاو هەڵێنن و جامەکە بگرن و خۆتان تاقیی بکەنەوە!"

لێرەدا، ڕوکنەدین ئاماژەی کرد، کە کاتەکە تەواو بوو و دەبێ کۆتایی بەم دانیشتنە بهێنن، چونکە کاتی نوێژە.

## من چیم لەو فەرمانڕەوا شەللاتییانە کەمترە؟

دره‌ختم، لقوپۆپم ڕووناکییه
ڕه‌گوڕیشه‌م ئاوی له خۆر گرتووه
ئه‌مه‌وێ نوێژی ڕۆشنایی بکه‌م
له حه‌وزی مانگه‌شه‌و، ده‌سنوێژم گرتووه

کۆبوونەوەی دووەم لە کۆبوونەوەی یەکەم قەرەباڵغتر بوو و دەنگەدەنگی زیاتری تیا بوو. ئەم جارە بە فەرمانی هەشت کەسە هەڵبژێردراوەکە، قوتابییە لاوەکانیش وەکوو خەڵکە ئاساییەکە نەکرانە ژوورەوە. لە ترسی ئەوەی نەبادا بکەونە ژێر کاریگەریی قسەکانی سوهرەوەردییەوە. ئەم جارەیان قازی ڕوکنەدین بەم جۆرە دەستی پێ کرد، "شەهابەدین سوهرەوەردی! لە کۆبوونەوەی یەکەمدا مەسەلەیەک خرایە ڕوو و وەڵامی تۆمان بیست. ئێستاش هەندێ مەسەلەی تر دەخەینە ڕوو. تکایە وەڵامەکانت با کورت و ڕوون بن. خۆتان لە بابەتی لابەلا بپارێزن و کات بەفیڕۆ مەدەن. زانایان دەیانەوێ درێژە بە باسەکەی کۆبوونەوەی یەکەم بدەین، واتە هەوڵی ئێوە بۆ زیندووکردنەوەی ڕێنماییەکانی زەردەشت. تۆ لە حیکمەتولئیشراقدا، جیهانت بۆ ڕووناکی و تاریکی دابەش کردووە و ئەمەش هەمان دووانەپەرستیی زەردەشتییە. گەر وا نییە، ئەی لەبەر چی؟

"بە ناوی خودای تاک و تەنیاوە! دابەشکردنی جیهان بۆ ڕووناکی و تاریکی کاتێک بە دووانەپەرستی دەژمێردرێ، کە بۆ هەریەکەیان، خودایەک دابنێین؛ خودای ڕووناکی و خودای تاریکی. بەڵام من لە نووسینەکانمدا ئەم دووانەم بە یەک خوداوە بەستۆتەوە. لە قورئانی پیرۆزیشدا، باس لە ڕووناکی و تاریکی کراوە، ‹خودا باوەڕداران لە تاریکییەوە دەباتە نێو ڕووناکی.› یان ‹خودا ڕووناکیی ئاسمانەکان و زەوییە.› لە حەدیس و نزاکانیشدا بە هەمان شێوە. وەک چۆن باوەڕهێنان بە چاکە و خراپە نابێتە مایەی دووانەپەرستی، بە هەمان شێوە، باوەڕهێنان بە ڕووناکی و تاریکییش نابێتە مایەی دووانەپەرستی."

سوهرەوەردی بێدەنگ بوو و ڕوکنەدین وتی، "مەسەلەیەکی تر ئەوەیە، کە باوەڕی تۆ سەبارەت بە خیلافەت و ئیمامەت، بە پێچەوانەی باوەڕی ئەهلی سوننەتەوەیە و لەگەڵ بیروباوەڕی شیعەکان و ناخگەراکاندا* یەک دەگرێتەوە. تۆ بۆ هەر سەردەمێک، کەسێک بۆ فەرمانڕەوایی بە شایستە دەزانیت، کە هەم لە زانستە پەیجۆرییەکان و هەم لە زانستە زەوقییەکاندا، واتە لە حیکمەت و فەلسەفەدا باڵادەست بێت. لە کاتێکدا زانایانی ئەهلی سوننەت وا ناڵێن."

سوهرەوەردی زۆر لەسەرخۆ وتی، "هیوادارم مەسەلە زانستییەکان تێکەڵ بە شتی سیاسی نەکەن. سەروەرینە! ئەوەی کە ئێستا خیلافەتی موسڵمانان لە جیهانی دەرەوە و لە ڕاستیدا لە دەستی عەباسییەکاندایە، قسەیەکم نییە. قوتابییەک لەکوێ لە توانایدایە خەلیفەیەک لەسەر حوکم لا

---

* ناخگەرا: باطني





ببات و خەلیفەیەکی تر بخاتە جێی. هیچ سوڵتان و میرێک، لە هیچ شوێنێکی ئەم دنیایە، بە فەتوای من و ئێوە سەڵتەنەت و میرنشینیی بەدەست نەهێناوە، نەخاسمە خەلیفەی موسڵمانان لە بەغداد. هەر وەکوو یەعقوب لەیس وتوویەتی، ئەو شتەی بۆ حوکمڕانی دەوری سەرەکی دەبینێت، شمشێرە و بەس. چ خەلیفە لە بەغداد و چ یەعقوب لە نیشابوور، هەردووکیان یەک سەرچاوە و پاڵپشتیان بۆ حوکمڕانی و هەقبەخۆدان هەیە، کە ئەویش ستەم و شمشێرە.

"سەروەرینە! ئەگەر قەرار بێت ئەقڵ و شەرع ڕەچاو بکرێ، ئەوا لەو حاڵەتەدا فەرمانڕەوا دەبێ خاوەنی مەرجی پێویست بێت بۆ ئەو کارە و بنەڕەتیترین مەرجیش، زانست و تەقوایە. ئەمەش هیچ پەیوەندییەکی بە شیعەوە نییە. زانایانی سوننەش جێگرتنەوەی پێغەمبەر بە کاری هەموو کەسێک نازانن. لەناو حەکیمە گەورەکانی ئیسلامیشدا، فارابی، حیکمەت و دانایی بە مەرجی سەرەکی دەزانێت بۆ فەرمانڕەوا.

"بە کورتی، ئەگەر کاری فەرمانڕەوا ‹زۆرداری و دەستبەسەرداگرتن› بێت، ئەوا حکوومەت شایانی ئەوانەیە، کە دەسەڵات قۆرخ دەکەن بۆ خۆیان. بەڵام ئەگەر ئەرکی فەرمانڕەوا ‹مشوورخواردنی کاروبارەکانی دین و دنیا›ی خەڵک بێت، ئەوا بێگومان دەبێ کەسانێک بیگرنە ئەستۆ، کە لە هەموو ئەوانی تر داناتر بن و لە ڕووی ڕەفتار و پەروەردەوە، لەوانی تر بەئاگاتر بن. ئەگینا گەر دەسەڵات بکەوێتە دەستی کەسانێکی ناشایستە، وەکوو ئەوە وایە گوێزان بدەیتە دەست کەسێکی شێت."

ڕوکنەدین، کە پێدەچوو تووڕە بووبێت، وتی،

"سوهرەوەردی! تۆ کە هیچکام لە فەرمانڕەوایان بە شاییستەی فەرمانڕەوایی نازانیت و فەرمانڕەوایی تەنها بە کاری کەسانێک دەزانیت، کە لە زانستە پەیجۆری و زەوقییەکاندا لە سەروو هەموو ئەوانی ترەوە بن، کەواتە پێدەچێ جگە لە خۆت، کەسی تر بە ئەهلی فەرمانڕەوایی نەزانیت. بەم پێیە، خۆت بە شاییستەترین کەس دەزانیت، کە لە ڕووی کردەیی و زانستییەوە ڕابەریی کۆمەڵگە بکات. بیرت لەوە نەکردۆتەوە، ئەگەر خەڵکێکی نەزان باوەڕ بەم قسانە بکەن، چ فیتنەیەک هەڵدەگیرسێت؟ بێگومان فیتنەیەک هەڵدەگیرسێت، گەورەتر لە فیتنەکەی فاتمییەکان لە میسر."

بەرلەوەی سوهرەوەردی وەڵام بداتەوە، شێخ حوسام ئامەدی لە جێی خۆی هەستا و داوای کرد ڕێی بدەن، تا جەخت لەسەر قسەکانی ڕوکنەدین بکاتەوە. ڕوکنەدین وتی: "فەرموون."

شێخ حوسام وتی، "من زۆر جار لە سەیفەدین ئامەدیم بیستووە وتوویەتی، سوهرەوەردی گەرچی پیاوێکی خوێندەوارە، بەڵام کەسێکی ئاقڵ نییە (ئامادەبووان پێدەکەنن) و خوازیارە فەرمانڕەوای هەموو دنیا بێت. سەیفەدین دەیوت، لێم پرسیوە ئەم بیرۆکەیەت لەکوێوە بۆ هاتووە؟ لە وەڵامدا وتوویەتی، ‹خەونم دیوە، هەموو ئاوی دەریام خواردووەتەوە› و ئەمەشی بە ئاماژەیەک بۆ حوکمڕانیی هەموو دنیا لێک دەدایەوە. تەنانەت سەیفەدین دەیوت، من بە سوهرەوەردیم وتووە، کە دەشێ خەونەکەت ئاماژە بێت بۆ ئەوەی ناوبانگی زانست و زانینت لە دنیادا دەنگ دەداتەوە، بەڵام ئەو بەمە قاییل نەدەبوو."





لە کاتێکدا زاناکان کردیان بە غەڵبەغەڵب، ڕوکنەدین ئاماژەی بۆ شێخ حوسام کرد، کە دابنیشێت، پاشان ڕووی کردە سوهرەوەردی و وتی، "باشە، ئێستاش ئەگەر ئێوە قسەیەکتان لەم بارەیەوە هەیە، بەکورتی بیڵێن."

"ئێوە کە پرسیارەکەتان ئەوەندە درێژە، چاوەڕێ مەکەن وەڵامەکەی من کورت بێت. من ئێستاش باوەڕم وایە، پلەبەرزترین زانا ئەو زانایەیە، کە لە یەک کاتدا ئاگاداری دنیای دەرەوە و دنیای ناوەوەش بێت و هەم لە زانست و هەم لە زەوقدا، بە یەک ئەندازە بەهرەمەند بێت. بەڵام ئەوەی میرەکان و زانایانی سەردەمەکەم بە شاییستەی پلەوپایەکانیان نازانم، لەم بارەیەوە ڕوونکردنەوەیەکی کورتم هەیە. ڕەنگە من لەم ڕووەوە بە هەڵەدا چووبم، گەر وا بوو، لە ئێوەی گەورە و بەڕێز داواکارم، ڕێنماییم بکەن. سەرەتا باس لە فەرمانڕەوایان دەکەم: ئامانج لە ناردنی پەیامبەران ئەوە بوو، کە کۆتایی بە فەرمانڕەواییی زۆرداران و ستەمکاران بهێنن و خەڵکی لە کۆیلایەتیی ئەوان ڕزگار بکەن و جگە لە خوا، سەر بۆ کەس دانەنەوێنن. ئەو پەیامبەرانە دەیانویست خەڵکی بۆ چینی نزم و چینی خانەدان دابەش نەبن و هەموو لە مافدا یەکسان بن. من لە ئێوە دەپرسم، چ فەرمانڕەوایەک هەیە ئەم ئامانجانەی هێنابێتە دی؟ هەر لە خەلیفەوە بگرن تا میرەکان و فەرمانڕەوای شارەکان و لێپرسراوان و زانا ئایینییەکان. هەریەکێک لەمانە، ژیانێکی فیرعەونییانەی بۆ خۆی دابین کردووە. هەموو ئەمانە، ژیانیان لە خەڵک کردووە بە دۆزەخ و بۆ خۆیشیان بە بەهەشت."

ڕوکنەدین، کە سەرنجی دا لەناو زاناکاندا بوو بە

دەنگەدەنگ، بەتوندی بە سوهرەوەردیی وت، "بەڕێز! تۆ لێرەدایت، تا بەرگری لە خۆت بکەیت، نەک تاوان و گوناهی تر بخەیتە سەر تاوان و گوناهەکانت. کوا زانا و میری ئێمە وەکوو فیرعەونن؟"

سوهرەوەردی بە ئارامییە وتی، "من دەمەوێ قسەکانم ڕوونتر بکەمەوە، تا هەر وەکوو ئێوە دەڵێن، گوناهی تر نەخەمە سەر گوناهەکانم. سەروەرینە! خۆتان لە من باشتر دەزانن و بە چاوی خۆتان دەیبینن، کە چۆن چینێک بە ناوی فەرمانڕەواییەوە هەرچیی داهاتی ئەم مەملەکەتەیە، بۆ خۆیانیان قۆرخ کردووە و چۆن فیرعەونانە دەژین و یاری بە چارەنووسی خەڵک دەکەن و خۆیان بە خوای ئەم مەملەکەتە دەزانن. ئاخۆ فەرمانڕەوایی کۆمەڵگە و مەملەکەت ئاوا دەبێت؟ سەبارەت بەوەش کە من خۆم بۆ فەرمانڕەوایی بە شیاو دەزانم، گریمان وایە، چ کێشەیەک لەوەدایە؟ من چیم لەو فەرمانڕەوا شەلاتییانە کەمترە، کە ئەوان لە ڕێی زۆر و ستەمیشەوە گەیشتوونەتە دەسەڵات؟ هەر جاهیل و نەخوێندەوارێک دەگاتە کورسیی دەسەڵات، هەموو کڕنووشی بۆ دەبەن و دەکەونە مەدح و سەنای. جا لە حاڵەتێکی وادا، من بم باشترە یان ئەوانە؟ من ئەگەر ئارەزوویەکی لەو جۆرەشم هەبێت، تەنها بەو ئامانجەیە کە کار بۆ ئەوە بکەم، دەسەڵات لە دەستی کەسانی ناشایستە بسەنمەوە و خەڵک لە دەستی ئەم ستەمکارانە و ئەم بە ناو زانایانە بپارێزم. سوپاس بۆ خوا، کە ئامانجم ماڵی دنیا و پلەوپایە نییە."

ڕوکنەدین قسەکانی بە سوهرەوەردی بڕی و وتی، "دەڵێی جگە لەو قسانە، هیچ قسەیەکی ترت پێ نییە بۆ





وتن، بۆیە وا قسەی هەڵەقومەڵەق دەکەیت. تۆ بۆت نییە ڕەخنە لە میران و زانایان بگریت، چونکە تۆ خۆت کاری وات کردووە، کە مایەی گاڵتەجاڕییە. تۆ تا ئێستا باوەڕت بە یەک قیبلە نییە. دەیان کەس تۆیان بینیوە بەیانییان زوو، لە کاتی خۆرکەوتندا، سوجدەت بۆ خۆر بردووە و کەوتوویتە ڕازونیاز لەگەڵیدا. ئەمە ئەگەر خۆرپەرستی نەبێت، چیی ترە؟ ئەگەر قسەیەکت هەیە، بیڵێ و گەر نا، تۆ و فەرمانڕەوایی، کوجا مەرحەبا! تۆ وڕێنە دەکەیت."

سوهرەوەردی لەنێو پێکەنینی زاناکان و گاڵتەپێکردنی هەندێ لە ئامادەبووانداً، بەئارامی وتی، "من وەک موسوڵمانێک، هەموو بنەماکانی شەریعەتم پێ قبوڵە و هەموو ئەو شتانەش، کە ئەرکی سەرشانمان. بەڵام وەکوو حەکیمێکیش، بە بنەما و مەسەلەکانی حیکمەتەوە پابەندم، وەک چۆن ئیبن سینا بە بنەماکان و ڕێساکانی فەلسەفەی مەشائییەوە پابەند بوو و ئەم کارەشی شتێک نەبوو، دژ بە موسوڵمانبوونی ئەو بێت. بۆیە منیش بە بنەما و مەسەلەکانی حیکمەتی ئیشراقەوە پابەندم. لە ڕێبازی ئیشراقییەکاندا، بەرزڕاگرتنی خۆر، کە سەرچاوەی ڕووناکی و گەرمییە، کارێکی پێویستە. بە گوێرەی ئەم ڕێبازە، ئادەمیزادەکان هەموو بەدوای ڕووناکیدا وێڵن و لە تاریکی هەڵدێن. نوێژی ڕووناکی دەکەن و لە ئەستێرکی مانگەشەودا خۆیان دەشۆن. تینووی قومێک نوور و ئیشراقن."

ڕوکنەدین ئاماژەی کرد، کە گفتوگۆ بەسە و کاتی نوێژە. پاشان دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و وتی، "خودایا! بمانبەخشە و ئیمانمان بدەرێ."

# دوابەرگری

چەشنێ بەدەم ناوی تۆوە هاوار ئەکەم
بەرەو سێدارە ئەمبا، دواجار، شەهامەتم

کۆبوونەوەی سێیەم هەفتەیەک دوا کەوت، لەبەر ئەوەی ژمارەیەک لە زانایان لەو پرکێشییەی سوهرەوەردی تووڕە بووبوون و ئامادە نەبوون بۆ کۆبوونەوەکە بێن. سەرەنجام، بەو مەرجەی دەبێ ئەمە دواکۆبوونەوە بێت و مەسەلەکە بە لایەکدا بخرێ، کۆبوونەوەکە ساز کرا. شالاوی خەڵکی بۆ بینینی سوهرەوەردی زیاتر بووبوو، لەبەر ئەوەی قوتابییەکان دەنگۆی جۆراوجۆریان سەبارەت بە لێدوانە توندەکانی ئەو بیستبوو. لە کاتێکیشدا زاناکان وەکوو بێگارێک و بە ڕوویەکی ترشەوە و درەنگتر گەیشتنە مزگەوتەکە، سوهرەوەردی لە جاران خۆشحاڵتر و هەر زووش لەوێ ئامادە بووبوو.

شێخ زەینەدین بە پەستییەوە داوای لە قازی ڕوکنەدین کرد، کە کۆبوونەوەکە دەست پێ بکات. ئەویش هەر زوو ڕووی کردە سوهرەوەردی و وتی، "شەهابەدین! بەڕێزان چیی دی حەز ناکەن کۆبوونەوەکە درێژەی هەبێت و بڕیار دراوە ئەمە دواکۆبوونەوە بێت. بۆیە ئەمە دوا دەرفەتە بۆت و دەبێ هەوڵ بدەیت کات بەفیرۆ نەدەیت. ئەگەر شتێکت پێیە بۆ ئەوەی بەرگری لە خۆت بکەیت، ئەوا بیڵێ، گەر نا، ئەوا

ئەوەی تا ئێستا وتووتە، نەک هەر بەرگری نەبووە، بگرە دۆخ و هەڵوێستی تۆی خراپتر کردووە. ئەو بەڕێزانە ڕایان سپاردووم، سێ-چوار پرسیارێکی ترت لێ بکەم:

"سوهرەوەردی! تۆ ئەو هەموو فتوحات و قوربانی و بەخششەی فەرمانڕەوایان و ڕێنمایی و چاکسازییەی مامۆستایانی ئایینیت بە هیچ دانا و بە خراپ باست کردن. تۆ مەبەستت لەمە چییە؟ جارێ وەڵامی ئەم پرسیارەمان بدەرەوە!"

سوهرەوەردی بەئارامی و بە خۆشحاڵییەوە وتی، "بە ناوی خوا، ئەو خۆشەویستە ئەزەلی و ئەبەدییەی بوونەوەران. ئەوەندەی بزانم، وەڵامی گونجاوی پرسیارەکانتم داوەتەوە و کاتم بەفیڕۆ نەداوە. بەڵام ئەوە ناشارمەوە، کە زۆربەی مامۆستایانی ئایینی کەسانێکی مەراییکەرن و لە بیستن و وتنی هەق دوورن. بۆیە هەموو قسەیەکی هەقیان لا ڕەقە. منیش بە ڕاستگۆییەوە باسم لە ڕەفتاری فیرعەونییانە و جاهیلانەی ئەوانیش کردووە."

بەم قسەیەی سوهرەوەردی، کە سووکایەتیپێکردنێکی ئاشکرا بوو بە زانایانی ئایینی، شێخ زەینولئیسلام تووڕە بوو و هەستا، چەند هەوڵیان لەگەڵی دا بمێنێتەوە، نەمایەوە و کۆبوونەوەکەی جێ هێشت. دوای ئەوەی دۆخەکە هێمن بووەوە، ڕوکنەدین وتی، سوهرەوەردی! دەڵێن تۆ کابرایەکیت، لافی پەرجوو و کەرامەت لێدەدەیت. گوایە بەهەشت پیشان بە یاوەرانت دەدەیت و ئاو دەکەیت بە دوو کەرتەوە! ئەم شتانە ڕاستن؟"





سوهرەوەردی بە دەمارساردییەوە وتی، "ئەم شتانە، نە سەیر و سەمەرەن و نە نائاساییں! ئەی کاتی خۆی حوزەیفە بە پێغەمبەری نەوتووە، کە لە ئەنجامی ئەو یەقینەوەی پێی گەیشتووە، "بەهەشتییەکان لە بەهەشت و دۆزەخییەکان لە دۆزەخ دەبینێت؟" من هەندێ جار لەگەڵ هەندێ کەسدا شتی لەم جۆرەم کردووە. سەبارەت بە دووکەرتکردنی ئاو، ڕۆژێکیان لەگەڵ هەندێ کەسدا، لای حەوزێک ئاوەوە دانیشتبووین. ئەوان باسیان لە پەرجووی پەیامبەران دەکرد و سەیریان لێ دەهات، چۆن کاتێ مووسا ئاوی کردووە بە دوو کەرتەوە. منیش بۆ بەهێزکردنی باوەڕی ئەوان وتم، ئەوە هیچ نییە و ئاماژەم بۆ ئاوی حەوزەکە کرد و کە سەیریان کرد ئاوەکە بووبوو بە دوو کەرتەوە و لەبەینی هەردوو کەرتەکەدا، بنی حەوزەکەیان بینی. ئەگەر ئادەمیزاد لە ئەنجامی خۆپەروەردەکردن و مەشقی ڕۆحییەوە بگاتە حاڵەتی "کن"، ئەم شتانە بەلایەوە ئاسایی دەبن! ئێوە نازانن ئادەمیزاد چ بوونەوەرێکی سەیروسەمەرەیە."

دیسانەوە لێرەشدا، دوو زانای تر، شێخ ئەحمەدی موسڵی و شێخ ئەبو ئیبراهیمی بەغدادی، هەستان و بە تووڕەییەوە کۆبوونەوەکەیان جێ هێشت. غەڵبەغەڵبێکی زۆر پەیدا بووبوو.

ڕوکنەدین بەزەحمەت بێدەنگی کردن و ئینجا پرسیارێکی تری لە سوهرەوەردی کرد، دەڵێن تۆ شەراب دەخۆیتەوە و خەڵکێکی زۆریش لە چەند شارێکی جیاواز تۆیان دیوە گوێ لە مۆسیقا دەگریت و گۆرانی دەڵێیت و سەما دەکەیت. تکایە وەڵامێکی کورتی ئەم پرسیارەشمان بدەرەوە، تا کاتی پێویستمان بۆ دواپرسیار بمێنێت، کە مەسەلەی خەتمی

پەیامبەرییە."

"بەسەر چاو! ئێوە بە فەرمانی کام شەریعەت خۆتان بە مەئمووری ئەوە دەزانن لەوە بپرسنەوە، کە کێ شەراب دەخواتەوە و کێ نایخواتەوە؟ تەنانەت ئەگەر شایەتیش هەبێت، ئەوە کاری قازییە لە سنووری شەرعدا بڕیاری لەسەر بدات. ئەگینا ئێوە، بە هیچ شێوەیەک بۆتان نییە لەو جۆرە مەسەلانە بکۆڵنەوە."

"باشە! دەمانەوێ بۆمان ڕوون بکەیتەوە!"

"ئێوە بۆچی دەتانەوێ بۆتان ڕوون ببێتەوە کە کەسێک شەراب دەخواتەوە یان نا؟ پێغەمبەرەکەتان بەردەوام جەختی لەسەر نهێنیپۆشیی باوەڕداران کردۆتەوە. هەرکاتێک نهێنیی کەسێکیان لا دەدرکاند، دەیوت، ‹من مافم نییە توونێل هەڵبکەنم، تا بچمە ناو دەروون و ناخی خەڵکەوە.› ئەو هەرگیز هەوڵی ئەوەی نەدەدا، بەدوای نهێنیی کەسانی تردا بگەڕێت و بیسەلمێنێت کە فلانە کەس کافرە یان خراپەکارە. کەچی ئەوانەی لافی ئەوە لێدەدەن کە جێی ئەویان گرتۆتەوە، ئیشوکاریان بووە بەوەی بەدوای نهێنیی خەڵکی تردا بگەڕێن و بەوە بیسەلمێنن، کە فلان کافرە و فلان خراپەکارە. من بە هەمووتان دەڵێم، کە موسڵمانم و باوەڕم بە یەکتاییی خوا هەیە. بەڵام پێتان ناڵێم شەراب دەخۆمەوە یان نا! چونکە ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بە ئێوەوە نییە. سەبارەت بە سەما و گۆرانییش، من لەگەڵ بۆچوونەکەی ئیمام محەمەدی غەزالیم و لەم ڕووەوە پەیڕەوی لەو دەکەم. کاتێکیش بە شکۆی جوانی مەست دەبم، ئیدی گۆرانی دەڵێم و سەماش دەکەم:





"گوڵ خەندەران پێنەکەنێ، چی بکا؟
"بەیداخی مسک نەشەکێنێ، چی بکا؟
"ماگی تابان جگە لە ناز و جوانی
"چی بنوێنێ؟ چی پەسەند کا؟ چی بکا؟
"خۆریش تیشک و نوور نەبەخشێ؟
"لەو گوومەزە بێهاوتایە چی بکا؟
"کاتێ سایە ڕوخساری خۆر بەدی ئەکا
"سوجدە نەبات و نەبزوێ، چی بکا؟

"ئەی ئەوانەی خۆتان بە گەورەی موسڵمانان دەزانن، ڕێم بدەن با دوو شتتان پێ بڵێم:

"یەکەم، ئەوەیە کە ئەوەندە بیر لە بەرگریکردن لە خوا مەکەنەوە، کەمێکیش بیر لە مرۆڤ و لە مرۆڤایەتی بکەنەوە! چونکە خوا خۆی دەسەڵاتدارە و پێویستیی بەوە نییە مرۆڤ بەرگریی لێ بکات! ئەوە مرۆڤەکانن کە ستەمیان لێ دەکرێ و مافیان دەخورێ و پێویستییان بە بەرگریلێکردن هەیە. خوای میهرەبان کە پێغەمبەری خۆی دەنێرێت، بۆ ئەوەیە خەڵکی ژیانێکی دروست و عادیلانەیان هەبێت، نەک بۆ ئەوەی خەڵکی فریای خوا بکەون. کاتێکیش ڕێ دەدات تاوانباران و خەتاکاران تەمێ بکرێن، هەر لەپێناوی ژیانی خەڵکدایە. کەمێک بیر لە ئینسان و کێشەکانی ئینسان بکەنەوە، نەک کێشەکانی خوا! کاری بەرپرسانی سیاسی و ئایینیش لە کۆمەڵگەدا، ئەوە نییە ببن بە حەسحەسی ئاکار و ڕەفتاریان، وەک ئەوەی کێ شەراب دەخواتەوە و کێ نایخواتەوە، یان کێ نوێژ دەکات و کێ نوێژ ناکات! بەڵکوو ئەرکی سەرەکیی ئەو بەرپرسانە،

جێبەجێکردنی عەدالەتە لەناو کۆمەڵگەدا و بەرگریکردنە لە مافەکانی خەڵک. ئێوە لەجیاتی لێپرسینەوە و دادگاییکردنی من و کەسانی وەکوو من، بچن لەوانە بپرسنەوە، کە خوێنی خەڵک دەمژن و چاویشی بۆ ناترووکێنن. گریمان من بۆ خۆم لە گۆشەیەکدا شەرابم خواردۆتەوە یان سەمام کردووە، ئەمەی من لەکوێ و بەفیرەونبوونی ئەوانە لەکوێ، کە خۆیان بە بەرپرسی دنیا و دینی ئەم مەملەکەتە دەزانن؟ بە هەزاران خێزانی برسی و هەژار هەن لەم مەملەکەتەدا، کە تا بڵێی گوزەرانێکی سەخت و تاڵیان هەیە. بەڵام برۆ سەیری ژیانی ئەو فیرعەونانەش بکە، کە لەسەر حیسابی ئازار و ژیانی ئەوانی تر چۆن بەردەوام خەریکی عەیش و نۆش و رابواردنن. من لێرەدا ئەو قسەیەی ئەبو حەنیفەتان دەهێنمەوە یاد، کاتێ هەندێ عێراقی لێیان پرسی ئاخۆ لە شەرعدا جەزای کوشتنی مێشوولەیەک و خوێنەکەی دەبێ چی بێت، ئەویش پێی وتن، ‹ئێوە حوسەینی کوڕی عەلیتان کوشت، بە خەیاڵتاندا نەهات، ئێستا باس لە خوێنی مێشوولەیەک دەکەن؟›

دیسانەوە بووەوە بە غەڵبەغەڵب، وەلێ ڕوکنەدین تکای لێ کردن، کە بێدەنگ بن، تا دواپرسیار ئاراستەی سوهرەوەردی بکات، کە پرسیارێکی زۆر گرنگە. ئینجا رووی تێ کرد و وتی، "سوهرەوەردی، تۆ دەربارەی خەتمی پێغەمبەرایەتی دەڵێیت چی؟"

"من موسڵمانم و باوەڕیشم بەوە هەیە، کە حەزرەتی موحەممەد (د.خ)، دواپێغەمبەری خودا بووە. ئەمە بەڵگەنەویستێکی دینی ئیسلامە."





"ئەی کەواتە تۆ بۆچی لافی ئەوە لێدەدەیت، کە فەرمانڕەوای هەر سەردەمێک، کە خەلیفەی خودایە، دەبێ لەلایەن خوداوە ئیلهامی پێ بدرێ و بەردەوام لە پەیوەندیدا بێت لەگەڵ خودادا؟"

"من باوەڕم بەوە هەیە، کە پێغەمبەرایەتی خەتم بووە و موحەمەدیش خاتەمی پێغەمبەرانە. بەڵام پەیوەندیی نێوان ناخ و ڕواڵەت، هەرگیز نەپچڕاوە و جیهانی ڕواڵەت هەمیشە پێویستیی بە جیهانی ناخە. بەکورتی، پەیوەندیی نێوان خودا و ئادەمیزاد هەمیشەییە و هەرگیز کۆتایی نایەت. گومانی تیا نییە، کەسێک کە ئەو پەیوەندییە توکمەیەی لەگەڵ خودادا هەبێت و لە نووری ئەو بەهرەمەند بێت، زیاتر شاییستەی ئەوەیە ببێتە ڕابەری خەڵک. حەکیمە گەورەکانی ڕابردووش، هەر لە ئەفلاتوونەوە تا فارابی، هەمان باوەڕیان هەبووە. هەر کاتێکیش جڵەوی کاروباری خەڵک لە دەستی فەرمانڕەوایانێکی حەکیمی لەم چەشنەدا بێت، ژیانیان بە ڕێگەیەکی ڕاستتر و ئاسوودەتردا دەڕوات."

ڕوکنەدین بە تووڕەبوونەوە وتی، "یانی بە بۆچوونی تۆ، بەتەنها قورئان خۆی وەکوو سەرچاوەیەکی زانین بەس نییە؟"

سوهرەوەردی وتی، "ئێمە هەمیشە پێویستمان بەوە هەیە کە لە زانینەکانی قورئان تێبگەین."

"بەڵام بە بۆچوونی تۆ، پێغەمبەرایەتی و ئیلهام دوای خەتمی پێغەمبەرایەتیش، شتێکی مەحاڵ نییە؟"

"بە شێوەیەکی ڕەها، نەخێر!

زانایانی ئامادەبوو لە کۆبوونەوەکەدا تێکرا پەست و

توورە بووبوون. هەموو بەدەم مقۆمقۆوە هەستان.

دواکۆبوونەوەش کۆتایی هات. بڕیار بوو گەورەزانایانی کۆبوونەوەکە، پاشنیوەڕۆ لە ماڵی ڕوکنەدین دابنیشن و ڕاوێژێک بە یەکتری بکەن و کۆبەندی دانیشتنەکەیان بنووسن و فەتوای دەستەجەمعیی خۆیان بدەن.



## دادگاییکردنی هەتاو

من لە هاودەمیی هەتاوەوە دێم
کە لە هەر هەڵهاتنێکا
بە ناوی غیرەتی عەشقەوە
ئایاتی ڕووناکی ئەخوێنێ
من لە هاودەمیی هەتاوەوە دێم
کە بە ڕاشکاوی و پەردەلادان لەسەر تاوان
تۆمەتبارە!

شێخ ئەبومەجدی حومسی، هەموو ڕۆژێک ڕاپۆرتی وردی کۆبوونەوەکانی دادگاییکردنەکەی دەبرد بۆ ئەبوحەفسی کاتب. ئەویش ئەو ڕاپۆرتانەی بە هەموو وردەکارییەکانیانەوە ڕادەستی زاهیرشا دەکرد.

ئەو ڕۆژە شا خەریکی خواردنی نانی نیوەڕۆ بوو، وەختێ سەرکارەکەی هات و پێی وت، کە ئەبوحەفس بەهەڵەداوان و بە نیگەرانییەوە هاتووە و دەیەوێ جەنابی ببینێت. زاهیرشا بەپەلە چوو بۆ ژوورەکەی تەنیشت کتێبخانە و ئەبوحەفس بە خەمباری و نیگەرانییەوە، وردەکارییەکانی کۆبوونەوەکەی ئەو ڕۆژەی بۆ باس کرد، "زاناکان ئەم پاشنیوەڕۆیە کۆ دەبنەوە تا دوابڕیاری خۆیان بە شێوەی ڕاگەیانراوێک بڵاو بکەنەوە."

شا، کە زۆر نائارامتر لە ڕۆژانی پێشوو دەهاتە بەرچاو، وتی، "ئەم کۆبوونەوەیەش لە هەمان مزگەوت دەبێت؟"

"نەخێر، گەورەم، لە ماڵی قازی ڕوکنەدین."

"دەبێ بە زووترین کات لەو بڕیارەیان ئاگادار بم و کە دەرفەتێکیش ڕەخسا، بە وریاییەوە ئەبومەجدی حومسی بهێنە بۆ لام."

زاهیرشا، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە، نائارام بوو. گەرچی هەواش گەرم بوو، بەڵام پشووی نەدا. بە هەیوانەکەدا دەهات و دەچوو. بێتاقەت و توورە دەهاتە بەرچاو. دەمەوئێوارە سەرکار هەواڵی هێنا، کە ئەبوحەفس و ئەبومەجد هاتوون. شا فەرمانی دا خێرا بیانکەنە ژوورەوە. سەرکار ئەوانی برد بۆ کتێبخانەی کۆشک، کە شا لەوێ چاوەڕێی دەکردن و نائارامانە دەهات و دەچوو.

ئەبوحەفس و ئەبومەجد چوونە ژوورەوە و سڵاویان کرد و دانەوینەوە. میر مۆڵەتی پێ دان، کە دابنیشن، پاشان ڕووی کردە ئەبومەجد و وتی، "ئادەی قسە بکە، بزانم چی بووە؟"

"سەروەرم! ڕۆحم ببێت بە قوربانتان، ئەمڕۆ زانایان بە پێچەوانەی ڕۆژان و کۆبوونەوەکانی ترەوە، هەر زوو ئامادە بوون و کۆبوونەوەکەیان کرد و بە کۆی دەنگ بڕیاری مەرگیان بەسەر سوهرەوەردیدا سەپاند. چەند هۆکارێکیشیان بۆ ئەم بڕیارە هەبوو، کە گرنگترینیان ئەم دووانە بوون: بیروباوەڕی خراپی سوهرەوەردی سەبارەت بە خیلافەت، کە بۆچوونی ئەو، هەر وەکوو دانی پیا ناوە، هەمان بۆچوونی ناخگەراکانە و باوەڕنەبوونی بە خەتمی پێغەمبەرایەتی. دووەم هۆکاریش، لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیی موسڵمانانە،





لەبەر ئەوەی فیتنەی فاتمییەکانیش، هەر کەسێکی وەکوو سوهرەوەردی لەپشتیەوە بووە. ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە مەحزەرێکیان بە چوار نوسخە نووسی و هەموویان ئیمزایان کرد. نوسخەیەکیان لای قازی ڕوکنەدینە، دانایەکی تر لای شێخ زەینەدینە، تا ڕۆژی هەینی، دوای نوێژ و پێش بڵاوبوونەوەی خەڵکەکە، بیخوێنێتەوە بۆیان. دانەیەکیشیان نارد بۆ جەنابی شا سەلاحەدینی باوکتان."

زاهیرشا، کە نیگەران و بێتاقەت بوو، قسەکەی ئەبومەجدی بڕی و وتی، "بۆیان نارد؟"

"بەڵێ، گەورەم. هەر یەکسەر دوای کۆبوونەوەکە، دایان بە سێ قوتابیی لاو. خستیانە نامەیەکەوە و مۆریان کرد و بەواندا بۆیان ڕەوانە کرد و پێیان وتن، کە بە زووترین کات بیگەیەننە دەستی جەنابیان."

"بە پیادە ڕۆیشتن یان سوارە؟"

"نازانم و تەنانەت ناشزانم لەکوێوە ڕۆیشتن!"

میرە لاوەکە بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو. پاشان بە تووڕەییەوە وتی، "ئەی نەدەبوایە منیان لێ ئاگادار بکردایەتەوە؟"

ئەبومەجد بە نیگەرانی و شڵەژاوییەوە وەڵامی دایەوە، "قوربان، قەرار بوو سبەی یان دوو سبەی شەریف ئیفتیخارەدین نوسخەیەکیش بۆ جەنابتان بهێنێت."

"ئەی چیی تر؟"

"هەروەها بڕیار وایە، گشت خەتیبەکان، هەریەکە بە جیا، نامەی خۆی بنووسێت بۆ جەنابی شا سەلاحەدین و داوای لێ بکات ئەم دەرفەتە لەدەست نەدەن!"

زاهیرشا بە تووڕەیی و پەستییەوە هەستایە سەر پێ و بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت، لە هۆڵەکە چووە دەرێ. ئەبوحەفس بە ئەبومەجدی وت، "ئەمانە بەبێ ئەوەی حیسابێک بۆ زاهیرشا بکەن، یەکسەر لەگەڵ شای گەورە سەلاحەدیندا مەسەلەکەیان باس کردووە و بڕاندۆتەوە. ئاخۆ ڕێی تێدەچێت شا سەلاحەدین پشتگیریی زاهیرشای کوڕی نەکات؟"



# مەرگێکی سازگار

سوهرەوەردییان بۆ قەڵاکە بردەوە. ئەو لە هەموو کاتێک شادتر دەهاتە بەرچاو. عەسر، وەختێ سەرگەرمی ڕامان بوو، سیندوختی، بینی کە بەوپەڕی شکۆوە لە ژوورسەری بوو و ساتبەسات زیاتر لێی نزیک دەبۆوە. سەرەنجام، بە ڕادەیەک لێی نزیک بۆوە، کە ژوورەکە پڕ بوو لە بۆنی عەتری خەیاڵئەنگێزی ئەو. لە کاتێکدا سوهرەوەردی واقی وڕ مابوو و نەدەبزووت، سەری نزیک کردەوە و بە گوێیدا چرپاند، "چاوەڕێم بە! هێندەی نەماوە، چل ڕۆژێکی دی."

ئەمەی وت و وردەوردە دوور کەوتەوە. پاشان خدر بەڵخیی بینی، کە دەستی خستە سەر ناوچەوانی ئەو و وتی، "تەنها چلەیەک! شەهابەدین! ئەمشەو نان دەخۆیت و لە سبەینێوە بەڕۆژوو دەبیت. ڕۆژوو لەم دونیایە! ئەم جارەیان بەربانگەکەت، بە بانگی ئێوارە نابێت، بەڵکوو بە هەڵاتنی خۆری هەقیقەت لەپەنا سیندوختا و بە ماچی ئەو ڕۆژوو دەشکێنیت." لە خۆشیی ئەم تەجەللایە، بەبێ ئەوەی بیەوێ، هاوارێکی لێ بەرز بۆوە و لە هۆش خۆی چوو.

* * *

یەکێک لە یاوەرانی زاهیرشا، کە بەردەوام لەنێوان ئەو و سوهرەوەردیدا هاتوچۆی بوو و هەواڵی ئەوی بۆ شا دەبرد، بە فەرمانی زاهیرشا چوو بۆ لای سوهرەوەردی و داوای

لێ کرد نامەیەک بۆ زاهیرشا بنووسێت و تیایدا نکوولّی لە هەموو ئەو شتانە بکات، کە بۆیان ڕێک خستووە و هەموو ئەو تۆمەتانە ڕەت بکاتەوە، کە دراونەتە پاڵی. نامەیەکی وا بنووسێت، کە بتوانرێ ڕەزامەندیی زاناکانی لێ بکەوێتەوە. شا بەڵێنی دابوو ئەگەر نامەیەکی لەو جۆرە بنووسێت، ئەم خۆی بەتایبەتی دەچێت بۆ دیمەشق و باوکی ناچار دەکات ئەو زانایانە بێدەنگ بکات.

سوهرەوەردی بە نێردراوەکەی شای وت، "سڵاوی من بە جەنابی میر بگەیەنە! پێی بڵێ من سوپاسگوزاری میهرەبانییەکانیم. بەڵام تکای من لە بەڕێزیان ئەوەیە، کە لەبەر من، بەرژەوەندییەکانی خۆی نەخاتە مەترسییەوە و نیگەرانی من نەبێت، چونکە تازە من لەم دونیایەدا پێویستم بە هیچ نییە. ئەگەر بە بارتەقای کێوەکان ئاڵتوون بخەنە بەرپێم، یان هەموو شمشێرەکانی دونیا بخەنە سەر ملم و هەموو تیرەکان دڵی من بکەنە نیشانە، تازە لەو ڕێیەی گرتوومەتە بەر، گەڕانەوەم نییە. من بە لەدایکبوونێکی دیکەوە، چوومەتە ناو دونیایەکی ترەوە و ئێستا خۆراکم، خۆراکێکی تر و ژیانم، ژیانێکی ترە. من تازە دەستم لەم دونیایە شت. ئەم نامەیەش بە دەستی میر بگەیەنە."

کاتێ نێردراوەکە دیدارەکەی خۆی لەگەڵ سوهرەوەردیدا بۆ میر گێڕایەوە، چاوەکانی میر پڕ بوون لە فرمێسک. نامەکەی کردەوە و خوێندیەوە. سوهرەوەردی بۆی نووسیبوو: "بە ناوی خواوە! ئەی میهرەبانترین یار و یاوەرەی بوونەوەران و باڵاترین خۆشەویست و دڵخوازی ئێمە! سڵاو و سوپاسم بۆ میهرەبانیی ئێوە. من سیونۆ





ڕۆژی تر دەمرم. ئەگەر زانایانی شار داوای لەسێدارەدانی منیان لێ کردیت، پێیان بڵێ ئەوم لە چاڵەڕەشەکەی قەڵادا زیندانی کردووە، تا خۆی لە برساندا دەمرێت! هەر ئەمڕۆش فەرمان بدەن من بگوێزنەوە بۆ زیندانەکەی قەڵا. سەبارەت بە مەرگی منیش کە لە چ ڕۆژێکدا دەبێت، هیچ مەڵێن! چونکە خەڵکی خۆیان ڕۆژی دواتر دەیزانن."

زاهیرشا نامەکەی قەد کرد و لە شوێنێکدا دای نا و نوقمی بیرکردنەوە بوو.

فەقیهەکانی حەڵەب، هەر ڕۆژە یادداشتێکی سکالائامێزی زانایان و باوەڕدارانیان بە یەک-دوو کەسدا ڕەوانەی دیمەشق دەکرد. لە سەرێکی تریشەوە، هەر ڕۆژە دەستەیەک دەچوون بۆ لای زاهیرشا و داوای جێبەجێکردنی حوکمی مەرگی سوهرەوەردییان لێ دەکرد.

بەڵام زاهیرشا بەو ئومێدەی باوکی پاشگەز ببێتەوە و هاوڕای بێت، بیانووی دەهێنایەوە، کە ئەم کارە دروست نییە و دەبێتە مایەی نارەزاییی فەقیهـ و زانایانی شار و مەملەکەتەکانی تر و ئەمەش ناوبانگی بنەماڵەکەیان دەزڕێنێت.

سەرەنجام، سووربوونی فەقیهەکان گەیشتە ئاکام و زاهیرشا لەژێر گوشاری ئەواندا، فەرمانی دا سوهرەوەردی بخەنە *چاڵە ڕەشەکەی* قەڵاوە، کە چاڵێکی تاریکی شێدار بوو، قووڵییەکەی سێ مەتر و نیو و ڕووبەرەکەی بیستوپێنج مەترێک بوو. پێپلیکانەی نەبوو بۆ سەرکەوتن یان دابەزینە ناو چاڵەکەوە و زیندانییەکانیان فڕێ دەدایە ناوی!

گەرچی سوهرەوەردی لە ئەنجامی ڕۆژوو و مەشقی ڕۆحییەوە زۆر لاواز بووبوو، بەڵام وەختێ مەئموورەکان

ئەویان فڕێ دایە ناو چاڵەکەوە، هەر زوو هەستایەوە سەر پێ و کەوتە سەمایەکی دەروێشانە و بە دەنگێکی پڕخرۆشەوە وتی:

”بە سەری زوڵفان تۆ ئەبەی دڵی من
بە لێوی لەعلت، ئەبەخشی ڕۆح بە من
گەر فەلەک سەد گرێش بدا لێم
بە تاڵی پەرچەمت، واڵا ئەکەی گرێی من
ئەی بتی من، چی ئەبێ گەر نەشمێنم
چون تۆ گیانمی، ئەمێنی لە جێی من“

لە سەرێکی ترەوە، سەلاحەدین فەرمانی جێبەجێکردنی فەتواکەی فەقیهەکانی حەلەبی سەبارەت بە کوشتنی سوهرەوەردی دەر کرد. وەلێ دیسانەوە زاهیرشا بە چەندەها بیانوو، ئەو کارەی دوا خست. نامەیەکی بۆ باوکی نووسی و تیایدا وتبووی، کە دەترسێت بەم کارە، ناوی بنەماڵەکەیان بزڕێت و ئامادەیە سوهرەوەردی بنێرێت بۆ دیمەشق، تا باوکی خۆی ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەکانی ئەو ببێت لەگەڵ زاناکاندا و ئەوکات بڕیاری لەسەر بدات.

ئەم نامەیە کاتێک گەیشتە دەستی سەلاحەدین، کە چەندین سکاڵانامەی لەلایەن زاناکانی حەلەبەوە بەدەست گەیشتبوو. تەنانەت ئەوان سکاڵایان لەدەست زاهیرشاش کردبوو و بە سەلاحەدینیان وتبوو، گەر دەستوبردێک نەکات، ئەوا دەرفەتەکە لەدەست دەچێت و زاهیرشای کوڕیشی، وەکوو سەدان لاوی تر، بە سوهرەوەردی فریو دەخوات





و ئەودەم ئابڕووی بنەماڵەکەیان دەچێت و موسڵمانانیش بە ئاگری فیتنە دەسووتێن.

سەلاحەدین دەمودەست قازییەک بانگ دەکات و نامەیەکی بۆ کوڕەکەی پێ دەنووسێت:

”کوڕەکەم! من فەقیهێک نیم، تا بە بەرچاومەوە کەسێک دادگایی بکەن و منیش هەڵی بسەنگێنم و داوەریی خۆمی لەسەر بکەم. ئەوەی لەسەر تۆیە، ئەوەیە کە دەسبەجێ حوکمی فەقیهەکان لەسەر ئەو جێبەجێ بکەیت. ئەگەر ئەمە نەکەیت، من ناچار دەبم لەسەر حوکمی حەلەب لات ببەم. ئەو کارە دوا مەخە، چونکە ئەم فەقیهانە ڕادەست نابن و بەزەیییان نییە و بەئاسانی دەتوانن ناوی ئێمە بزڕێنن و خەڵکمان لێ هان بدەن. من نامەوێ ئەوە بزانم، کە ئاخۆ زانایانی دیمەشق و حەلەب ڕاست دەکەن یان نا. ئەوەی بەلای منەوە گرنگە، ئەوەیە کە ئەمانە دڵیان لێمان نەڕەنجێت. ئەوان خۆیان لە فەتواکەیان بەرپرسیارن و پەیوەندیی بە منەوە نییە. سەبارەت بەوەش کە سوهرەوەردی بێگوناهانە خوێنی دەڕژێنرێ، خەتاباری سەرەکی لەمەدا، سوهرەوەردی خۆیەتی. ئەوێک کە خەڵکی ئەم دەڤەرە نییە، گەر سەرچڵیی نەکردایە و نەهاتایەتە ئەم مەملەکەتەی ئێمەوە و دژایەتیی زاناکانی ئەم مەملەکەتەی نەکردایە، هەڵبەتە چارەنووسی بەمە نەدەگەیشت. دواجار، مەرجیش نییە هەموو زاناکانی حەلەب بە هەڵەدا چووبن. بێگومان دیارە ئەو پیاوەش کۆمەڵێک شتی وتووە، کە دژ بە ئایینی ئیسلامە.“

ئەم نامەیەی شاسەلاحەدین کاتێک گەیشتە دەست زاهیرشای کوڕی، کە بە هاندانی زاناکان، خەڵکی حەلەب

مانیان لە کار گرتبوو و لای قەڵاوە گرد بووبوونەوە و داوای جێبەجێکردنی حوکمی فەقیهەکانیان دەکرد. شێخ زەینەدین بە توورەییەوە قسەی دەکرد و ئەفسووسی خۆی دەر دەبڕی لەمەڕ ئەوەی کە سوهرەوەردی لە زیندانی قەڵادا نییە و خراوەتە ژوورێکی نزیک مزگەوتەکەی قەڵا. هەر بۆیە زاهیرشا ناچار بوو شەریف ئیفتیخارەدین بنێرێت بۆ ناو قەڵاکە، تا بە چاوی ببینێت، کە سوهرەوەردی فڕێ دراوەتە ناو چاڵە ڕەشەکەوە و بەسەختی نەخۆشە و مەرگی نزیکە.



# فڕین، بەڵێ، فڕین

هەینی، چل ڕۆژەکە تەواو دەبوو. ڕۆژی پێنجشەممە، شەمسەدین، هاوڕێ بەسۆز و ئەمەکدارەکەی سوهرەوەردی، بە خۆشحاڵییەوە چووە لای هاوڕێکانی و پێی وتن، "ئەمشەو خەونم دیوە، سوهرەوەردی ئازاد دەبێت و زەماوەند دەکات. وا هەست دەکەم ئەمڕۆ ئازاد دەبێت و ئەوکات دەتوانین دیسانەوە لەگەڵیدا بین. من بەرەو لای قەڵا دەڕۆم، بزانم دەنگوباس چییە. خوا بکات سوهرەوەردی ئازاد ببێت."

قوتابی و هاوەڵەکانی تری سوهرەوەردی، بە شادییەوە وتیان، "ئێمەش لەگەڵتدا دێین."

ئەم هاوڕێ و دۆستانەی سوهرەوەردی، بەدەوری قەڵاکەدا و بەتایبەتییش بەرامبەر بە دەروازە سەرەکییەکەی قەڵا، دەهاتن و دەچوون و چاوەڕێی هەواڵێک بوون. بەڵام هیچ هەواڵێکیان دەست نەکەوت و بە نائومێدییەوە گەڕانەوە و پەرشوبڵاو بوونەوە، بەتەنها شەمسەدین نەبێت، کە لە تاریکیی شەودا ڕووی کردە سارا و لە مەودایەکی دوورەوە، بەرامبەر بە قەڵاکە دانیشت. بەر لە بانگی شێوان، مانگ ئاوا بووبوو و دنیا تاریک بوو.

شەو کە لە نیوە تێپەڕی، لەگەڵ یەکەم خوێندنی کەڵەشێرەکاندا، ڕووناکی کەوتە ئاسمانەوە! شەمسەدین نەشئەیەک گرتی و لە چواردەوری خۆی دابڕا. بۆ

بەیانی زوو، قوتابییەکان دیسانەوە هاتبوونەوە بۆ لای قەلاوە. شەمسەدینیش گەڕابۆوە بۆ ئەوێ. ئەو لە کاتێکدا چاوەکانی پڕ بووبوون لە فرمێسک، بە هاوەڵەکانی وت، "دڵنیام کە ڕۆحی سوهرەوەردی فڕیوە. دوێنێ شەو، وەختێ ئێوە گەڕانەوە، من نەگەڕامەوە و بۆ شەو لەو سارایە بووم. دنیا نوقمی تاریکی بوو و تاقە ڕووناکی، جریوەی ئەستێرەکانی ئاسمان بوو. من دوور لە قەلا دانیشتبووم، کە لەپڕێکدا ڕووناکییەکم بەدی کرد. بەلام ئەو ڕووناکییە، ڕووناکیی مانگ و خۆر نەبوو، ڕووناکییەکی تر بوو. ئەستێرەکان بە کەژاوەی نوورەوە بەرەوڕووی زەوی دەهاتن. لەپێش هەمووشیانەوە، کەژاوەی خۆر و لە هەموویان جوانتر و پڕشکۆتر *ئۆردووی سووڕئاناهید* بوو، پاشان کەژاوەی فەیلەسووف و حەکیمەکان: هرمس، ئەفلاتوون، فلۆتین، کیومەرس، جاماسب، کەیخوسرەو، بایەزیدی بەستامی، حەللاج، عەینولقوزات، بوسەعید، خەرقانی و هەموو ئەوانی تر. دەستەدەستە فریشتەکان بازنەیەک نووریان پێک هێنابوو و بەسەر زیندانی قەلادا دەسووڕانەوە. سەمای جیهانی ڕۆحەکان و شادمانیی فریشتەکان. هەموو سەرگەرمی سەما و ستران بوون. بەڵێ، ئازیزان! لەو تاریکییە ئەنگوستەچاوەدا، بەئاشکرا دەمبینی چۆن داروبەردی ئەم قەلایەی حەڵەب و گەردبەگەردی ئەم جیهانە، کەوتبوونە بزووتن. جیهانی بوون لە شەپۆلێک ڕووناکیدا، ئاوێتەیەک بوو لە فرەیی و لە یەکبوون. تاوێک هەموو دەبوون بە یەک و تاوێک لە یەکدی جودا دەبوونەوە. بەلام ناگەهان، گشت بوونەوەرەکان لە جووڵە





کەوتن و لە شوێنی خۆیاندا وەستان. گالیسکەیەکی بێ سوار لە ناهید* جیا بۆوە و بەرەو زیندانەکە دابەزی، بەرەو ئەو جێیەی سوهرەوەردیی تیا کەوتبوو و سەری لە باوەشی خدر بەڵخیدا بوو. هەنگینێ، کیژێکی نوورانی، کە گولاوی دەکرد بە ڕوخساری سوهرەوەردیدا و دەستی بەسەر سەریدا دەهێنا، بەرامبەری وەستا و لە کاتێکدا هەردوو دەستی بەرەو ڕووی سوهرەوەردی درێژ کردبوو، دەیوت، ‹یەحیا! چاو هەڵێنە، ئەوە منم، سیندوخت! وەرە! کاتی فڕینە!›

"جەستەی سوهرەوەردی کەوتە بزووتن و لەو کاتەدا شتێک لە جەستەی جودا بۆوە، کە ڕێک وەک سوهرەوەردی خۆی بوو! بەلام بەشکۆتر و قەشەنگتر! سیندوخت بەرامبەری ڕاوەستا و دەستی بۆ جەستەکەی پێشووی سوهرەوەردی ڕاکێشا و پێی وت، ‹یەحیا! ئەوەی دەیبینیت لە خاکەوە دەگەڕێتەوە بۆ خاک. بەلام تۆ خۆت ئێستا ئامادەی فڕینیت! بەم جەستە *هورقلیا*ییەوە، تەماشایەکی سەر شانەکانی خۆت بکە.›

"سوهرەوەردی سەیری کرد، دوو باڵ لەسەر شانەکانی ڕوان. شاگەشکە بوو! دەستی خستە ناو دەستی کیژەکەوە و سواری ئەو گالیسکەیە بوو، کە ئەو هێنابووی. فڕین دەستی پێ کرد و سەرلەنوێ شەپۆلی جووڵە سەرانسەری دونیای گرتەوە. ڕۆیشتن، تا هەموو جەستەکان هەڵوەرین. ڕۆحەکان ئاوێتەی یەکتر بوون. هەموو بوون بە یەک و بەرەو بەرزاریی چوون! بەرەو ناکۆتا! ئیدی چی بڵێم، ئەو

---

* ناهید: ئەستێرەی زوهرە

ڕۆیشت! بەڵێ، ئەو ڕۆیشت!"

هەموو پێکەوە دەستیان کرد بە گریان. لەم کاتەدا بوو، کە شەمس هاواری کرد، "ئەی شێخ! ئەی پێغەمبەری خودا!"

وەلێ ئەبو ماهیر دەمی شەمسی گرت و وتی، "بێدەنگ بە! دوێنێ شەو سوهرەوەردی هاتە خەونی منیش و پێی وتم، بەو جۆرە نازناوانە بانگم مەکەن."

ئینجا ئەبولوەفای زاهید بەدەم هاوارەوە هات. هاوەڵان بەرەو ڕووی چوون و وتیان، "ئەبولوەفا چی بووە؟ چی ڕووی داوە؟"

ئەبولوەفا بەپەرێشانی و بەدەم گریانەوە وتی، "نازانم! دەمەوێ بزانم ئەمشەو لە قەڵا چی قەوماوە! چونکە دوێنێ شەو لە خەونمدا پێغەمبەری خودام بینی بە چاوی گریاناوییەوە لەناو زیندانی قەڵادا، مشتێک ئێسقانی لەسەر ئەرزەکە هەڵدەگرتەوە و دەیوت، ‹ئەمە ئێسقانی ئەبولفتوح شەهابەدینی سوهرەوەردییە.›"

لەم کاتەدا شێخ مەجدەدین لەگەڵ ئاپۆرەیەکدا هاتن. نامەیەکیان دا بە بەرپرسی قەڵاکە و وتیان، "دوێنێ شەو لە کۆبوونەوەیەکدا بڕیارمان دا و سوێندمان خوارد، تا سوهرەوەردی لەسێدارە نەدەین، نوێژی هەینی ناکەین. چووین بۆ لای شا و فەرموون ئەمەش فەرمانی شا. هەر ئێستا دەچین سوهرەوەردی دەهێنینە دەرەوە و فەتوای زانایانی بەسەردا جێبەجێ دەکەین و لەسێدارەی دەدەین. دەبێ هەرچی زووە، کۆتایی بەو دەنگۆیانە بهێنین، کە گومانیان لای خەڵک و ئیمانداران دروست کردووە، گوایە





سوهرەوەردی هەڵاتووە یان لە زیندان ئازاد کراوە."

نامەکەی شایان گەیاندە دەست فەرماندەی قەڵا و پاشان دەرگای قەڵایان بە ڕووی ئاپۆرەی زانایان و خەڵکدا واڵا کرد و هەموو پێکەوە شاڵاویان بۆ زیندانەکە برد. لەبەر ئەوەی ئەو ڕاڕەوەی بۆ ناو زیندانەکە دەچوو، تەسک و تاریک بوو، بەتەنها فەرماندەی قەڵا لەگەڵ شێخ مەجدەدین و پێنج سەربازی زیندانەکەدا چوونە ژوورەوە. یەکێک لە سەربازەکان پەیژەیەکی دانا و بۆ ناو چاڵە ڕەشە تاریک و شێدارەکە دابەزی. شێخ نوستبوو. کاتێک بە تووڕەییەوە ویستی لە خەو بێداری بکاتەوە، تەماشای کرد مردووە و جگە لە جەستەیەکی بێگیان، هیچی تر نییە.

***

لەسەر داوای ئەو زانا و ئیماندارانەی شەوی ڕابردوو لە پێنج مزگەوتی شاردا کۆ بووبوونەوە و پێشنیاری ئەوەیان کردبوو، کە ڕۆژی هەینی، بەر لە نوێژ، لەداری بدەن، جەستە بێگیانەکەی سوهرەوەردییان لە قەڵا بردە دەرێ و ئەو ئەرکەیان بە قەزا گێڕایەوە و لەسێدارەیان دا.

***

شەمسەدین لەم جەزبەیەیدا کەوتبووە خرۆش و حاڵەتێکی ترەوە. دەخولایەوە و بەدەم هاوارەوە سەمای دەکرد و دەیکێشا بە دەموچاوی خۆیدا: